


**ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە**

**بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید**

**بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود**

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە

سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم

http://www.endeshe.net

andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com

http://www.facebook.com/Andeshalib

07501026400



# مێردی هەمیشەیی




فیودۆر دۆستۆیڤسکی

وەرگێڕانی کاروان مەحمود

زنجیرەکتێبی فیکر و ئەدەب

سەرپەرشتیاری زنجیرە

سیروان مەحمود

ناوی کتێب: مێردی هەمیشەیی

ناوی نووسەر: فیودۆر دۆستۆیڤسکی

وەرگێڕانی: کاروان مەحمود

بابەت: ڕۆمان

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٦

چاپخانە: ئەندێشە

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نرخ: (٧٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٥٣٣)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە.

ماندووبوونی ئەم وەرگێڕانە پیشکەشە بە ئازارەکانی "سۆفیا"
پێشکەشە بە "هەڵگورد،" کە دونیایەکە لە جوانی و
هاوڕێیەکی بەئەمەک

هەروەها پیشکەشە بە تەواوی ئەو خۆشەویستانەی کە تینووی
بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکین بە زمانی شیرینی کوردی...

کاتێـک دەبێـت دۆستۆیفسـکی بخوێنینـەوە، کـە غەمگینیـن، کاتێـک گەیشـتبینە سـەر دواسـنووری توانامـان لەسـەر ئـازار، کاتێـک هەمـوو ژیـان وەک یـەک برینـی داگیرسـاو و بەسـوێ دەبینیـن، کاتێـک دوودڵـی هەڵدەمژیـن و هەمـوو ئومێدمـان مردبێـت، کاتێـک لـە غەمگینیـدا تەنیـا و پەککەوتـە لـە ژیـان دەڕوانیـن و نامانەوێـت چیـی تـر لـەو سـامناکییە جـوان و دڕندەیـەی هیـچ تێبگەیـن و هیچمـان هەبێـت، تەنیـا ئـەو کاتـە ئێمـە کـراوە دەبیـن بـۆ ئـاوازی ئـەم نووسـەرە ترسـناک و گەورەیـە.

هێرمان هیسە

# لەبری پێشەکی

*مێردی هەمیشەیی* لە پاییزیی ساڵی ١٨٦٩، واتە چەند مانگێک لەدوای ڕۆمانی *گەمژە*، هەروەها ڕێک لەپێش ڕۆمانی شەیتانەکان، لەنێوان ئەم دوو شاکارە مەزنەدا هاتۆتە نڤیسین. هەرچەندە ئەم دوو شاکارە مەزنەی تا ئەو ساتەی دۆستۆیڤسکی خۆی لە ژیاندا بوو، کەس پەیی بە بەهاکانیان نەبرد. ڕۆمانی *مێردی هەمیشەیی* بە پلەی دووەم دێت لەدوای ئەو دوو شاکارە مەزنەوە. لەو ماوەیەدا دۆستۆیڤسکی وردەوردە خۆی ئامادە دەکرد و لە مێشکی خۆیدا بیرۆکەی نووسینی شاکارە مەزنەکەی *برایانی کارامازۆڤی* گەڵاڵە کردبوو. هەرچەندە دارشتنی ڕۆمانێکی وەک *برایانی کارامازۆڤ* کاتێکی زۆرتری دەویست، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو ماوەیەک بۆ نووسینی *مێردی هەمیشەیی* و ماوەیەکیش بۆ نووسینی *شەیتانەکان* تەرخان بکات، بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەستی بە بەرەوپێشچوونی مێشکی دەکرد و مێشکی فراوانتر دەبوو، گۆڕانی قووڵ بەسەر بیرکردنەوەکانیدا دەهات.

بیرۆکەی دارشتنی *مێردی هەمیشەیی*، سەرەتا لە شێوەی

کورتەچیرۆکدا بووە، بەڵام کاتێک دێتە نڤیسین، فراوانتر دەبێت و پێنج هێندە گەورەتر و گرنگتر لەوە دەر دەچێت، کە خودی نووسەر پێشبینیی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لەچاو هەموو ڕۆمانەکانی تریدا، کورتە. تەنانەت لە یەکێک لەو نامانەی بۆ هاوڕێی، ئاپۆلۆن مایکۆفی شاعیری دەنێرێت. لەو نامەیەدا بۆی نووسیوە، "نووسینی ئەم چیرۆکە سێ دانە مانگی ڕێکی خایاند. لەو ماوەیەدا زیاتر لە یانزە پەڕەوام لە پەڕاوەکانی چاپخانەکە بە نووسینی ئەم چیرۆکە ڕەش کردەوە. ڕەنگە لەمەوە بۆت دەر بکەوێت، کە بە هۆی نووسینی ئەم چیرۆکەوە چەندێک وزەم بەفیرۆ داوە و ماندوو بووم بە دەستیەوە. ئەم کارە ڕێک لەو حوکمە دەچێت، کە بەسەر تاوانبارێکدا دەسەپێنرێت بۆ ئەنجامدانی کاری تاقەتپڕوکێن. دەمەوێت ئەوەش زیاد بکەم بۆ قسەکانم، کە من هەر لە و ساتەوەی دەستم بە نووسینی کرد، هەر لە یەکەم ساتەوە لەڕادەبەدەر ڕقم لەم چیرۆکە خراپە بووەوە، هەستم کرد دەتوانم بە لایەنی کەمەوە تەنها سێ پەڕاو پڕ بکەمەوە. بەڵام لە کاتی نووسیندا، هەستم کرد بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، پەیتاپەیتا مێشکم سەرڕێژ دەبێت لە بیرۆکە، ئیتر ئا بەم شێوەیە زۆر زیاتر لەوە دەر چوو، کە شیمانەم کردبوو، بوو بەم یانزە پەڕاوەی هەنووکە نووسینەکەی تەواو بووە."

هەڵبەت نووسەری بەناوبانگی *تاوان و سزا* لەو ڕووەوە کە باسی ماندووبوونی خۆی و بەخەرجدانی وزەیەکی زۆر لە نووسینی ئەم ڕۆمانەدا دەکات، مافی خۆیەتی کە وای وتووە، بەتایبەت کە ڕۆمانەکە بە چەند زنجیرەیەک بۆ

یەکەم جار لە ڕۆژنامەیەکی خاوەن بیروباوەڕی سلاڤیی وەک *کازیوە* بڵاو دەکرێتەوە، دیارە لەبەر هۆکاری کەمی دەرچوونی ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە و خوێنەرێکی کەم، وای لە دۆستۆیڤسکی کردبێت بەم شێوە قورسە حوکم بدات لەسەر ئەم نووسینەی، هەروەها شتێکی تریش، کە ڕەنگە وای لە دۆستۆیڤسکی کردبێت وا بڵێت، شێوازی نووسین و داڕشتنی *مێردی هەمیشەییـیە*، کە جیاوازە لەو شێوازە نووسینە سەرەکییەی دۆستۆیڤسکی لە ڕۆمانەکانی تریدا، لەو ماوەیەی ژیانیدا، کە پێی ڕاهاتبوو لەسەر ئەو شێوازە بنووسێت، لەم ڕۆمانەدا بە شێوەیەکی بەرچاو لەو شێوازە لای داوە و تەکنیکێکی نوێی بەکار هێناوە. سەرباری هەموو ئەمانەش، لەو فەترەیەدا خودی دۆستۆیڤسکی لە دۆخێکی دەروونیی ناهەمواردا ژیاوە. ئەگەر بێت و کەمێک تەماشای گوزەرانی ژیانی دۆستۆیڤسکی بکەین لەو ماوەیەدا کە ئەم ڕۆمانەی تێدا نووسیوە، ئەوا بەڕوونی کاریگەریی ژیانی ڕاستەقینەی خودی دۆستۆیڤسکی تێدا دەبینینەوە. لەم ماوەیەدا، دۆستۆیڤسکی ناخۆشترین ساتەکانی ژیانی خۆی تێپەڕاندووە. نەخۆشییەکەی - پەرکەم – ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو، بەتەواوی نابووت ببوو، تا بینەقاقای قەرزدار بوو، قومارکردن ژیانی وێران کردبوو، هەندێک جار لە ترسی ژیانی خۆی، لە سویسرا و هەندێک جاریش لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا ژیانی بەسەر بردووە، بە شێوەیەک لە خاوەن قەرزەکانی ترسابوو، کە زاتی ئەوەی نەکردبوو بگەڕێتەوە بۆ ڕوسیا. مردنی یەکەم منداڵ لەو کاتەداو، هەروەها ئەوەی ژنەکەی سکی پڕە بە منداڵێکی تر لەو ماوە

قەیراناوییەدا کە تێی کەوتبوو، بەتەواوی لەناو بێهیواییەکی قووڵدا نغرۆی کردبوو. بەم شێوەیە *مێردی هەمیشەیی*، کە پڕە لە بابەتگەلێک، کە جێگەی مشتومڕێکی زۆرە و بە جۆرێک لە جۆرەکان بەرهەمی کاردانەوە و کارەساتەکانی ئەو مانگە سامناکانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، بلیمەتییەکەی دۆستۆیڤسکی، کە بە بڵاوبوونەوەی *تاوان و سزا* گەیشتبووە دواترۆپکی خۆی، هێشتاش توانای خولقاندنی خۆی لەدەست نەدابوو. بەڵام بە هۆی ئەوەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خەمۆکی زیاتر دای دەگرت و کێشە داراییە یەکلەدوا یەکەکان، تۆزقاڵێکیش بواری ئەوەی نەدەدا، کە بۆ تاوێک بەباشی بە خۆی ڕابگات.

بوار لەڕادەبەدەر کەم، کارەکان بەردەوام بەو شێوەیە نەدەهات بە دەستدا، کە چاوەڕوانی دەکرد، تووڕەییەکی وێرانکەر، ڕووداوە سیاسییەکان، غەم و پەژارەکان، گیروگرفتەکانی ڕۆژانە، هەموو ئەمانە بەیەکەوە بەتەواوی کاری لە بیرکردنەوە و ڕۆحە مەزنەکەی دۆستۆیڤسکی کردبوو، کە بە شێوەیەکی زەق دوای خوێندنەوە لە ڕۆمانەکە، خوێنەر بەباشی لەم بارودۆخە دەروونییەی نووسەر تێدەگات.

لە یەکەم پەڕاوی *یادەوەرییەکانی ڕۆژانەی دۆستۆیڤسکی*، خودی خۆی بەڕاشکاوی ئاماژە بۆ ئەو هێرشی تووڕەیی و فیلێهاتن و لاوازییەکانی و نەخۆشییەکانی لەو ماوەیەدا دەکات:

"١٨٦٩: ٣ی ئۆگەست- تووشبوون بە پەرکەم لە کاتی بەرێکەوتن بەرەو فلۆرانس."

"١٨٦٩: ١٠ی ئۆگەست- تووشبوون بە پەرکەم لە ناوەڕاستی شەقامدا لە پراگ، پایتەختی چیک و سلۆڤاکیا."

"١٨٦٩: ١٩ی ئۆگەست - تووشبوون بە پەرکەم لە

درسدن، ئەڵمانیا."

"١٨٦٩: ٤ی سێپتێمبەر- پەرکەم لەدوای پەرکەم لە درسدن، ئەڵمانیا"

"هەر بەو شێوەیەی کە لە نەخۆشخانە خەوێنرابووم، ئازاری سنگ، بە شێوەیەکی تۆقێنەر، خۆلەبەردانەگیراو، هاتە سەروەختم. وام هەست دەکرد لەتاو ئازار دەمرم. بەڵام دوای ئەوەی پرێشەری گەرمیان بۆ بەکار هێنام، بەڵام وشک، واتە دەوری داخ و بەکارهێنانی خاولیی گەرم، ئازارەکە لەنیوکاتژمێرێک زیاتری نەخایاند."

"١٨٦٩: ١٢ی سێپتێمبەر- فیلێهاتن لە کاتی شەودا لە نەخۆشخانە."

"١٨٦٩: ٣٠ی-سێپتێمبەر فیلێهاتنێکی توند لە کاتی شەودا، دوای ئەوەی تا درەنگانێکی شەو کارێکی زۆرم ئەنجام دابوو."

بەم جۆرە دۆخی دەروونی و فیزیکیی دۆستۆیڤسکی بەم شێوەیە بووە، لە یەکێکی تر لە نامەکانیدا لە خراپیی بارودۆخی داراییی خۆی، دوای دوو ساڵ لە دۆڕاندنی لە قوماردا لە ساڵی ١٨٦٨، تێدەگەین لەو کاتەدا کە یەکەم منداڵی خۆی لە مانگی شەشی ١٨٦٨ گیان دەسپێرێت، ژنەکەی تەنانەت پارەی پێویستی پێ نەبووە بۆ بەخاکسپاردنی منداڵەکەی، هەروەها لە کاتی لەدایکبوونی منداڵی دووەمیشدا، پارەی پێ نەبووە، ناچار جلەکانی دەرەوەی و تەنانەت جلەکانی ژێرەوەشی، یەک لەدوای یەک، لە بانکەکانی ڕەهن لە درسدن، میلان، ژنێف، وەک بارمتە دای ناوە، تا برێک پارەی پێ وەر بگرێت. ئا لەم بارودۆخە ناهەموار و پڕ لە حەسرەتەدا بووە، کە

ڕۆمانی *مێردی هەمیشەیی* تێدا هاتۆتە نقیسین. بۆیە ڕەنگە ئاسایی بێت کە نووسەر بەم شێوەیە لەبارەی نووسینی ڕۆمانەکەیەوە بڕیار بدات.

بەڵام دەربارەی بە بۆچوونی ڕەق و توندی خۆی سەبارەت بە ڕۆمانەکە، دۆستۆیڤسکی هەرگیز لەسەر حەق نەبووە و ناڕەوایی کردووە بەرامبەر بەم ڕۆمانە نایابە. چونکە ڕەخنەگران و مێژوونووسان و دەروونزانەکان، بەتەواوی بە پێچەوانەی نووسەرەوە لەم بەرهەمەیان ڕوانیوە و پێیان وایە کە ڕۆمانی *مێردی هەمیشەیی*، نەک هەر ڕۆمانێکی زۆر باشە، بگرە زۆریش نایابە، ئەمەش بە لایەنی کەمەوە لە دوو ڕووەوە: یەکەم، لە ڕووی تەکنیکی نووسینەوە، تەکنیکێکی نوێ و سەردەمییانەی بەکار هێناوە، کە تێیدا شێوازی گەڕانەوەی بۆ دواوە "flash back"ی بەکار هێناوە. هەروەها دووەم، بەو پێیەی چارەسەری کێشەیەکی ئاڵۆزی پەیوەندیی سایکۆچکەیی مێرد و ژن و دۆست دەکات، کە ئەمە کێشەیەکە، زۆربەی جارەکان بێ چارەسەر دەمێنێتەوە، تەنها لەسەر تەختی شانۆکان یاخود کارە کۆمیدییەکان و شانۆ کۆمیدییەکان نەبێت. جگە لە هەموو ئەمانەش، *مێردی هەمیشەیی* کورتەڕۆمانێکی تا بڵێی قووڵە، بە لایەنی کەمەوە لەو ڕووەوەی تا دواسنوورەکانی قووڵاییی ڕۆحی کارەکتەرەکانی قووڵ دەبێتەوە و پەنجە دەخاتە سەر هەستیارترین شوێنەکانی لایەنی دەروونیی کارەکتەرەکانی، کە بەلای زۆرێک لە گەورەڕەخنەگرانی ڕوسی و دنیاوە، ئەم قووڵبوونەوەیە تا ئەو ڕادەیە لە ڕۆحی مرۆڤەکاندا، دەبێتە هۆی پێشکەشکردنی کارەکتەرگەلێکی نموونەیی لە بارودۆخگەلێکی

نموونەییدا. جگە لە ڕەخنەگران، کەسایەتییەکی دەروونناسی گەورەی وەک فرۆیدیش بەڕاشکاوی لە چەندین شوێندا دان بەوەدا دەنێت، کە تا چ ڕادەیەکی مەزن بۆ کۆی گشتیی تیۆرییەکانی سوودی لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی وەر گرتووە، بەتایبەتی لە بابەتی شیکاریی خەون و زیندەخەوندا، کە لەم کورتەڕۆمانەشدا بەشێکی زۆری باسی ئەو خەون و زیندەخەونە دەکات...

ئەمە لە کاتێکدا، بە پێچەوانەوە لە ڕۆمانە گەورەکانیدا کە دۆستۆیڤسکی خووی پێوە گرتبوو، زیاتر پەنجە دەخاتە سەر بابەتە فەلسەفی و ئیمانی و کۆمەڵایەتییەکان و هەوڵ دەدات چارەسەریان بکات. ئەمە لە کاتێکدا، لایەنی سەرەکی لە *مێردی هەمیشەیی*دا زیاتر لایەنێکی سایکۆلۆژییە، کە ئەمەش هەر لە پەڕەکانی سەرەتای دەستپێکی ڕۆمانەکەوە هەستی پێ دەکرێت.

بە بڕوای من، نووسینی پێشەکی بۆ ڕۆمانەکانی دۆستۆیڤسکی کارێکی چەندان ئاسان نییە، بە هۆی فرەڕەهەندیی نووسینەکانیەوە. بۆیە منیش لەم پێشەکییەی سەرەوەدا تەنها پەنجەم خستۆتە سەر چەند ڕاستییەکی لایەنی ژیانی نووسەر لەو ماوەیەدا، کە ڕۆمانەکەی تێدا نووسیوە و چۆنێتیی نووسینی ڕۆمانەکە خۆم بواردووە لەوەی باسی خودی ڕۆمانەکە و کارەکتەرەکانی ناوی بکەم. ئەوەیان لێدەگەڕێم بۆ خوێنەر، خۆی قسەی لەسەر بکات. چونکە بە بڕوای من، خوێندنەوە بەپێی ئاستی تێگەیشتن و خوێندنەوەی کەسەکان بۆ هەر دەقێک دەگۆڕێت و هەرکەسێک بە شێوازێک شیکاریی بۆ دەکات. قسەی کۆتاییش

ئەوەیە، هیچ کارێک لە کەموکوورِی دەربازی نابێت، نووسەر یاخود وەرگێرِ، هەرچەندێکیش بەتوانا بێت، ئەوا بەدەر نابێت لە هەڵە، بۆیە منیش بەوپەرِی توانامەوە هەوڵم داوە ئەم بەرهەمەی بەردەستتان بە زمانێکی پوخت و پاراو پیشکەش بە کوردیزمانانی خۆشەویستم بکەم، ئەگەریش هەر هەڵەیەک هەبوو، بەو هیوایەی بە گەورەییی خۆتان بمانبەخشن و هەڵەکانمان بۆ راست بکەنەوە و ئێمەش بەوپەرِی رێزەوە ئەیخەینە سەر چاوانمان. لە کۆتاییشدا، دەمەوێت سوپاسی یەکبەیەکی هەموو ئەو خۆشەویستانە بکەم، کە بە ئەرکی پێداچوونەوە و بەراوردکاری و هەڵەچنی و لەچاپدان و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە هەستاون، دەستی ماندووبوونی یەکبەیەکیان دەگوشم. ئەگەر بە هۆی ماندووبوونی ئەوانەوە نەبووایە، ئەم بەرهەمە جوانەش بەم شێوەیەی ئێستای نەدەگەشت بە دەستی ئێوەی خۆشەویست...

کاروان محمود

٢٠١٥/٣/١٤

# ١

# ڤێلچانینۆڤ

هاوین هاتبوو، پێچەوانەی هەموو چاوەڕوانییەکان، ڤێلچانینۆڤ لە پترسبۆرگ مایەوە. ئەو پلانانەی بۆ ڕۆییشتن بەرەو باشووری ڕوسیا دای نابوون، هەمووی هەڵوەشانەوە، هەروەها کۆتایی دۆسیەکەشی لە دادگا ڕوون نەبوو بە کوێ دەگات. ئەم دۆسیەی کە پەیوەندیی بە سەروەت و سامانەکەیەوە هەبوو - ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕووی لە ئاڵۆزی دەکرد. سێ مانگ پێشتر، هەموو شتێک بەتەواوی ئاسان و سادە دەر دەکەوت و ئەنجامەکەشی زۆر ئاشکرا بوو، جێگەی هیچ جۆرە مشتومڕێک نەبوو. بەڵام لەناکاو، هەموو شتێک گۆڕدرابوو. "لەڕاستیدا هەموو شتێک بۆ خراپتر گۆڕاوە!" ڤێلچانینۆڤ بەبەردەوامی و بەچاڕزییەوە ئەم دەستەواژەیەی چەندین جار لەبەر خۆیەوە دووبارە دەکردەوە. پارێزەرێکی لێهاتوو و ناودار و گرنگی بە برەپارەیەکی زۆر بۆ دۆسیەکەی گرتبوو. ڤێلچانینۆڤ لە پارەخەرجکردندا درێغیی نەدەکرد و زۆریش دەستبڵاو بوو.

بەڵام بە هۆی بێئارامی و جۆرێک لە دڕدۆنگی و بێ متمانەیی، کە ماوەیەک بوو بۆی دروست بووبوو، ناچار ببوو بە هەمان شێوە خۆشی دەست وەر بداتە دۆسیەکەوە. هەموو ئەو بەڵگەنامانەی پارێزەرەکەی یەک جار دەیخوێندنەوە و پشتگوێی دەخستن، ئەم سەرلەنوێ دەیخوێندنەوە و ڕاپۆرتێکی لەسەر دەنووسی و لەم دادگاوە ڕای دەکرد بۆ یەکێکی تر، بەڵگەی کۆ دەکردەوە و بەم کارانەشی، کۆسپی خستبووە بەردەم هەموو شتێک؛ پارێزەرەکەی گلەییی هەبوو لێی. هەر بۆیە پارێزەرەکەی چەندین جار پێشنیاری ئەوەی بۆ کردبوو، کە گەشتێک بکات و سەردانێکی ڤیلا هاوینەییەکەی بکات. بەڵام ڤێلچانینۆف تەنانەت نەیئەتوانی بیری خۆشی کۆ بکاتەوە بۆ دوورکەوتنەوە. تەپوتۆز، گەرمای خنکێنەر، شەوە سپییەکانی پترسبۆرگ، کە هەمیشە دەماری مرۆڤی دەگرت، ئەو شتانە بوو کە ئەو لەناو شارۆچکەکە چێژی لێ دەبینین. هەروەها ئەو باڵاخانەیەشی کە هێندە نەدەبوو بەکرێی گرتبوو لە نزیک هۆڵی گەورەی شانۆیی لە پترسبۆرگ، جێگەی ڕەزامەندی و ئاسوودەییی نەبوو.

وا بیری دەکردەوە، کە "هەموو شتێک شکستە!" نیگەرانییەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادی دەکرد، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ ئەوە ببووە سووژەیەک بۆ بێحەوسەڵەیی و ماخۆلیای.

ڤێلچانینۆف پیاوێک بوو، کە لە ژیانیدا بەپڕی و بێ کەموکوڕی ژیابوو. چیی تر گەنجەکەی جاران نەبوو. سیوهەشت یان سیونۆساڵێک دەبوو، ئەم "پیرییەش" هەر وەک خۆی وا گوزارشتی لێ دەکرد، کە "بە شێوەیەکی

تـەواو چاوەڕواننەکراو" بەسـەریدا هاتبـوو، بـەڵام خـۆی پەیـی بـەوە بردبـوو، کـە ئـەم پیرییـەی بەسـەریدا هاتـووە، هێنـدەی بـە هـۆی چۆنێتیـی سـاڵەکانەوەیە، کەمتـر بـە هـۆی ژمـارەی سـاڵەکانەوەیە، هەمـوو ئـەو گۆڕانانـەی بەسـەریدا هاتبـوون، زیاتـر دەروونـی بـوون وەک لـەوەی دەرەکـی بـن.

بەڕواڵـەت هێشـتاش مرۆیەکـی بەهێـز و تەندروسـت بـوو. پیاوێکی باڵابـەرز و خـاوەن جەسـتەیەکی بەهێز، لەگەڵ پرچێکی ئەسـتووری زەردبـاو، کـە تەنهـا تاڵێکـی سـپییش چییـە، لەنـاو سـەر و ڕیشـی درێژیـدا، کـە تـا نیـوەی سەرسـنگی هاتبـوو، بـەدی نەدەکـرا. ئەگـەر یەکـەم جـارت بووایـە و لێـت بڕوانیبـا، ئـەوە وات دەزانـی مرۆڤێکـی خاووخلیچـک و گەلحۆیـە! بـەڵام ئەگـەر وردتـر لێت بڕوانیبا، یەکسـەر بۆت دەر دەکـەوت کـە لـە ڕاسـتیدا مرۆڤێکـی بەویقـار و ئاکاربـەرزە و لـە کۆمەڵگەیەکـی خانـەدان و ڕەوشـتبەرزدا پـەروەردە کـراوە.

ڤێلچانینۆڤ، سەرەڕای فەرامۆشکاری و تەنگەجیکڵدانییەکەی، بـەڵام هێشـتاش هەڵسوکەوتەکانی سـەربەخۆ و چاوقاییمانـە و تەنانـەت میهرەبانانـەش بـوو. تەنانـەت ئێسـتاشـی لەگەڵدا بێـت، پـڕە لـە زۆرتریـن نادوودڵـی، زۆریـش لووتبـەرز و تـڕزل و باوەڕبەخۆیـە، کـە پێدەچێت تەنانـەت خۆشـی درکـی بـەو هەموو باوەڕبەخۆبوونـەی لـە خۆیدا نەکردبێت، ئـەو پیاوێک بـوو، نەک هـەر ئـەوەی زرنـگ بـوو، تەنانـەت هەنـدێ جاریش زۆر ژیـر و بێ سنوور دانـا و کەسـێکی تـا بڵێـی هەڵکەوتـوو و بەهرەمەنـد بـوو. ڕوخسـاری کـراوە و سـوور و گـەش، نەرمونیـان بـوو وەک ڕوخسـاری ئافـرەت. لـە ڕۆژانـی ڕابـردوودا زۆر جێگـەی سـەرنجی خانمـان بـوو؛ ئێسـتاش هەندێـک خەڵـک چاویـان

پێی بکەوێت، یەکسەر دەڵێن، "چەند جوان و بەهێزە! چەند ڕوخساری گەشاوەو جوانە!" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم جوانی و بەهێزییە کەوتبووە بەر شاڵاوی بێبەزەییانەی ترس و مەلوولییەوە.

دە ساڵ بەر لە ئێستا، چاوەکانی گەورە و شین و دڵڕفێن بوون، تا بڵێی ڕووناک، زۆر کراوە و ئارامبەخش بوون. هەرکەس چاوی بە چاوەکانی بکەوتایە، یەکسەر شێت و شەیدای ئەو چاوە درەوشاوانەی دەبوو. بەڵام ئێستا کە تەمەنی هەڵکشابوو بەرەو چل ساڵی، ئەو ڕووناکییەی چاوەکانی، ئەو درەوشانەوە ڕووناکەی چاوەکانی، ئەو چاوانەی وردەوردە چواردەوری بە لۆچی بچووک و ورد دەتەنرا، ئەمڕۆ ئەم چاوانە ڕوو لە کزبوون دەکەن و وەختە بۆ هەمیشە تروسکاییی ڕووناکیی ئەم چاوانە بکوژێتەوە، تەنانەت ئێستا، ئەم چاوانە نەک چیی تر وەک جاران سەرنجڕاکێش نین، بگرە ئێستا ئەم دوو چاوە ئابڕووبەریشە و نهێنییەکانی پیاوێکی شەکەت و ماندوو ئاشکرا دەکات، پیاوێک، کە زۆر پابەند نەبووە و نییە بە بنەما ئاکارییەکانەوە، هەموو ئەو خۆبەزلزانی و دووڕوویی و ڕابواردنانەی ڕۆژانی ڕابردووی، کە زۆربەی کاتەکانی خۆی پێ بەڕێ دەکرد ئاشکرا دەکات، پەردە لەسەر هەموو ئەو نهێنییانەی ژیانی هەڵدەماڵێت، کە چەندین ساڵە بەنهێنی لە ناخی خۆیدا هەڵی گرتبوون. ئەمڕۆ لەو چاوانەدا سێبەری شتێکی نوێ دەر کەوتووە، کە پێشتر ئەم سێبەرە بوونی نەبووە، ئەویش بریتییە لە سێبەری غەم و پەژارە، سێبەری ئازارچەشتن، غەمێک، کە ناتوانرێت بەئاسانی باسی لێ بکرێت، غەمێکی قووڵ و شاراوە. ئەم

غەمە بەتایبەت ئەو کاتانە دەر دەکەوت، کە تەواو تەنیا بووایە. بەڵام سەیرییەکەی لەوەدا بوو، کە ئەم پیاوە تەنیا دوو ساڵێک بەر لە ئێستا، شەیدای کەیف و خۆشی و زەماوەندی پڕ لە غەڵبەغەڵب بوو، بێباک و جەفەنگبازێکی باش و نووکتەبازێکی زۆر بەناوبانگ بوو، بەڵام ئێستا حەزی لە هیچ شتێک نەدەکرد، تەنها شتێک کە حەزی پێ دەکرد و زۆر پێی ئاسوودە دەبوو، *تەنیایی تەواو* بوو. هەر بەئەنقەست دەستبەرداری چەندین پەیوەندی لەگەڵ ناسیاوەکانیدا ببوو، کە ئەیتوانی تا ئێستاش دەستبەرداریان نەبێت، سەرەڕای ئەو تەنگەژە داراییەشی کە بۆی دروست ببوو. ئەمە ڕاستە کە خۆبەزلزانییەکەشی پشکی هەبووە لە کۆتاییهێنان بەم پەیوەندییانە. بە هۆی خۆبەزلزانییەکەی و دڕدۆنگبوونە لەڕادەبەدەرەکەی کە بۆی دروست بووبوو، چیی تر کارێکی ئاسان نەبوو بۆی، کە درێژە بە پەیوەندییە دۆستانەکانی بدات. بەڵام ئەم خۆبەزلزانییەشی وردەوردە لە تەنیاییدا گۆڕانی بەسەردا دەهات. هەڵبەت لە ڕاستیدا خۆبەزلزانییەکەی نەک هەر کەمی نەکرد، بگرە بە پێچەوانەوە، بەڵام وردە وردە پەرەی دەسەند بۆ جۆرێکی تایبەت لە خۆبەزلزانی، کە ئەمە شتێکی نوێ بوو بۆ ئەو، ئەو هۆکارانەی ئێستا ئازاری دەدەن، بەتەواوی جیاوازە لە هەموو ئەو هۆکارانەی لە ڕابردوودا بێزاری دەکردن؛ ئەم هۆکارانە، هۆکارگەلێک بوون، کە پێشبینی نەدەکرا، هۆکارگەلێکی *بەرز* بوون، ئەگەر بشێت بەم شێوەیە گوزارشتی لێ بکرێت. "ئەگەر بەڕاستی هۆکارگەلی بەرز یان هۆکارگەلی نزم بوونی هەبێت..." ئەم قسەیەی کۆتایی، هۆکارگەلی بەرز و هۆکارگەلی نزم، خودی

ڤیلچانینۆڤ زیادی کرد بۆ سەر قسەکان.

بەڵێ، کاری گەیشتبووە ئەو ئاستەی نیگەرانیی ئەم جۆرە بیرۆکانە، "هۆکارە بەرزەکان" بێت، کە پێشتر هەرگیز بە بیریشیدا گوزەری نەدەکرد، کە بیر لە شتی وا بکاتەوە. لە بیر و دەروونی خۆیدا، تەواوی "هۆکارە بەرزەکان،" کە خۆی وای ناو دەنان و "جێگەی سەرسووڕمانی بوو" هەرگیز بەڕووی خۆیدا نەدەهێنا، کە بەو بیرۆکانەی خۆی پێبکەنێت. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم شتە لەناو خەڵکدا بووایە، ئەوکات زۆر جیاوازتر دەبوو! لە ڕاستیدا خۆشی زۆر باش ئەوەی دەزانی، ئەگەر بارودۆخێکی وای بۆ بێتە پێش، ئەوە بێ دوودڵی و بێ دواکەوتن لە یەکەم بۆنەدا کە بۆی ڕێک دەکەوت، بە دەنگی بەرز هەموو ئەو بیرۆکە نهێنییانەی کە لە ناخی خۆیدا حەشاری دابوون، هەموو ئەو بیرۆکانەی ناوی نابوون "هۆکارە بەرزەکان،" پشتگوێ دەخستن و خودی خۆی یەکەم کەس دەبوو کە بەم بیرۆکانەی خۆی پێبکەنێت. هەڵبەت بێ ئەوەی خۆی شلوێ بکات و بەسەر خۆیدا بهێنێت. لەڕاستیدا هەر بەم شێوەیەش دەبوو، سەرەڕای ئەوەی لەم دوادواییەدا جۆرە سەربەخۆییەکی بەرچاوی لە شێوەی بیرکردنەوەکانیدا بەدەست هێنابوو توانیبووی خۆی لە دەستی "هۆکارە نزمەکان،" کە پێشتر و تا ئەم ساتەش زاڵ بوون بەسەر بیرکردنەوەکانیدا، ڕزگار بکات. هەروەها چەندین جار، کاتێک بەیانییان لە خەو هەڵدەستا، هەستی بە شەرمەزاریی خۆی دەکرد بە هۆی هەموو ئەو بیرۆکە و هەستانەی لە کاتی شەو و بێخەویدا بۆی دروست دەبوو! لەم دوادواییانەدا، بەدەست بێخەوییەوە، بەردەوام

ئازاری دەچەشت. ماوەیەکیش بوو پەیی بەوە بردبوو، کە بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو هەستەوەر بووە بەرامبەر بە هەموو شتێک، ئیتر ئەو شتە شتێکی پڕوپووچ بووایە یان شتێکی بەبایەخ. هەر لەبەر ئەمەش بڕیاری دابوو، تا پێی بکرێت، کەمتر بڕوا بە هەستەکانی خۆی بکات. بەڵام هەندێک ڕاستی هەبوو، نەیدەتوانی خۆیانی لێ لا بدات، ڕاستییەکەی، ناچار بوو ئەو ڕاستییانە قبوڵ بکات. لەم دوادواییانەدا، بیرکردنەوەکانی لەگەڵ هەستەکانی، هەندێک جار لە کاتی شەودا، بەتەواوی دەگۆڕان بۆ شتگەلێکی تر، زۆربەی جار ئەو هەست و بیرکردنەوانە تەواو جیاواز دەبوون لەوەی لە بەشێکی ڕۆژدا بیری لێ دەکردنەوە. ئەم بابەتە تووشی سەرەگێژەی کردبوو، تەنانەت سەبارەت بەم بابەتە ڕاوێژی بە پزیشکێکی ناودار کرد، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان سووکەناسیاوییەکی لەگەڵیدا هەبوو؛ بەدڵنیاییەوە ئەم ئاریشەیەی بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕانە بۆ پزیشکەکەی باس کرد. ئەو وەڵامەی دەستی کەوت، بریتی بوو لەوەی گۆڕان بەسەرداهاتنی بیرۆکەکان و هەستەکان، هەروەها دووفاقیبوونی بیرکردنەوەکان و هەستەکانیش، بەتایبەت لە کاتەکانی بێخەوی و بەتایبەتی لە شەودا، دەرکەوتەیەکی گشتی و بەربڵاوە لەناو ئەو کەسانەی "بیر دەکەنەوە و هەست دەکەن." هەموو ئەو بیروباوەڕانەی مرۆڤێک بەدرێژایی هەموو ژیانی باوەڕی پێی هەبووە، هەمووی بەتەواوی لەژێر کاریگەریی ماخولیاو لە کاتی شەودا و لە بێخەویدا گۆڕانی بەسەردا دێت. لەپڕ و بێ هیچ هۆکارێکی ڕوون، لەم کاتانەدا بڕیاری چارەنووسساز دەدرێت، بەڵام

هەموو ئەمانەش، بێگومان ئاستێکی دیاریکراوی خۆی هەیە – هەر بۆیە لە ڕاستیدا هەرکاتێک کەسی تووشبوو هەستی بەم دووفاقییە کرد لە هەستەکانیدا، بەم شێوەیە وردەوردە دەبێتە سەرچاوەی ئازارچەشتن بۆ ئەو کەسە، کاتێکیش هەست بەمە کرا، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەو کەسە نزیک بۆتەوە لە تووشبوون بە نەخۆشییەکی ڕاستەقینە؛ باشترین ڕێگەش بۆ چارەسەرکردنی کەسی تووشبوو، ئەوەیە بە شێوەیەکی ڕیشەیی شێوازی ژیانکردنی بگۆڕێت، هەروەها شێوازی خۆراکەکەشی بگۆڕێت، یان هەوڵ بدات گەشتێک بکات. دەرمانی هێورکەرەوەش زۆر بەسوود دەبێت.

ڤێلچانینۆڤ چیی تر بەلایەوە گرنگ نەبوو لەوە زیاتر ببیستێت، بەڵام بۆی ڕوون بووەوە وا دەر دەکەوێت، کە نەخۆش بێت.

هەندێک جار بەوەڕسییەوە لەبەر خۆیەوە هاواری دەکرد، "کەواتە هەموو ئەم شتانە تەنها نەخۆشییە، هەموو ئەو 'هۆکارە بەرزانە' هیچ نییە، جگە لەوەی کاریگەریی نەخۆشییەک نەبێت!" دڵی بەوە تێکەڵ دەهات، کە دەبوو ئەم بابەتە بەناچاری قبوڵ بکات.

هەر هێندەی کەمێک کات تێپەڕی، بەزوویی هەموو ئەو شتانەی، جگە لەوەی لە کاتەکانی شەودا ڕووی دەدا، سەرلەنوێ لە بەیانییەکەیشیدا دووبارە دەبووەوە، بەڵام زۆر ئاڵۆزتر لەوەی لە شەودا ڕووی دەدا، بەقینەوە لەبری پەشیمانی، بەلاقرتێوە لەبری بەسۆزی. ئەوەی بەڕاستی ڕووی دابوو، ڕووداوگەلێکی بێچەندوچوون بوون کە لە ژیانی ڕابردوویدا ڕووی دابوو، تەنانەت ئەو ڕووداوانەشی

کە هەر زۆر لەمێژ بوو ڕوویان دابوو، بە شێوەیەکی لەناکاو، مەگەر هەر خودا خۆی بزانێت لەبەر چی، بەرەبەرە بە شێوەیەکی لەسەرخۆ بیری دەکەوتنەوە، بەڵام بەتەواوی بە شێوەیەکی زۆر سەیر دەهاتنەوە یادی. هەر بۆ نموونە، ماوەیەک بوو ڤێلچانینۆڤ گازندەی ئەوەی دەکرد، کە تووشی لەبیرچوونەوەی درێژخایەن هاتووە. ڕوخساری ئەو کەسانەی لەیاد دەکرد، کە پێشتر دەیناسین، ئەمەش دەبووە مایەی بێزاریی ئەو کەسانەی چاویان پێی دەکەوت و ئەیدا بەلایاندا، وەک ئەوەی نەیانناسێت؛ هەندێک جاریش بەتەواوی ئەو کتێبەی لەبیر دەکرد، کە چەند مانگێک پێشتر خوێندبوویەوە. هێشتاش، سەرباری ئەم لاوازییە ئاشکرایەی ڕۆژبەڕۆژ بەسەر بیرکردنەوەیدا دەهات "ببووە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ نائاسوودەییی ئەو،" هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیی بە ڕابردوویەکی زۆر دوورەوە هەبوو، ئەو شتانەی دە یان پازدە ساڵ بوو بەتەواوی لەیادی کردبوون، ئێستا، بێ ویستی خۆی، هەندێک جار لەناکاو و بە وردەکارییەکی زۆرەوەو بە شێوەیەکی سەرسوورهێنەر، هەمووی سەرلەنوێ وەبیر دەهاتەوە، کە وا هەستی دەکرد سەرلەنوێ، بۆ جارێکی تر لەناو هەموو ئەو شتانەدا دەژێتەوە. هەندێک لەو ڕاستییانەی زۆر لەمێژ بوو بەتەواوی لەیادی کردبوون، کاتێک وەبیری دەکەوتنەوە، وەک پەرجوویەک لێی دەڕوانین، کە سەرلەنوێ ئەم ڕاستییانەی بیر کەوتۆتەوە. بەڵام ئەمە هەموو شتێک نەبوو، لە ڕاستیدا، چ کەسێک هەیە ژیانێکی پڕ لە ئەزموون ژیابێت و لەم جۆرە یادەوەرییە سەیرانەی نەبێت؟ بەڵام گرنگترین شت ئەوە بوو، هەموو ئەوەی ئێستا بیری

دەکەوتەوە، تەواو بێخەوش، سەرسووڕهێنەر، کە پێشتر بە خەیاڵیشیدا نەدەهات، بیری دەکەوتەوە، بە شێوەیەک شتەکانی بیر دەکەوتەوە، وەک ئەوەی یەکێک بەئەنقەست ئەم شتانەی بەیاد بهێنێتەوە. بۆچی هەندێک لەو شتانەی بیری دەکەوتنەوە، ئێستا وەک دیمەنی تاوانێکی ڕاستەقینە لە مێشکیدا بەرجەستە دەبێت؟ ئەمە ئەو پرسیارە نەبوو، کە بتوانێت بەتەنیا دادوەریی مێشکی خۆی پێ بکات.

ئەو کەمەکێک باوەڕی خۆی بەخشیبوو بە مێشکە تاریک و تەنیا و نەخۆشەکەی، بەڵام گەیشتبووە ئاستێکی وەها نەفرەتاوی، کە خەریک بوو فرمێسکی پێ دەڕشت، لە ناخەوە فرمێسکی پێ دەڕشت.

زۆر سەیر بوو ئەگەر دوو ساڵ پێشتر یەکێک پێی بوتایە ڕۆژێکت بۆ دێتە پێش، تیایدا فرمێسک دەڕێژیت، ئەوا هەرگیز باوەڕی بەو قسەیە نەدەکرد! ئەو شتانەی لە سەرەتادا بیری دەکەوتنەوە، زیاتر شەرمەزارییەکانی بوو وەک لە شتە سۆزدارییەکانی. ئەو شکستانەی وەبیر دەهاتەوە، هەروەها ئەو ترۆکردنانەی لە کۆمەڵگە بەگزادەییەکەیدا بەسەریدا هاتبوو، بۆ نموونە، ئەوەی بیر کەوتبووەوە، کە چۆن یەکێک لە هاوڕێ فێڵبازەکانی، کاتی خۆی بوختانی بۆ هەڵبەستووە و هەر بە هۆی ئەو بوختانەوە لە یەکێک لەو ماڵانەی ویستوویەتی بۆی بچێت، پێشوازیی لێ نەکراوە و ڕێگریی چوونەژوورەوەشی لێ کراوە، یان، بۆ نموونە، کە ماوەیەکی هێندە زۆر نەدەبوو، بە شێوەیەکی ئاشکرا و زۆر ڕوون بێڕێزی و سووکایەتیی بەرامبەر کرابوو، بێ ئەوەی ئەم هەوڵ بدات کەرامەتی ڕووشاوی خۆی بەدەست

بهێنێتەوە لە ڕێگەی بانگهێشتکردنی کابرای سووکایەتیپێکەر بۆ دوێل، یاخود ئەوەی بیر کەوتبووەوە، کە چۆن جارێک لەناو دەستەیەک ئافرەتی دڵڕفێندا قسەگەلێکی توێکڵدار و مزریان پێ وتووە و ئەمیش دەمی بووە بە تەڵەی تەقیو و نەیتوانیوە هیچ وەڵامێک بداتەوە. تەنانەت یەک یان دوو قەرزی نەدراوەی بیر کەوتبوویەوە - ڕاستە کە یەکێکیان بڕێکی کەم بوو، بەڵام ئەو قەرزانەی بە شەرەفی خۆی بەڵێنی گەڕانەوەی پێ دابوون - لە کەسانێکی وەر گرتبوو کە چیی تر ئەم هامۆشۆی ئەو کەسانەی نەدەکرد و پەیوەندیی لەگەڵ بڕیبوون، تەنانەت لە پاشملە لێرەولەوێ قسەی ناشرینیشی بەو کەسانە دەوت! هەروەها بەئازارەوە ئەوەی بەیاد دەهاتەوە، "بەڵام ئەمەیانی لە خراپترین ساتەکانی"دا، ئەو دوو سامانە زەبەلاحەی یەک لە یەک گەورەتر بوون، کە بە ڕێگەیەکی گەمژانە بەفیڕۆی دابوون. بەڵام هەر زوو دەستی دەکردەوە بە بیرکردنەوە لە "هۆکارە بەرزەکان."

لەناکاو، بۆ نموونە، "بێ هیچ هۆکارێ،" کەسایەتییەکی لەبیرکراوی بیر کەوتبوویەوە، کە زۆر لەمێژ بوو لەبیری کردبوو، بیرەوەریی فەرمانبەرێکی بەتەمەنی سەرسپیی نامۆ و بێزیان، ماوەیەکی زۆر، زۆر لەمەوپێش، لە شوێنێکی گشتی و پڕ لە خەڵک، تەنها بۆ ڕازیکردنی خۆی و خۆبەزلزانیی خۆی، سووکایەتیی بەو پیرەمێردە داماوە کردبوو، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی بەو گاڵتە و سووکایەتییەی بەو پیاوە داماوە ناوبانگ دەر بکات و دواتریش پێوەی بنازێت، لە نڕاستیدا ئەم کارەشی بۆ چووبووە سەر، ئەوەی ئامانجی بووبوو، پێکابووی، چونکە هەر زوو لەلایەن ئەوانی ترەوە

لاقرتێکانی بەگاڵتەوە وترابوونەوە. بە شێوەیەک ئەم ڕووداوەی لەیاد کردبوو، تەنانەت نازناوی ئەو پیرەمێردەشی بیر نەدەکەوتەوە، بەم شێوەیە هەموو ئەوەی پەیوەندیی بەو ڕووداوەوە هەبوو، بە شێوەیەکی پەرجووئاسا لە مێشکیدا زۆر بە ڕوونی بەرجەستە دەبووەوە. زۆر بەباشی کەوتەوە یادی، کە ئەو پیرەپیاوە بەرگریی لە کچەکەی دەکرد، کچەکەی شووی نەکردبوو، هەر بۆیە بەقەیرەیی مابووەوە و ببووە جێگەی قسەوباسی دانیشتووانی شارۆچکەکە. پیرەپیاویش بەوپەڕی توورەییەوە کەوتبووە وەڵامدانەوە، بەڵام لەناکاو، لە بەردەم ئەو حەشامەتەی لەوێ ئامادە دەبن، خۆی بۆ ناگیرێت و ئەدات لە پرمەی گریان و ئەمەش وای کردبوو کەمێک هەستی ئەو خەڵکەی لەوێ ئامادە ببوون، بجزووێنێت. ئەوانیش هەر بۆ جەفەنگ، پیرەی داماو بە شەمپانیا مەست دەکەن و ئەیکەن بە سەرگەرمییەکی باش بۆ خۆیان و لە ناخی دڵیانەوە بەو پیرە بەدبەختە پێکەنیبوون. ئێستاش کاتێک ڤێلچانینۆڤ بەبێ هیچ هۆکارێک بەسەرهاتی ئەم پیرە هەژارەی بیر کەوتبووەوە، کە چۆن ڕوخساری خۆی لەناو دەستەکانیدا شاردبووەوە و وەک منداڵێکی بێکەس هەنسکی ئەدا، لەپڕ هەستی کرد هەرگیز ئەم ڕووداوەی لەبیر ناچێتەوە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوورمان بوو، ئەوە بوو زۆربەی دیمەنەکانی، کە لەو کاتەدا بۆ ئەو زۆر جێگەی پێکەنین بوون، بەتایبەت هەندێک وردەکاریی وەک شێوەی شاردنەوەی ڕوخسارەکە لەناو دەستەکاندا، بەڵام ئێستا ئەو شتە تەواو پێچەوانەکەی ڕاستە، هەنووکە ئەو دیمەنە لە هەموو شتێک زیاتر ئازاری دەدا.

دواتر ئەوەی بیر کەوتەوە، کە چۆن هەر بۆ خۆشیی دڵی خۆی، قسەی بۆ خێزانی مامۆستای خوێندنگەکەی خۆی هەڵبەستووە، کە ئافرەتێکی جوان و دڵڕفێن بووە، پاشان ئەم قسانە چۆن گەیشتبوونەوە بە گوێی مێردەکەی. هەر دوای ئەوە، ڤێلچانینۆڤ دەستبەجێ شاری بەجێ هێشتبوو، هەرگیز نەیزانیبوو سەرەنجامی بوختانە ناڕەواکەی بەکوێ گەیشتبوو، بەڵام ئێستا بیری لەوە دەکردەوە، کە ئەبێت هەموو ئەو ڕووداوە چۆن کۆتاییی پێ هاتبێت، ئەگەر لەناکاو یادەوەرییەکی تری نزیک لەم یادەوەرییەی بیر نەکەوتبایەتەوە، کەس نەیدەزانی بیرکردنەوەی لەو بەسەرهاتە بەرەو کوێی دەبرد. یادەوەریی کچێکی لاو لە چینی ڕەنجدەران، بەلای خۆیەوە کچەکە تەنانەت سەرنجڕاکێشیش نەبووە، بەڵکوو پێشی وا بووە دەبێت لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت، هەر بەڕاستی ئەو شەرمەزار بوو لە حاڵی خۆی. هێشتاش، سەرباری ئەوەش، نەیدەوت چ شتێک هانی داوە بۆ هەستان بە وەها کارێک، ئەو داماوەی خستبووە ناو کێشەیەکی گەورەوە و زۆر بەسادەییش دەستبەرداری خۆی و منداڵەکەشی ببوو، کاتێک پترسبۆرگی بەجێ هێشتبوو، تەنانەت بەبێ خوداحافیزلێکردن بەجێی هێشتبوون، "ئەوە ڕاست بوو کە هێندە کاتی نەبووبوو تا بەفیڕۆی بدات." دواتر و بۆ ماوەی یەک دانە ساڵی ڕەبەق، هەوڵی دابوو سەرلەنوێ ئەو کچە بدۆزێتەوە، بەڵام هەوڵەکانی سەرنەکەوتوو ببوو لە دۆزینەوەیدا. وا دەر دەکەوت ڤێلچانینۆڤ بە سەدان یادەوەریی لەم جۆرە یادەوەرییانەی هەبووبێت، کە پێدەچوو هەریەکێک لەو یادەوەرییانەش، دەستەیەک یادەوەریی تر

بەشوێن خۆیدا بهێنێت. وردەوردە خۆبەزلزانییەکەشی، بە هەمان شێوە، دەبووە ئازار.

پێشتر وتمان کە خۆبەزلزانییەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، گۆڕابوو بۆ شتێکی زۆر سەیر. ئەوە ڕاست بوو، هەندێک کات "هەرچۆنێک بێت، هەندێک کاتی دەگمەن" تەنانەت خۆشی لەبیر دەچووەوە، کە چیی تر بەلایەوە شەرم نەبوو ئەگەر گالیسکەی تایبەت بە خۆشی نەبێت، بەخاوی و بەپێ لەم دادگاوە دەچوو بۆ یەکێکی تر، هەروەها بە شێوەیەک لە شێوەکانیش، چی یتر بایەخێکی ئەوتۆی بە پۆشینی جلوبەرگەکانیشی نەدەدا. ئەگەریش ڕێک بکەوتایە، یەکێک لە ناسیاوەکانی ئەمی لەناو شەقامێکدا ببینییایە و بە چاوێکی پڕ لە تووک و نەفرەتەوە لێی بڕوانییبایە، ئەوا ئەم خۆی لێ هەڵە دەکرد و وا خۆی نیشان دەدا، کە هەرگیز هەر نەشیناسیبێت و بەم شێوەیە پشتگوێی دەخست. ڕەنگە هەر بەڕاستی هێندە بەخۆدانازینی هەبووبێت، کە بەس بووبێت بۆ ئەوەی بەلای ئەو کەسەدا گوزەر بکات، بەبێ ئەوەی بچووکترین ڕووگرژییەک لە خۆشی نیشان بدات. ئەم گوێپێنەدانەی زۆر ڕاستەقینە بوو، بەمەبەست ئەمەی نەدەکرد. بەدڵنیاییەوە ئەمە تەنیا هەندێک کات ڕووی دەدا، تەنها ئەو کاتانە ڕووی دەدا، کە ئاگای لە خۆی نەبووایە یاخود شڵەژاو یان وەڕس بووایە، لەگەڵ هەر بابەتێک کە بۆ یەک جار کاریگەریی لەسەر بەجێ بهێشتایە، دواتر وردەوردە بایەخی خۆبەزلزانییەکەشی کەمی دەکرد. هەنووکە هەموو بیری خۆی تەنیا لەسەر یەک پرسیار چڕ کردبووەوە، ئەو پرسیارەی بەبەردەوامی وەک تارماییەک لە کۆڵی نەدەبوویەوە.

بە دەنگێک، کە لێوڕێژ بوو لە گاڵتەجاڕی، بە خۆی دەوت، "بۆچی، کەسێک بیر دەکاتەوە،" ڤیلچانینۆڤ هەرکات بیری لە خۆی بکردایەتەوە، ئەوە هەمیشە ئەیکرد بە قەشمەرییات و بەگاڵتەجاڕییەوە لە خۆی دەدوا، "بۆچی کەسێک بیر دەکاتەوە، کەسێک لەو سەرەوە و لە خەمی ئەوەدایە چۆن ئاکارەکانی من بگۆڕێت و ئەم یادەوەرییە تەڵخ و نەفرەتییانەم بەبیر دێنێتەوە و فرمێسکی پەشیمانیم پێ دەڕێژێت! زۆر باشە، با وا بێت، بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی نابێت! هەموو ئەم هەوڵە بۆ بەئاگاهێنانەوەی من، وەک ئەوەیە فیشەک بە تاریکییەوە بنرێت! هەرچەندە من، بەدڵنیاییەوە نازانم، زۆر لە دڵنیایی دڵنیاتریش، کە سەرەڕای ئەو هەموو فرمێسکی پەشیمانی و سەرەڕای ئەو هەموو سەرکۆنەکردنەی خۆم، تۆزقاڵێکیش چییە، سەربەستیم نەبووە لە تەواوی هەموو ئەم تەمەنە پڕ لە گەوجێتییەی خۆم، کە بەڕێم کردووە! هێندە بەسە کە سبەینێ هەمان ئەو دەرفەتانەی جارانم بۆ هەڵبکەوێتەوە، بۆ نموونە، ئەگەر دۆخەکەی لەبار بێت، ئەوا لە قازانجم دەبێت کە سەرلەنوێ جاڕ بدەم و بیکەم بە هەرا و بوختانێکی تر بۆ ژنی مامۆستاکەم هەڵببەستمەوە و بڵێم ئەو خانمە دیارییەکانی قبوڵ کردووم. بەوپەڕی دڵنیاییەوە لەدەستم دێت ئەو کارە دووبارە بکەمەوە - بێ ئەوەی پاشگەزیش ببمەوە لێی، ئەوکات ئەم کارە لەبەر ئەوەی بۆ جاری دووەم دەبێت، ئەوا لە جاری یەکەم ئابڕووچوونی زیاتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت و قێزەونتریش دەبێت. بەڵێ، هێندەم بەسە جارێکی تر ئەو شازادە بچکۆلانەیە سووکایەتیم پێ بکاتەوە، ئەو کوڕەی تاقانەی دایە گیانی بوو، کە یانزە ساڵ بەر لە

ئێستا لەسەر سووکایەتییەک، کە پێی کردبووم، فیشەکێکم نا بە قاچییەوە و قاچیم شکاند، هێندە بەسە جارێکی تر سووکایەتیم پێ بکاتەوە، ئەوە بێ ئەوەی چرکەیەکیش لەدەست بدەم بۆ شەڕی دەستەویەخە بانگهێشتم دەکرد و دارشەقێکی ترم بەدیاری پێشکەش دەکرد، هەر وەک چۆن جاری یەکەم دارشەقێکم بەدیاری پێشکەش کرد... کەواتە سوودی ئەم وەبیرهێنانەوانە لە چیدایە! ئایا ئەمە وەک ئەوە نییە هەر بەڕاستی فیشەکێک بە تاریکییەوە بنرێت؟ ئەبێت چ باشییەک لەم وەبیرهێنانەوانەدا هەبێت، لە کاتێکدا من تۆزقاڵێکیش چییە، توانای ئەوەم نییە لە خودی خۆشم ڕابکەم؟"

هەرچەند بەسەرهاتی ژنی مامۆستای خوێندنگەکە جارێکی تر دووبارە نەبووەوە، هەرچەندە هیچ دارشەقێکیش بەدیاری پێشکەش بە کەس نەکرا و تەنها بیرکردنەوەی لەوەی دەیوت بەدڵنیاییەوە ئەم کارانە دووبارە دەکەمەوە، ئەگەر دۆخەکەی گونجاو بێت، هەندێک کات... خەریک بوو لەناوی دەبرد. لە ڕاستیدا هیچ کەسێک ناتوانێت بۆ هەمیشە بە هۆی یادەوەرییەکانیەوە ئازار بچێژێ. هەرکەسێک پێویستی بەوە دەبێت، ماوەماوە وچانێک بدات و کەمێک پشوو بدات، کەمێکیش بەخۆشی ڕابوێرێت.

لە ڕاستیدا ڤێلچانینۆڤ ئەم کارەی کرد؛ ئەو ئامادە بوو ماوەماوە جەوی خۆی خۆش بکات، بەڵام ئەم نیشتەجێبوونە کاتییەی لە پترسبۆرگ، تا کات تێپەڕ ببووایە، زیاتر و زیاتر ناخۆشتر دەبوو بۆی. مانگی جولای نزیک ببووەوە. هەندێک جار لەناکاو بەبیریدا دەهات دەستبەجێ دەستبەرداری هەموو

شتێک ببێت و تەنانەت دۆسیەکەشی لە دادگا، خێرا گەشت بکات بەرەو شوێنێک، ئیتر شوێنەکە بەلایەوە گرنگ نەبوو، گرنگ ئەوە بوو بێ ئەوەی ئاوڕ بۆ دواوە بداتەوە، گەشت بکات و واز لە هەموو شتێکیش بهێنێت. بۆ نموونە، گەشت بکات بۆ کریمییا. بەڵام ئەگەر بە هۆی هەر بیرکردنەوەیەکی تر لەو کاتەدا کە بهاتبایە بە مێشکیدا، ئەوە دوای تێپەڕبوونی یەک کاتژمێر، گاڵتەی بە تەواوی بیرۆکەکەی خۆی دەهات و پێی دەخەنییەوە، "ئەم بیرۆکە قێزەونانە یەک، تۆزیش چییە، دەستم لێ هەڵناگرن، تا ڕەوانەی باشوورم نەکەن، هیچ گەشتێک ناتوانێت ڕزگارم بکات لەم بیرکردنەوانە، ئەگەر من تۆزقاڵێک چییە ڕەوشتم هەبێت، ئەوا نابێت لێیان هەڵبێم، چونکە هەڵهاتن لێیان، بێسوودە، لە ڕاستیداهیچ هۆکارێکش نییە تا لێیان هەڵبێم."

لەو خانەی دادانەش کە کارەکانمی لێ ڕادەپەڕێنم، لەناو ئەو خەڵکە سەرقاڵەی وەک مشک بێسوودانە خەریکی ڕاکەڕاک و جرتوفرتن. تەواوی ئەو خەڵکەی لە شارۆچکەکەدا ماون، تەواوی ئەو ڕوخسارانەی ڕۆژ تا ئێوارە، لە بەرچاوەکانم دێن و دەچن، ساویلکەیی و گەوجییان، خودپەسەندییان، دڵلەرزۆکی و ڕۆحە ترسنۆکەکانیان، بێهەستیی دڵەکانیان، هەرچی لە ناخە بچووکەکەیان دەری دەخەن و هەرچی لە دڵە لاوازەکانیاندایە، لە ترس، دەری دەخەن. بەڕاستی ئا ئەمەیە بەهەشتی ڕاستەقینە بۆ پیاوێکی ماخولیایی، هەتەرانە قسە دەکەن! هەموو شتێک لێرە ڕوون و ئاشکرایە. هیچکەس بە پێویستی نازانێت بیر لەوە بکاتەوە، کە هیچ

شتێک بشارێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا، لەنێوان خانەدانەکانمان، کە لە هەندێک لە ڤێللا هاوینەکانمان یاخود لەو ناوچانەی ئاوی کانزاییی لێیە، شتەکان دەشارنەوە، یاخود لە دەرەوەی سنوور - بەم شێوەیە هەموو شتێک جێگەی ڕێز و پێزانینە، ئەگەر بەتەنیا لەبەر ئەو ڕاشکاوی و سادەیییەشەوە بێت!... نامەوێت دوور بکەومەوە! لێرە دەمێنمەوە، ئەگەر شەقیشم بردبێت!

# ٢

# ئەو پیاوەی
# شریتێکی ڕەشی بەستبوو بە کڵاوەکەیەوە

سێی حەوت بوو. گەرماکەی وشک و تاقەتپڕووکێن بوو. یەکێک لە هەرە سەرقاڵترین ڕۆژەکانی ڤیلچانینۆڤ بوو؛ تەواوی بەیانییەکەی ناچار بوو بەو شێوەیە تێبپەڕێنێت، کە هەندێک جار بە پێ و هەندێک جاریش بە گالیسکە لەم شوێن بچێت بۆ ئەو شوێن. شەوەکەشی دەبووایە چاوی بە پیاوێکی بەڕێز بکەوتایە، کە بە هیچ شێوەیەک نەدەبوو بینینەکەی دوا بخات یان پشتگوێی بخات - ئەو پیاوە بەڕێزە پارێزەر و ڕاوێژکارێکی شارستانی بوو، کە ڤیلچانینۆڤ دەیویست بێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەختە، لە ڤیلاکەی خۆی، لە دەرەوەی شارۆچکەکە چاوی پێی بکەوێت.

لە کاتژمێر شەشدا ڤیلچانینۆڤ، لە کۆتاییدا ڕۆیشت بۆ ڕێستورانتێک "نرخەکەی جێگەی ڕەخنە نەبوو، هەرچەند جۆری خواردەمەنییەکەشیان فەڕەنسی بوو" لەسەر مێزە

هەمیشەییەکەی خۆی، لەو قوژبنەدا لێی دانیشت، کە دەیڕوانی بەسەر شەقامی نیڤسکی و نزیک پردی پۆلیس. داوای خۆراکی ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کرد.

زیاتر خووی بە خواردنی ئەو جۆرە خۆراکەوە گرتبوو، کە ئێواران دەیخوارد نرخەکەی، بە عەرەقەوە، تەنها یەک ڕۆبڵ بوو، لە ڕاستیدا ئەو خۆراکەی داوای دەکرد و دەیخوارد، خۆراکێکی هێندە باش نەبوو، بەڵام بە هۆی ئەو تەنگژە دارایییەی ماوەیەک بوو ڕووی تێ کردبوو، ناچار بوو دەست بە پارەکانییەوە بگرێت و قوربانی بە خۆی بدات و بە کارێکی ژیرانەی نەدەزانی، کە زیادە خەرجی بکات لەم دۆخەی ئێستایدا. هەرچەند خۆشی سەری لەوە سووڕ مابوو، کە چۆن وەها خۆراکێکی بۆ قووت دەچێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر کە خۆراکەکەیان دەخستە بەردەستی، تا دواپاروو لێی نەدەوەستا - هەموو جارێکیش بە چێژێکی وەهاوە ئەو خۆراکەی دەخوارد، یەکێک نەیزانیبا و چاوی پێی بکەوتایە، وای دەزانی سێ دانە ڕۆژە عەشتەبای نەخواردووە. بۆیە زۆر جار لە ژێر لێوەوە، لەسەر ئەم مەیلە سەیرەی بۆ ئەم خۆراکە دەیگوت، "هەبێت و نەبێت، ئەمە جۆرێکە لە نەخۆشی." بەڵام ئەم جارەیان، جیاواز لە جارەکانی تر، بە جاڕزییەکی زۆرەوە لەسەر مێزە بچکۆلانەکەی دانیشت و بەوپەڕی تووڕەیییەوە کڵاوەکەی لە سەری هێنایە خوارەوە و برۆکانی هێنانەوە یەک و بە قووڵایی بیرکردنەوەدا ڕۆ چوو.

لەگەڵ ئەوەی ئەو لەو جۆرە دۆخانەدا، تا بڵێی خۆڕاگر و هێمن بوو، بەڵام هەنووکە ئەگەر بهاتبایە و کەسێک لە

نزیکیەوە نانی بخواردایە و بچووکترین دەنگی لێوە بهاتایە، یاخود ئەو شاگردەی خۆراکەکانی بۆ دەهێنا، ئەگەر بهاتبایە و ئەو داماوە هەر لە سەرەتاوە باش لە داواکارییەکانی تێنەگەیشتبایە، ئەوا دەستبەجێ دەیکرد بە هاتوهاوار بەسەریدا، وەک خوێندکارێکی کۆلێژی سەربازی و بۆیشی هەبوو یەک ئابڕووچوونی گەورە لەو شوێنەدا بەرپا بکات.

شۆرباکەیان لە بەردەمیدا دانا. کەوچکەکەی هەڵگرت، بەڵام پێش ئەوەی بتوانێت کەوچکەکە بەرێت بۆ دەمی، لەدەستی خزا و کەوتە خوارەوە، هێندەی نەمابوو کەوچکەکە لەسەر مێزەکە بەر ببێتەوە و بپەڕێتە سەر عەردەکە. لەو کاتەدا کە مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێت بە چ هۆکارێک، بیرۆکەیەکی زۆر سەیر بە میشکیدا برووسکەی کرد، کتوپڕ لە سەرچاوەی نیگەرانییەکانی خۆی تێگەیشت، ئەو نیگەرانییە سەیر و نائاساییەی بەم دوادواییانە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکی یەکلەدوایەک زۆر بەخراپی بەدەستیەوە ئازاری دەچەشت، کە بە هۆی چەند هۆکارێکی نەزانراوەوە، تا بهاتایە، نیگەرانییەکەی لەسەری قووڵتر دەبۆوە و بە چەند هۆکارێکیش کە ڕوون نەبوو، وا دیار بوو ئەو نیگەرانییانە نەیاندەویست لە کۆڵی ببنەوە. ئێستا کتوپڕ هەموو شتێکی بینیوە، هەموو شتێک لە بەرچاویا وەک پێنج پەنجەکەی دەست ڕوون و ئاشکرا بوو بۆی.

وەک ئەوەی سروشی بۆ هاتبێت، لەژێر لێوەوە وتی، "کەواتە هەمووی بە هۆی ئەو کڵاوەوەیە! تەنها بە هۆی ئەو کڵاوە نەفرەتییەوەیە، کە شریتی تازییەدارییە نەفرەتییەکەی پێوەیە، ئەوە هۆکاری هەموو شتێکە!"

دەستی کرد بە بیرکردنەوە - هەتا زیاتر بیری بکردایەتەوە، زیاتر و زیاتر دڵتەنگ و خەمین دەبوو، تا بهاتبا، لە چاوی خۆیەوە "سەرتاپای ڕووداوەکە" زیاتر نائاسایی دەر دەکەوت.

"بەڵام... ئەمە ڕێکەوت نیە،" بەم شێوەیە نارەزاییی دەر بڕی، چونکە نەیدەویست باوەڕ بە خۆی بکات. "ئایا هیچ شتێکی وا هەیە، کە وا نیشان بدات ئەمە لە ڕێکەوتێک بچێت!"

هەموو ئەوەی ڕووی دابوو، دەگەڕایەوە بۆ دوو هەفتەیەک لەوەوپێش "هەرچەندە بەوردییش بیری نەمابوو کە کەی ئەو ڕووداوە ڕووی دابوو، بەڵام خۆی پێی وا بوو دوو هەفتەیەک دەبێت" یەکەم بینینی لە شوێنێک، لەسەر شەقامەکە، نزیک سەر سووچی شەقامی پۆدیاچسکی و شەقامی مایستچانسکی بوو، پیاوێکی بەڕێز، کە کڵاوەکەی شریتێکی ڕەشی پێوە بوو بوو، پیاوە بەڕێزەکە وەک هەموو کەسێکی تر، کەسێکی ئاسایی بوو، هیچ جۆرە تایبەتمەندییەکی تایبەتیی تیا نەبوو، تا لە خەڵکی تری ئاسایی جیاوازتر دەری بخات. بەخێرایی بەلایدا تێپەڕیبوو، بەڵام بۆ تاوێک ئەم پیاوە بەڕێزە بە شێوەیەکی گوماناوییەوە چاوی بڕیبووە چاوەکانی ڤێلچانینۆڤ، ئەمەش، هەرچۆنێک بێت، وای کردبوو یەکسەر سەرنجی ڤێلچانینۆڤ بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. ڕوخساری بۆ ڤێلچانینۆڤ لە ناسیاو دەچوو. ئەو، بەدڵنیاییەوە پێشتر لە شوێنێک و لە کاتێکی تردا چاوی پێی کەوتبوو.

"بەڵام من بە هەزاران ڕوخسارم لە ژیانمدا بەرچاو کەوتووە، ناتوانم ئەو هەموو ڕوخسارە وەبیر خۆم بهێنمەوە!"

سەرەڕای ئەو هەستەی سەرەتا بە هۆی ئەو لێڕوانینەی کابراوە دروست ببوو، بەڵام کابرا هەمووی بیست هەنگاوێک دوور نەکەوتبووەوە، کە وا پێدەچوو ڤێلچانینۆڤ ئەم بەرەنگاربوونەوەیەی لەیاد کردبێت. بەڵام ئەو هەستەی سەرەتا، تەواوی ڕۆژەکە لە کۆڵی نەبۆوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان زۆر نامۆ بوو، مەسەلەکە شێوەیەکی سەیر و نادیاریکراوی وەر گرتبوو. ئێستا دوای تێپەڕبوونی دوو هەفتە، ڤێلچانینۆڤ هەمووی زۆر بەڕوونی بیر دەکەوتەوە. هەروەها بیری دەکەوتەوە، کە چۆن شکستی هێنابوو لەو کاتەدا و - نەیتوانیوە زاڵ ببێت بەسەر تووڕەیی و بێزارییەکەیدا، تەنانەت هەرچەندی دەکرد، نەیدەتوانی پەیوەندییەک لەنێوان هەموو بێزارییەکەی ئەو ئێوارەیەی لەگەڵ ئەو چاوپێکەوتنەی ئەو بەیانییەدا بدۆزێتەوە.

بەڵام وا دیار بوو پیاوە بەڕێزەکەش بە هیچ شێوەیەک کات بەفیڕۆ نەدات، لەوەی بۆ جارێکی تریش خۆی وەبیری ڤێلچانینۆڤ بهێنێتەوە، هەر یەک ڕۆژ دواتر بوو، کە بۆ جاری دووەم، سەرلەنوێ لە شەقامی نیڤسکی خۆی بە ڤێلچانینۆڤ نیشان دایەوە، دووبارە و دووبارە بە شێوەیەکی زۆر گوماناویتر لە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤی ڕوانیبووەوە. ئەمەش هێندەی تر ڤێلچانینۆڤی دەهری کردبوو، بەڵام هەر زوو بە خۆیدا دێتەوە، سەری لەوە سوور دەمێنێت، کە بۆچی دەبێت بەم شێوەیە دەهری ببێت! ئەمە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، کە هەندێک ڕوخساری نەناسراو لە یەکەم سەرنجدانا دەبنە هۆی ئەوەی مرۆڤ بێ خواستی خۆی ڕقی لێی بێتەوە و حەز بە چارەیان نەکات.

هەر دوای تێپەڕینی کاتژمێریک بەسەر یەکتربینینەکەدا، لەوپەڕی قووڵاییی بیرکردنەوەدا، لەژێر لێوەوە بەبۆڵەبۆڵێکەوە وتی، "بەڵێ، بەدڵنیاییییەوە لە شوێنێک بینیومە،" دووبارە ڤێلچانینۆڤ، تەواوی ئەو ئێوارەیەی لە شڵەژاوی و بەدگومانییەکی زۆر خراپدا بەڕێ کرد؛ تەنانەت شەوەکەشی نەیتوانی بەئاسوودەیی بخەوێت، چونکە دنیایەک خەوی ناخۆشی بینی. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا، تەنانەت بۆ یەک جاریش چییە، ئەو ئێوارەیە بە بیریدا نەهات هەموو ئەو نیگەرانی و بێزارییە بێبنەمایانەی تووشی بووە، هیچ نییە جگە لەوەی ئەو پیاوە بەڕێزەی شریتێکی ڕەشی بە کڵاوەکەیەوە بەستووە، لە نیشانەی ڕەشپۆشی و پرسە بەولاوە، هیچی دی نییە! ڕاستییەکەی، ئەگەر بۆی دەر بکەوتایە ئەم هەموو ئازارەی ئەیچێژێت، ئەو هەموو نیگەرانی و توورەبوونە، ئەوەی هەموو بیر و هۆشی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە و خەوی لە چاوەکانی تەراندووە، هۆکارەکەی ئەو "ئەو شتە پڕوپووچ"ەیە کە ئەو کەسە لە چلەی ماتەمینیدایە و بەو هۆیەوە خۆی ڕەشپۆش کردووە و شریتی ڕەشی بە کڵاوەکەیەوە بەستووە، زۆر لە حاڵی خۆی تەریق دەبووەوە، کە بابەتێکی ئاوا بێبایەخ، هەموو بیر و هۆشی بە خۆیەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ سەرقاڵ کردووە. دوو ڕۆژ دواتر، سەرلەنوێ ئەم دووانە لەناو ئەو حەشامەتەی لە یەکێک لەو کەشتییە هەڵمانەی ڕۆخی ڕووباری نێڤسکی دادەبەزین، چاوییان بەیەک کەوتەوە. لەم جاری سێیەمەدا، ڤێلچانینۆڤ ئامادە بوو سوێند بخوات، ئەو پیاوەی شریتە ڕەشەکەی بە کڵاوەکەیەوە بەستبوو، ئەمی

ناسیوەتەوە و لە کاتی قەرەباڵغییەکەشدا بەپەلە بەرەورووی هاتووە و بەتوندی شانیشی کێشاوە پیایدا، تەنانەت ڤێلچانینۆڤ وا خەیاڵی دەکرد، کە کابرا تەنانەت "زاتی ئەوەشی کردووە،" دەستی هەڕەشەکردنیشی بەرەوڕوو درێژ بکات. کێ چوزانێت، ڕەنگە تەنانەت بە دەنگی بەرز هاواری لە ناوەکەشی کردبێت لەناو حەشاماتەکەدا. بەڵام هەرچۆنێک بووبێت، ڤێلچانینۆڤ بە هۆی قەرەباڵغییەکەوە نەیتوانیبوو بەڕوونی گوێبیستی ناوی خۆی ببێت، بەڵام...

لەو کاتەدا کە ڤێلچانینۆڤ سواری گالیسکەیەک ببوو و بەرەو ئاڕاستەی دێری "سمۆلنی" دەڕۆشت، بەوپەڕی تووڕەیییەوە، لەژێر لێوەکانیەوە، بە پرتەوبۆڵە دەیوت، "ئەبێت هەر بەڕاستی ئەم ڕسوایە کێ بێت، ئەگەر هەر بەڕاستی من دەناسێت و هێندە پەرۆشی ئەوەیە کە خۆیم لێ نزیک بکاتەوە، بۆچی وەک پیاو نایەتە پێشەوە و ڕووبەڕووم ببێتەوە؟"

دوای نیوکاتژمێر، ڤێلچانینۆڤ مشتومڕێکی پڕ لە هەرای لەگەڵ پارێزەرەکەی کرد، بەڵام نزیکی سەرلەئێوارە، هەروەها شەویش سەرلەنوێ تووشی ئازارچەشتنێکی زۆر بووەوە بە هۆی هێرشی خەمێکی زۆر خراپ و زۆر نامۆ، کە بەتەواوی ئارامی لێ هەڵگرتبوو، لە کاتێکدا ڕوو بە ئاوێنەی ژوورەکەی، بە واقی وڕماوەوە وەستابوو و لە خۆی دەڕوانی، وتی، "تۆ بڵێی تووشی نەخۆشیی زراو نەبووبێتم؟"

ئەمە سێیەمین یەکتربینین بوو. دوای تێپەڕبوونی پێنج دانە ڕۆژی یەکلەسەریەک، چاوی بە "تەنیا کەسێک"یش

چییە، نەکەوت، هیچ هەواڵێکیش لەو ڕسوایەوە نەبوو. بەڵام بەردەوام بیرەوەریی ئەو پیاوەی شریتە ڕەشەکەی بە کڵاوەکەیەوە پێچابوو، دەهاتەوە بیری. ڤیلچانینۆڤ بە کەمێک سەرسامییەوە لە خۆی ڕوانی، وتی، "باشە، بەڕاست من چیم لێ بەسەر هاتووە - ئایا هەر بەڕاست لەسەر حسابی ئەو ،من نەخۆش کەوتووم، یان چی؟ همم!... ئەی کێ ناڵێت ئەویش بە هەمان شێوەی من، دنیایەک کاری نییە کە جێبەجێیان بکات لە پترسبۆرگدا؟ باشە تۆ بڵێی ماتەمینی بۆ کێ بگێڕێت، وا شریتی ڕەشی بە کڵاوەکەیەوە بەستووە؟ شتەکە ڕوون و ئاشکرایە، کە ئەو من ئەناسێتەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە، کە من ئەو ناناسمەوە. شتێکی تریش کە لێی تێناگەم، ئەوەیە بۆچی ئەم خەڵکە بۆ "پرسە و ماتەمینییەکانیان،" دەبێت شریتی ڕەش بکەن بە کڵاوەکانیانەوە! ئەگەر هەر بەڕاستی بۆ خۆنواندن و خۆدەرخستن ئەم کارە دەکەن، ئەوە بە بڕوای من بەس لێیان نایەت... وا هەست دەکەم ئەگەر بێت و لە نزیکترەوە لێی بڕوانم، ئەوە بەدڵنیاییەوە منیش ڕەنگە بیناسمەوە..."

وا دیار بوو شتێک بەهێواشی کار لە بیرکردنەوەکانی دەکات. وەک ئەوەی هەندێک سات مرۆڤ هەوڵی وەبیرهێنانەوەی ناوێک یان وشەیەک دەدات و لە مێشکی خۆیا ئەیهێنێت و ئەیبات و هەڵاوێردی دەکات و هەموو بیر و هۆشی خۆی لەسەر ئەو وشەیە چڕ دەکاتەوە، تەنها بۆ ئەوەی هەرچۆنێک بووە، ئەو ناوەی بەبیر بێتەوە. ڕاستە بەتەواوی ئەزانێت ئەو ناوە یان ئەو وشەیە چییە کە بەشوێنیدا وێڵە، ئەشزانێت چ مانایەکی هەیە، هەروەها هەموو

بیرکردنەوەکانیشی لە چواردەوری ئەو وشەیە قەتیس بووە، بەڵام هەرچی دەکات و هەرچۆنێک دەیهێنێت و دەیبات، بێسوودە، چونکە ئەو ناوە یان وشەیە، بە هیچ کلۆجێک خۆی نادات بەدەستەوە و بە هیچ شێوەیەک نایەتەوە یادی!

"ماوەیەک بوو... ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش بوو... هەروەها لە شوێنێک بوو... لەوێ بوو بەڵام... نەفرەت لەو ڕسوایە، چاوی دەر دەهات، چی بوو چی نەبوو، لەکوێ بوو یان لەکوێ نەبوو... ئەوە کەی کێشەی منە... لەپڕ تووڕە بوو، هاواری کرد، باشە هەر بەڕاستی هێندە دەهێنێت ئا بەم شێوەیە من خۆم ڕسوا بکەم! ئایا هەر بەڕاستی ئەم ڕسوایە ئەوە دەهێنێت، کە ئاوا خۆمی لە بەردەمدا بچووک بکەمەوە!..."

ڤێلچانینۆڤ تا بهاتایە، تووڕەبوونەکەی بە شێوەیەکی زۆر قێزەون زیادی دەکرد. بەڵام کاتێک ئێوارە، لەناکاو بیری ئەوەی کەوتەوە کە ئەو بەیانییە، بە شێوەیەکی "قێزەون" تووڕە ببوو، زۆر هەستی بە بێزاریی خۆی کرد؛ وا هەستی دەکرد وەک ئەوەی کەسێک بەسەر کارێکی ناشایستە و ئابڕووبەرەوە گرتبێتی، بۆیە تیا مابوو و سەری لە خۆی سووڕ مابوو.

"کەواتە هەر دەبێت هۆکارێک هەبێت بۆ ئەم تووڕەیییە زۆرەم... خۆ ناکرێت هەر لەخۆمەوە و بێ هیچ هۆکارێک، یاخود بە هۆی بیرەوەرییەکی قۆڕ و بێماناوە، ئا بەم شێوەیە تووشی هەڵچوون و تووڕەییەکی بێئەندازە ببم..."

بیرکردنەوەکەی بەتەواونەکراوی واز لێ هێنا.

ڕۆژی دواتر، لە جاران زیاتر هەستی بە تووڕەیی دەکرد،

بەڵام ئەم جارە پێی وا بوو بەڵگەی بۆ تووڕەبوونەکەی هەیە و بەتەواوی بە مافی خۆی دەزانی، کە ئا بەو شێوە نائاساییە تووڕە ببێت، ئاخر لۆژیکی نەبوو بۆ جاری چوارەم هەمان کەس ببینێتەوە، هەرگیز ئەمە ڕێی تێ نەدەچوو، کە ڕێکەوت بێت! "ئەمە چ بێ شەرمیی و چاوقاییمییەکە!"

ئەو پیاوە بەڕێزەی شریتە ڕەشەکەی بە کڵاوەکەیەوە بەستبوو، سەرلەنوێ ڕوخساری دەر کەوتەوە، وەک ئەوەی زووزوو لەژێر زەوییەوە هەڵبتۆقێت و بێتە سەر زەوی و ڕێک لەو شوێنەشدا قوت ببێتەوە، کە ڤێلچانینۆڤی لێیە. ڤێلچانینۆڤ ڕێک لەو کاتەدا کە لەسەر شەقامەکە کابرای پارێزەر و ڕاوێژکارە شارستانییەکەی بە قسە بەگیر هێنابوو، ئەو ڕاوێژکارەی پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، ئەو پیاوەی زۆر پێویستی پێی بوو و نیازی بوو بێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت، بۆ دیداری بچێت بۆ ڤێللا هاوینەکەی، لە ڕاستیدا ڤێلچانینۆڤ ئەم پیاوەی زۆر بەکەمی دەناسی، بەڵام هەرچۆنێک بێت، بۆ سەرکەوتنی لە کارەکانیدا، زۆر پێویستی بەم ڕاوێژکارە هەبوو. هەرچەندە ئەم پیاوەش دەیزانی ڤێلچانینۆڤ ئیشی پێیەتی، بۆیە هەمیشە خۆی لە بینینی ئەدزییەوە، بەڵام دواجار لووتی تەقی بە لووتی ڤێلچانینۆڤەوە و ئەم جارە ڕێگەی خۆدزینەوەی نەبوو لە دەستی ڤێلچانینۆڤ. ڤێلچانینۆڤیش زۆر دڵخۆش بوو کە دواجار توانیی بیبینێت و ببێت بە هاوڕێگەی و لەسەر شەقامەکە شان بە شان بەخێرایی لەگەڵیدا کەوتە هەنگاونان. چاوەکانی بڕییە ڕوخساری و بەهەموو توانای خۆی هەوڵی ئەوەی دەدا، هەرچۆنێک بووە سەرنج و بیری

ئەو پیرەپیاوە بخاتە کار و بە هەرشێوەیەک بێت، سەری ئەو بابەتەی لەگەڵدا بکاتەوە، کە زۆر لەمێژ بوو مەبەستی بوو. بەڵام پیرەپیاویش مرۆڤێکی هێندە کەم نەبوو، مرۆیەکی زۆر زیرەک و هۆشیار بوو، بەئاسانی نەدەتوانرا قسەی لێ دەر بهێنرێت؛ ڤێلچانینۆڤ هەرچییەکی دەگوت و لە زار دەر دەهات، ئەم تەنها بەبێدەنگی بزەیەکی بۆ قسەکانی دەکرد، ڕێک لەو کاتەدا بوو کە خەریکی قسەکردن بوو بۆ پیرەپیاوی ڕاوێژکار سەبارەت بەو بابەتەی مەبەستی بوو، ڤێلچانینۆڤ لە شۆستەکەی بەرامبەری لەناکاو چاوی کەوتەوە بەو کابرایەی شریتی ڕەشی بەستبوو بە کڵاوەکەیەوە، لەوبەریانەوە وەستابوو، بەووردی چاوی بڕیبووە هەردووکیان - زۆر ئاشکرا و بەڵگەنەویست بوو، کە چاودێریی دەکردن و نەک هەر چاودێریی دەکردن، بگرە وا دەر دەکەوت گاڵتەشیان پێ بکات. ڤێلچانینۆڤ لە کاتێکدا خوداحافیزیی لە ڕاوێژکارە شارستانییەکە کردبوو و بەخێرایی ئەوی بەجێ هێشتبوو، هەروەها ئەگەری سەرنەکەوتنی گفتوگۆکەی لەگەڵ ڕاوێژکاری بەتەمەن لە چاوی ئەو کابرا ناکەسبەچەیە دەزانی، کە لە بەردەمیا وەک مڵۆزم قوت بووبۆوە، بەوپەڕی تووڕەیییەوە هاواری لێ بەرز بۆیەوە، "بە نەفرەت بێت! بەنەفرەت بێت! سیخوڕیم بەسەرەوە دەکات؟ ڕوون و ئاشکرایە، کە جووڵەکانمی خستۆتە ژێر چاوەدێرییەوە. دڵنیام یەکێک بەکرێی گرتووە، تا سیخوڕیم بەسەرەوە بکات... یان ڕەنگە، یان... یان، پەنا ئەگرم بە خوا! چەند بێ شەرمە خۆ بە ڕابواردنەوە پێم پێ دەکەنێت! سوێند بەخوا ئەڵێی بڕۆم هەرچی پەراسوو

لە جەستەیدایە، وردوخاشی بکەم بۆی... بەڵام حەیف کە گالۆکێکم پێ نییە، بۆ ئەوەی دارکارییەکی باشم بکردایە و چیی تر زاتی ئەوەی نەکردایە خۆی لە بەردەمما دەر بخستایەتەوە! ئەبێت دانەیەک بکرم! نایەڵم ئەم ناکەسبەچەیە هەر وا بەئاسانی لە دەستم قوتاری ببێت. نازانم ئەم خوێڕییە خۆی بە چی دەزانێت؟ هەر دەبێت بزانم کێیە."

بەم شێوەیە، دوای تێپەڕبوونی سێ ڕۆژ بەسەر چوارەمین چاوپێکەوتندا، سەرلەنوێ ڤێلچانینۆڤ لەو چێشتخانەیەدا دەر کەوتەوە، هەر بەو شێوەیەی پێشتر لەو چێشتخانەیە دواین، بەتەواوی شڵەژاو، تەنانەت بە شێوەیەک لە شێوەکان پەکیشی کەوتبوو. تەنانەت خۆشی نەیدەتوانی بەئاسانی بەمە قاییل ببێت، سەرەڕای لووتبەرزی و خۆبەزلزانییەکەی، دواجار و بەناچاری ئەوەی پەسەند کرد، کە هەموو ئەو بارودۆخە ناهەموارەی یەک لەدوای یەک تووشی بووە، هەموو ئەو شتانەی ببوونە هۆی نیگەرانی و سەرقاڵکردنی مێشکی و هەموو ئەو شتانەی ببووە هۆکاری تووڕەبوون و جاڕزبوونی، هەموو ئەو ئازار و ناڕەحەتی و دەرد و خەمەش کە لە ماوەی ئەم دوو هەفتەیەی کۆتاییدا بەسەری هاتبوو - "سەرەڕای ئەوەی ئەمە بیروباوەڕێکی پووچ و بێبنەما بوو" کەچی پێی وا بوو هۆکارەکەی لەو کابرا بەڕێزەی نیشانەی پرسەداریی پێوە بوو، هیچ کەسێک و هیچ هۆکارێکی تر نەبووە، جگە لەو.

بەم شێوەیە، ڤێلچانینۆڤ لەگەڵ خۆیدا کەوتە ئاخاوتن، "ڕاستە من مرۆڤێکی ماخولیاییم ئامادەم چیایەک بکەم بە تەپۆڵکەیەک، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمەش، ئایا بۆ من

دژوار نییە، کە هەموو ئەمانە تەنها بە خەیاڵێکی پووچ بزانم؟ جا ئەگەر هەر ڕێبوارێک بەلاتا تێپەڕ ببێت و بە یەک ڕوانین ئا بەم شێوەیە تووشی ئاڵۆزیی بیر و شڵەژانی دەروونیت بکات، بۆچی... کەواتە... ئەمە... بۆچی؟..."

هەر بەڕاستی، بینینی هەمان کەس بۆ ڕۆژی "پێنجەم،" کە بەتەواوی ڤێلچانینۆڤی تووشی شڵەژان کرد، سەلمێنرا شاخەکە لە تەپۆڵکەیەکیش بچووکترە: کابرا، وەک هەموو جارێک، لە ڕێگە هەمیشەییەکەی خۆیەوە بەخێرایی گوزەری کردبوو بەلایدا، بەڵام ئەم جارە بەبێ ئەوەی لە ڤێلچانینۆڤ بڕوانێت، بەبێ ئەوەی وەک جارەکانی پێشوو وا خۆی نیشان بدات، کە دەیناسێت، بەڵکوو بە پێچەوانەشەوە، سەری خۆی داخستبوو، وا دەر دەکەوت گەلێک نیگەران بێت و لە هەوڵی ئەوەدا بوو، خۆی دەرباز بکات و نەبێتە جێگەی سەرنجی هیچ کەسێک. ڤێلچانینۆڤ بەخێرایی ئاوڕی دایەوە و بە هەموو توانای خۆیەوە هاواری لێ کرد، "هێی، تۆ! ئەی ئەو کەسەی شریتێکی ڕەشت بە کڵاوەکەتەوە بەستووە! ئێستا هەوڵی ئەوە دەدەیت خۆت بشاریتەوە! ڕاوەستە، بزانم! تۆ کێیت؟"

ئەم پرسیارە و "هەموو ئەو هاتوهاوارەی نابوویەوە،" لە ڕاستیدا زۆر بێمانا و دوور لە ئەتەکێتی ئەو بوو. بەڵام ڤێلچانینۆڤ دوای تەواوبوونی هاتوهاوارەکەی، ئەم نابەجێییەیی خۆی بۆ دەر کەوت. کابرا بەڕێزەکە هەر کە گوێبیستی هاوارەکە بوو، لە شوێنی خۆی وەستا و ئاوڕی بۆ شوێنی هاوارکردنەکە دایەوە، بۆ خولەکێک بەشڵەژاوی لە شوێنی خۆی وشک بوو، زەردەخەنەیەکی مردووی خستە

سەر لێوەکانی و لەوەدا بوو بڕیاری ئەوە بدات، کە شتێک بکات یان شتێک بڵێت، بەڵام زۆر بەڕوونی دیار بوو لە بڕیارەکەی خۆی پاشگەز بۆتەوە. دواتر و لەپڕدا، پێچێکی پیا هێنا و تێی تەقاند، بە شێوەیەک، تەنانەت ئاوڕی بۆ دوای خۆشی نەدایەوە. ڤێلچانینۆڤ بەوپەڕی سەرسامییەوە لە کابرای دەڕوانی، کە چۆن تێی تەقاند و بۆی دەر چوو.

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "باشە، هەر بەڕاست کێ ناڵێت من بەهەڵە لێکدانەوەم بۆ شتەکان نەکردووە! من پێم وایە ئەو کەسە بەشوێن منەوەیە و تەنگەتاوی کردووم! ئەی ئەگەر هەر بەڕاستی ئەم شتە پێچەوانە بێت و ئەوە من بم کە شوێن ئەو کەسە کەوتووم و تەنگم پێ هەڵچنیوە، نەک ئەو؟ ڕەنگە هەر بەڕاستی ئەمە ڕاستیی بابەتەکە بێت."

هەر کە لە خواردنی نانی ئێوارە تەواو بوو، خێرا گالیسکەیەکی گرت و بەرەو ڤێللا هاوینەکەی پیرەپیاوی ڕاوێژکار بەڕێ کەوت، بەو هیوایەی لەوێ چاوی پێی بکەوێت، بەڵام نەیتوانی چاوی پێی بکەوێت چونکە لە ماڵ نەبوو. پێیان ڕاگەیاند، کە "بەڕێزیان ئەمڕۆ نەگەڕاوەنەتەوە، پێشناچێت بگەڕێنەوە تا کاتژمێر سێ یان چواری سەرلەبەیانی، لەبەر ئەوەی چووە بۆ شار بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی لەدایکبوونی یەکێک لە ناسیاوەکانی،" ڤێلچانینۆڤ کە ئەمەی بیست، هەستی بە "سووکایەتی"یەکی بێئەندازە کرد، هەر بۆیە لە یەکەم کاردانەوەی تووڕەبوونەکەیدا، بڕیاری دا خۆشی بچێت بۆ ئاهەنگی لەدایکبوونەکە و بەشدار بێت لەو ئاهەنگە. تەنانەت لەوەدا بوو بەرەو ئەو شوێنە بەڕێ بکەوێت، بەڵام لە نیوەی ڕێگە لەوە تێگەیشت، کە ئەو

شوێنە ڕێیەکی دووورودرێژە و لە کارەکانی دوای دەخات. هەر بۆیە لە نیوەی ڕێ، لە گالیسکەکە دابەزی و بەخاوی و بە پێیان بەرەو ماڵەکەی خۆی، کە لە نزیک هۆڵی شانۆی گەورە بوو، بەڕێ کەوت. هەستی کرد بەڕاستی پێویستی بە هەندێک ڕێرۆشتن هەندێک ڕاهێنانی جەستەیی هەیە. لەبەر ئارامکردنەوەی مێشکی و ئەم بێخەوییەی کە تووشی بووە، پێویستە بە هەرنرخێک بووە، ئەمشەو خەوێکی باش بخەوێت، بۆ ئەم کارەش، بەڕاستی پێویستی بەوە بوو، کە بەتەواوی خۆی شەکەت و ماندوو بکات. بەم جۆرە بوو، دەوروبەری کاتژمێر دوو و نیو گەیشتەوە ماڵەوە. لەبەر دووورودرێژیی ئەو ڕێگەیەی بە پێ بڕیبووی، هەر بەڕاستی شەکەت و ماندوو بووبوو، دووریی ڕێگەکە بۆ ماڵەوە، لە پێی خستبوو.

بەم شێوەیە ئەو باڵاخانەیەی مانگی پێشوو، مانگی مارچ بەکرێی گرتبوو و هەمیشە گلەیی و گازندەی لە دەستی دەکرد و ڕەخنەبارانی دەکرد، هەمیشە بەوە پۆزشی بۆ خۆی دەهێنایەوە کە لە بیری خۆیدا دەیوت، "تەنها بۆ ماوەیەکی کاتی لێرە دەوارم هەڵداوە، مانەوەشم لە پترسبۆرگ لە ڕاستیدا بە خواستی خۆم نییە و بە هۆی ئەم "دۆسیە نەفرەتی"یەوە لێرە ماومەتەوە."

خۆی لە ڕاستیدا باڵاخانەکە بەو شێوەیەش نەبوو، کە ئەو هەمیشە گلەیی و گازندەی هەبوو لێی، ڕاستە قاتی ئەرزیی باڵاخانەکەی تاریک و تا ڕادەیەک پیسوپۆخڵ بوو، بەڵام نهۆمی دووەمی باڵاخانەکە، کە لە دوو ژووری گەورە و فراوان و بەرز و ڕووناک پێک هاتبوو، ئەم دوو ژوورە

گەورەیەش بە ژوورێکی بچووک و کەمێک تاریک لە یەک جیا کرابۆوە. یەکێک لە دوو ژوورەکە بەسەر شەقامەکەیدا دەیڕوانی و ئەوی تریشیان بەسەر حەوشەکەیدا دەڕوانی. ئەو ژوورە بچووکەشی کە بەپەنای ئەو ژوورەوە بوو کە بەسەر حەوشەکەیدا دەیڕوانی، لەڕاستیدا وا نەخشە کێشرابوو، کە ژووری خەوتن بێت، بەڵام ڤیلچانینۆڤ پڕی کردبوو لە کاغەز و کتێب و هەمووی پەرشوبڵاو کردبوو بەسەر یەکدا. هەر لەبەر ئەمە، لە یەکێک لەو دوو ژوورە گەورەیەدا دەخەوت، لەو ژوورەیاندا کە بەسەر شەقامەکەدا دەیڕوانی. یەکێک لە چەرپاکانیشی کردبوو بە تەختەخەو بۆ خۆی.

لەگەڵ ئەوەی کەلوپەلی ناوماڵەکەی دەستی دوویش بوو، بەڵام زۆر گونجاو دەر دەکەوتن. هەروەها چەند شتێکی تری بەنرخ و ئەنتیکە، کە هیی سەردەمانێکی زۆر کۆن بوون، لە ماڵەکەیدا بەرچاو دەکەوتن، لەوانەش، دەفری فەخفووریی چینی و دەفری بڕۆنزی لەگەڵ مافووری گەورە و گرانبەهای وڵاتی بوخارا، تەنانەت دوو تابلۆی زۆر نایابیش بەرچاو دەکەوتن، بەڵام لەو کاتەوەی پێلاجیا، خزمەتکارەکەی بۆ پشووەرگرتن گەڕابووەوە بۆ ماڵەوە، لە نۆڤگۆرۆد و ئەمی بەتەنیا لێرە جێ هێشتبوو، هەرچیی شتەکانی ناو ئەو ماڵەیە، لە تەپوتۆز و خۆڵدا نوقم ببوون، هەرچیی شتە ترنجابوو بەسەر یەکدیدا، هیچ شتێک لە شوێنی خۆیدا نەبوو.

شتێکی نامۆ بوو، کە کچێکی ئاوا لاو، بەتەنیا لەلای پیاوێکی زگورتی خزمەتکار بێت، ئەویش چ پیاوێک! پیاوێک، سەر بە جیهانی خانەدانەکان، کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان

چۆن وەک پیاوێکی بەهێز و کردەنی خۆیان نیشان بدەن. هەرچەندە ڤێلچانینۆڤ زۆر لە پێلاجیا ڕازی بوو، بەلام ئەم بابەتە بەتەواوی ئەوی شەرمەزار کردبوو.

پێلاجیا، سەرەتای بەهار بوو، ڕێک لەو ڕۆژەدا کە ڤێلچانینۆڤ بالاخانەکە بەکرێ دەگرێت لەو خێزانەی پێشتر لەو بالاخانەیەدا بوون و پێلاجیاش کاری بۆ دەکردن و ڤێلچانینۆڤیش بەباشی ئەو خێزانەی دەناسی، هاتبووە لای بۆ ئیشکردن. هەڵبەت ئەو خێزانە بەرەو دەرەوەی وڵات گەشتیان کردبوو و پێلاجیاش هەر یەکسەر لە ماڵە نوێیەکەی ڤێلچانینۆڤ دەستبەکار دەبێت و ماڵەکەی بۆ ڕێکوپێک دەکات، لەمەشەوە ڤێلچانینۆڤ لاریی نەبووە لە مانەوەی ئەو کچە لاوە لە ماڵەکەی بۆ خزمەتکردنی.

بەلام دوای ڕۆیشتنی پێلاجیای خزمەتکاری، ڤێلچانینۆڤ نەیتوانیبوو بڕیاری ئەوە بدات، کە خزمەتکارێکی تری ئافرەت بە کرێ بگرێت. دامەزراندنی خزمەتکارێکی پیاویش بۆ ماوەیەکی هێندە کورت، زۆر گرنگ نەبوو بەلایەوە، لە ڕاستیدا هەر حەزی بە چارەی خزمەتکاری پیاو نەدەکرد. لەگەڵ خوشکی دەرگاوانی بالاخانەکە ڕێک کەوتبوو، کە هەموو بەیانییەک بێت و بالاخانەکەی بۆ خاوێن بکاتەوە، هەر کاتێکیش کە ڤێلچانینۆڤ لە ماڵ چووە دەرەوە، کلیلەکان لەلای ئەو بەجێ بهێڵێت. سەرەڕای ئەوەی ڤێلچانینۆڤ گومانی لەوە نەبوو ئەو ئافرەتە هیچ ئیشێک ناکات و دەست لە هیچ شتێکەوە نادات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر کرێی ڕۆژانەی خۆی پێ دەدا. گومانی ئەوەشی لێ کردبوو، کە نەک هەر ئیشیش ناکات، بگرە جاروبار دزییشی لێ دەکات.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو دزێوییەشی، کەچی شانێکی هەڵدەتەکاند و زۆر دڵخۆش دەبوو بەوەی بەتەواوی تەنیایە لە ماڵەکەی خۆیدا. بەڵام هەموو شتێکیش سنوورێکی هەیە؛ هەندێک جار کە دەگەیشت بە تینی، چیی تر نەیدەتوانی بەر بە تووڕەبوونی خۆی بگرێت. مێشکی نەیدەتوانی ئارامگر بێت لەسەر ئەم هەموو "پیسوپۆخڵی"یە، زۆر جار کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بە قێزوبێزەوە خۆی دەکرد بە ژوورەکەیدا.

بەڵام ئەم جارە، زۆر بەسەختی توانیی کاتی ئەوە بدات بە خۆی، تا جلەکانی لەبەر خۆی دابکەنێت و خۆی فڕێ بداتە ناو جێگەی خەوەکەی، بەوپەڕی تووڕەییەوە بڕیاری دا خەیاڵی بۆ هیچ شتێک و هیچ شوێنێک نەچێت و بیر لە هیچ شتێک نەکاتەوە و بە هەرنرخێک بووە، ڕێک لەم "خولەکەدا" لە قووڵایی خەو ڕۆ بچێت. ئەوەی جێگەی سەرسامی بوو، هەر هێندە سەری کەوتە سەر بالیفەکە، بەخێرایی لە خەوێکی زۆر قووڵ ڕۆ چوو. نزیکی مانگێک دەبوو، کە بەم شێوەیە خەوی لێ نەکەوتبوو.

نزیکەی سێ کاتژمێرێک خەوت. بەڵام خەوتنێکی ئاسان نەبوو بۆی. خەونی زۆر ئاڵۆز و سەیری دەبینی، هەر وەک ئەو خەونانەی مرۆڤ لە کاتی لەرزوتادا دەیانبینێت. خەوی بە هەندێک تاوانەوە دەبینی، کە لە خەونەکەیدا تۆمەتبار دەکرا بەوەی ئەو، ئەو تاوانانەی ئەنجام داوە و شاردوونیەتەوە و چەند کەسێک لەوێ بوون کە دیار نەبوو لەکوێوە، یەک بەدوای یەک خۆیان بە ماڵەکەیدا دەکرد و هەموویان بەیەکەوە پەنجەی تۆمەتیان ئاڕاستە دەکرد.

بە شێوەیەکی تۆقێنەر، هەر خەڵک بوو خۆی دەکرد بە ماڵەکەیدا و لەدەوری کۆ دەبوونەوە، هەر خەڵک بوو دەهات و لە هاتنیان ڕانەدەوەستان. چیی تر دەرگاکە دانەدەخرا و بەتەواوی دەرگاکە لەسەر پشت بوو. بەڵام سەرەڕای ئامادەبوونی هەموو ئەو خەڵکە زۆرە لە ماڵەکەیدا، تەواوی سەرنجی چووبووە سەر کەسێکی نامۆ، کە پێشتر زۆر لێیەوە نزیک بووە و زۆر بەباشییش دەیناسی، لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسە گیانی سپاردبوو، بەڵام ئێستا بە شێوەیەکی لەناکاو، کە ڕوون نییە لەبەر چی، ئەویش هاتبوو بۆ بینینی.

ناخۆشترین شت بۆ ڤێلچانینۆف، کە زۆر نیگەرانی کردبوو، ئەوە بوو بیری نەدەکەوتەوە ئەم پیاوە کێیە؛ ناوەکەی لەبیر کردبوو هەرچەند تێدەکۆشا و فشاری دەخستە سەر مێشکی بۆ بەیادهێنانەوەی ناوەکەی، بێسوود بوو. بەڵام دەیزانی پێشتر ئەو کەسەی زۆر خۆش ویستووە. وا دیار بوو هەموو ئەو خەلکەی لە ماڵەکەی ڤێلچانینۆف ئامادە بوون، چاوەڕوانی قسە و دوابڕیاری ئەم کەسە بن، ئەویش بڕیاری ئەوەی کە ئایا ڤێلچانینۆف تاوانبارە یان بێتاوانە، هەمووان بەبێئۆقرەیی چاوەڕوان بوون. بەڵام ئەو پیاوە لەسەر مێزەکە، بەبێ جووڵە، دانیشتبوو. هیچی نەدەوت و خۆشی لە قسەکردن دەبوارد.

هەراوزەنا و غەڵبەغەڵب، بۆ ساتێکیش چییە، نەدەبڕایەوە، هەتا بهاتایە، دەنگەدەنگ زیادی دەکرد. لەناکاو و زۆر بەخێرایی ڤێلچانینۆف بە شێوەیەکی شێتانە و لە ڕادەبەدەر تووڕەیی، یەک دانەی، بە هەرچی هێزی خۆی هەیە، سرەواندە ئەو کابرایەی سوور بوو لەسەر بێدەنگییەکەی،

هەستیشی کرد چێژێکی سەیر لە کردنی ئەم کارەدا هەبوو. دڵی مووچڕکەیەکی نائاساییی پێدا هات و تووشی تۆقین و پەژارەیەکی زۆر بوو لەو کارەی ئەنجامی دا، بەڵام خۆشییەکی نائاساییش هەبوو لەو مووچڕکەیەدا، هەر بەو هۆیەوە ئاگای لە خۆی نەماو، بۆ جاری دووەمیش زرم، یەک دانەی تریشی تێ سرەواند و پاشان سێیەمیش بەدوایدا، بە شێوەیەک، کە وەک سەرخۆشی لێ هاتبێت و ئاگای لە دونیا نەبێت، تووڕەوتڕۆ، بە شێوەیەکی شێتانە، کە سەر ڕێژ بوو لە چێژبینین، ژمارەی ئەو لێدانانەی لێ تێک چوو و بەبێ وەستان کەوتە سەروگوێلاکی کابرا. ئەیویست هەرچی شتە، وێرانی بکات، هەمووی لەناو ببات. بەڵام کتوپڕ شتێک ڕووی دا! سەرجەم ئەو خەڵکەی لە ماڵەکەیدا کۆ بووبوونەوە، بە شێوەیەکی زۆر تۆقێنەرانە هاواریان لێ بەرز بۆوە و بەرەو ئاراستەی دەرگاکە وەر چەرخان. وەک ئەوەی چاوەڕوانی ڕوودانی شتێک بووبێتن کە لەناکاو ڕوو بدات. ڕێک لەو ساتدا بوو، سێ جار لەسەر یەک دەنگی زەنگی دەرگاکە بەرگوێ کەوت. دەنگی زەنگەکە هێندە بەهێز و تۆقێنەر بوو، وەک ئەوەی زەنگەکە لە شوێنی خۆی هەڵبکەنن. ڤێلچانینۆڤ خەبەری بۆوە و خێرا هۆش خۆی هاتەوە و بەوپەڕی تووڕەییەوە لەسەر جێگەکەی، خۆی هەڵدایە خوارەوە و بەپڕتاو بەرەو دەرگاکە ڕای کرد؛ زۆر لەوە دڵنیا بوو، کە لێدانی زەنگەکە لە خەونەکەیدا نەبووە و ئەبێت هەر بەڕاستی کەسێک، ڕێک لەو کاتەدا، لە زەنگەکەی دابێت. "شتێکی سروشتی نییە، کە دەنگێک بەم ڕوونی و ئاشکراییە خەون بێت!"

بەڵام بەوپەڕی سەرسامییەوە بۆی دەر کەوت، کە هەر بەڕاستی ئەو دەنگی زەنگەی گوێبیستی ببوو، هەر لە خەونەکەیدا بووە و بەشێک بووە لە درێژەی خەونەکەی. دەرگاکەی کردەوە و بە پلیکانەکاندا ڕۆیشتە خوارەوە، تەنانەت سەیری ژێر پلیکانەکانیشی کرد، هەر بۆ دڵنیاییی زیاتری خۆی، بەڵام بەدڵنیاییییەوە هیچ کەسێکی لێ نەبوو. زەنگەکەش بێ جووڵە، لە شوێنەکەی خۆی بێدەنگ بوو. سەری لەمە سووڕ ما، بەڵام هەناسەیەکی ئاسوودەییی هەڵکێشا و بۆ ژوورەکەی گەڕایەوە. لەو کاتەدا کە مۆمەکەی دادەگیرساند، بیری کەوتەوە دەرگاکەی بە کلیل دانەخستووە، تەنها پێوەی داوە. ئەویش زۆر بەباشی پێوەی نەداوە. لە ڕابردووشدا هەندێک جار کە بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، لەبیری دەچوو شەوان دەرگاکە کڵۆم بدات و زۆریش بەلایەوە گرنگ نەبوو، کە دەرگا کڵۆم بێت یان نا.

چەندین جار پێلاجیا لەسەر ئەم کارەی سەرکۆنەی کردبوو. گەڕایەوە بۆ ڕاڕەوەکە، تا دەرگاکە کڵۆم بکات، جارێکی تر دەرگاکەی کردەوە و بەکونجکاوی تەماشایەکی دەرەوەی کردەوە، پاشان سەری هێنایەوە ناوەوە، بەڵام دەرگاکەی تەنیا بە هۆی قولاپێکەوە، کە لە دیوی ناوەوە بە دەرگاکەوە بوو، دەرگاکەی پێ توند کرد. ئەزیەتی ئەوەی نەدایە بەرخۆی، کە دەرگاکە کلیل بدات! کاتژمێری سەر دیوارەکە زەنگی دوو و نیوی لێدا. کەواتە ئەو تەنها سێ کاتژمێرێک خەوتبوو.

ئەو خەونە بە شێوەیەک پەشۆکاندبووی، کە نەیدەویست یەکسەر بچێتەوە ناو جێگەکەی و بخەوێتەوە. بڕیاری دا بۆ

ماوەی نیو کاتژمێرێک "ئەم کاتە کەمە، کە بەسە بۆ کێشانی جگەرەیەک." لە ژوورەکەیدا سەر و خوار بکات، تا تۆزێک مێشکی هێور بکاتەوە. بەخێرایی خۆی گۆڕی، لەپەنجەرەکە نزیک بووەوە، پەردە تەنکەکەی هەڵدایەوە، پاشان پەردە سپییەکەی ژێر ئەو پەردەیەشی لا دا لە ڕووی پەنجەرەکە. دنیا ڕووناک ببووەوە.

شەوە ڕووناکەکانی هاوینی پترسبۆرگ، هەمیشە کاری دەکردە سەر دەمارەکانی، ئەم چەند ڕۆژەی دواییش، بێخەوییەکەی تەواو توندتر کردبۆوە. هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو، کە دوو هەفتەی پێشوو، ئەم پەردە دووبەرە ئەستوورەی کڕیبوو، کە کاتێک ڕات دەکێشان، زۆر بەباشی ڕێگرییان لە هاتنەناوەوەی ڕووناکی دەکرد، هەر بۆیە ئەم پەردانەی بە پەنجەرەکانیدا هەڵواسیبوو.

لە کاتێکدا ڕووناکی ئەهاتە ناو ژوورەکەوە و بیری چووبوو مۆمی سەر مێزەکە بکوژێنێتەوە، بە هەستێکی ناخۆش و پڕ لە ئازارەوە لە ژوورەکەیدا هەر خەریکی هاتوچۆ و سەروخوارکردن بوو. ئاخر هێشتا شوێنەوار و کاریگەریی خەونەکەی لەسەر لا نەچووبوو. هەر کە بیری لەوە دەکردەوە چۆن لە خەونەکەیدا دەستی تێی چووە و دەستی لەو پیاوە بەرز کردۆتەوەو لێی داوە، زۆر بەسەختی ویژدانی ئازار دەدا.

"نەخێر، ئەو پیاوە بوونی نییە، ڕەنگە لە ڕاستیدا هەرگیز هەر بوونیشی نەبووبێت؛ ئەمە هەمووی لە خەونێک زیاتر، هیچی دی نییە. باشە، کەواتە ئەگەر خەونە، بۆچی ئەبێت بەم شێوەیە خۆم نیگەران بکەم سەبارەت بە شتێک، کە بوونی نییە؟"

زۆر تووڕە بوو، دەتگوت هەرچیی غەم و پەژارەکانیەتی، تەنها لەم خەونەدا چڕ بۆتەوە، پاش ئەوەی لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا ڕۆ چوو، گەیشت بەو ئەنجامەی بێ هیچ گومانێک، خەریکە نەخۆش دەکەوێت - مرۆڤێکی نەخۆش.

هەمیشە بیرکردنەوە لەو ڕاستییەی کە خەریکە پیر دەبێت و چیی تر هێز و تواناکەی جارانی نەماوە، زۆر ئازاری دەدا! بەڵام لە ڕاستیدا زۆر جار کە ڕووبەڕووی ئازارێک ببووایەتەوە، ئەوە هەر بەمەبەست ئازارەکەی زیاد لە قەبارەی خۆی، لەسەر خۆی گەورە دەکرد و زۆری پێوە دەنا، بەم کارەشی، دەیویست زیاتر سزای دەروونیی خۆی بدات.

لەژێر لێوەوە بەبۆڵەبۆڵ وتی، "پیریتی! خەریکە بەتەواوی پیر دەبم، بیرکردنەوەم هێندە لاواز بووە، وەختە لەدەستی بدەم، تارمایی کەسانی نامۆ دەبینم، کابووسی تۆقێنەر دەبینم، زەنگەکان هەر لەخۆیانەوە لێدەدەن... نەفرەت لە هەموویان، بە ئەزموون بۆم دەر کەوتووە، کە تەواوی ئەم خەونە ناخۆشانە، هەمیشە نیشانەی تالێهاتنمە... تەنانەت ئەو کابرایەشی کە شریتە ڕەشەکەی بە کڵاوەکەیەوە بەستووە، ئەویش لە تارمایی خەونێک زیاتر، هیچی دی نییە. من تەواو لەوە دڵنیام، کە دوێنێ من بەهەڵەدا نەچووبووم، کە لە ڕاستیدا ئەوە من بووم، ئەوە من بووم کە شوێن ئەو پیاوە کەوتبووم، نەک ئەو شوێنی من کەوتبێت. کێشەکەی من لەوەدایە، سەرەتا هەڵدەستم بە دروستکردنی چیرۆکێکی خەیاڵی لەسەر کەسایەتیی ئەو، پاشان هەر خۆشم لە ترسی ئەو چیرۆکەی لە خەیاڵدانی خۆمدا بۆ ئەو کەسەم

دروست کردووە، وەک ترسنۆکێک لەژێر مێزەکەدا خۆم دەشارمەوە. یان بۆچی هەر لەخۆمەوە بە "ڕسوا" بانگی دەکەم؟ کێ نالێت کەسێکی زۆر میهرەبان و بەڕێزیش نییە! بەدڵنیاییەوە ڕوخساری سەرنجڕاکێش نییە، لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ شتێکی تایبەت و ناشرینیشی تێدا بەدی ناکەم؛ ئەویش هەر وەک تەواوی ئەو خەڵکە ئاساییە پۆشاکی پۆشیوە. تەنها ئەوە نەبێت، شتێک لە چاوەکانیدا هەیە و من ناتوانم... ئاه، دیسانەوە هاتمەوە سەر بەزمەکەی پێشووم! دیسانەوە سەبارەت بەو بیر دەکەمەوە! چار بە جەهەننەم، کەچی لە چاوە نەفرەتییەکانیدایە، ئەوە کەی کێشەی منە؟ باشە من ناتوانم بێ ئەوەی بیر لەم کەسە بکەمەوە، درێژە بە ژیانی خۆم بدەم؟..."

لەنێوان هەموو ئەو بیرکردنەوانەی بە مێشکیدا گوزەری دەکرد، یەکێکیانی هەرگیز بیر نەدەچۆوە و زۆریش ئازاری دەدا؛ لەپڕ ئەوەی کەوتەوە بیر و زۆریش لێی دڵنیا بوو، کە ئەو پیاوە بەڕێزەی شریتە ڕەشەکەی بە کڵاوەکەیەوە بەستبوو، کاتی خۆی هاوڕێیەتییەکی زۆر بەهێزی لەگەڵیدا هەبووە، بەباشییش یەکترییان ناسیوە، بەڵام ئێستا کە ڤێلچانینۆڤ دەبینێت، زەردەخەنەیەکی تەوسئامێزی بۆ دەکات، لەبەر ئەوەی سەبارەت بە ئەو، هەندێک نهێنیی مەزن لە ژیانی ڕابردوویدا دەزانێت و ئەمڕۆ ئا بەم شێوەیە لەم بارودۆخە ڕسوایەدا دەیبینێت. بێ ویستی خۆی، لە پەنجەرەی ژوورەکە نزیک بۆوە، بۆ ئەوەی پەنجەرەکە بکاتەوە و هەوای بێگەردی شەو هەڵبمژێت، بەڵام... بەڵام لەناکاو تەواوی جەستەی لە ترسا کەوتە لەرزین؛ وا

دەر دەکەوت شتێکی زۆر سەیر و نائاسایی و لەناکاو لە بەرچاوەکانیدا ڕووی دابێت.

هێشتا پەنجەرەکەی بەتەواوی نەکردبۆوە، کە زۆر بەخێرایی لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە و خۆی خزاندە قوژبنێکی ژوورەکەوە، لە شۆستە چۆڵەکەی بەرامبەر بالاخانەکەی، لەپڕ ئەو کابرایەی بینی، کە شریتێکی ڕەشی بەستبوو بە کڵاوەکەیەوە، ئەو کابرایە ڕێک ڕووی کردبووە پەنجەرەی بالاخانەکەی و بەبێ جووڵە وەستابوو، تەماشای دەکرد. بەڵام ڕوون بوو کە ڤێلچانینۆڤی نەدەبینی، بەکونجکاوی بالاخانەکەی خستبووە ژێر چاودێرییەکی زۆر وردەوە، وەک ئەوەی نەخشە بۆ شتێک دابنێت. وا دەر دەکەوت بیر لە کردنی شتێک بکاتەوە و لە نزیکەوە بیەوێت هەڵسەنگاندن بۆ گونجاوی یان نەگونجاویی شوێنەکەی بکات، بەڵام وا دیار بوو بڕیاری بۆ نەدرێت. دەستی بەرز کردبۆوە بۆ ئاستی تەوێڵی و وەک ئەوەی شتێک بیری سەرقاڵ کردبێت، بە پەنجەی تەوێڵی خۆی دەخوراند. لە کۆتاییدا بڕیاری دا؛ بەوپەڕی خێرایی و توندییەوە ئاوڕێکی لە چواردەوری خۆی دایەوەو بەدزییەوەو لەسەر نووکی پێ بەناو شەقامەکەدا گوزەری کرد. بەڵێ، ڕێک بەم شێوەیە بوو. ئەو لە دەروازە بچووکەکەوە، "کە زۆر جار لە هاویناندا تا کاتژمێر سێی سەرلەبەیانی بەکراوەیی بەجێ دەهێڵرا" بۆی دەر چوو.

ڤێلچانینۆڤ یەکسەر بیری بۆ ئەم چوو: "بۆ لای من دێت!" بۆیە، بێ ئەوەی تاوێک درەنگ بکات، بەخشپەیی بەرەو لای دەرگاکە، بەناو دالانەکەدا ڕای کرد و بەبێدەنگی، وەک ئەوەی سڕ کرابێت، بەدووڵییەوە دەستی ڕاستی، کە

وەک شەقشەقە دەلەرزی لە ترسا، بەهێواشی خستە سەر کیلۆنی دەرگاکە، کە تۆزێک پێشتر کلۆمی دابوو. بەئارامی گوێی هەڵخستبوو، گوێی لە خشەخشی پێ بوو، کە بە پلیکانەکاندا سەر دەکەوت.

دڵی هێندە بەتوندی لێی ئەدا، کە لەوە دەترسا بە هۆی ئەو دەنگی لێدانە بەرزەی دڵیەوە، چیی تر گوێی لە دەنگی پێی کەسەکە نەبێت، کە وا خەریکە وردەوردە دێتە سەرەوە. نەیدەزانی ئەوەی ڕوو دەدات، هۆکارەکەی چییە، بەڵام دە هێندەی جاران هەستی بە هەموو شتەکان دەکرد، ئەو خەونەی بینیبووی، هەر بەڕاستی خەریک بوو وردەوردە لەگەڵ ڕاستیدا تێکەڵ دەبوو. ڤێلچانینۆڤ بە سروشتی خۆی کەسێکی ئازا بوو. زۆر جار هەر بۆ خۆهەڵکێشان، تا ئەوپەڕی نەترسان ڕووبەڕووی مەترسیگەلی زۆر ترسناک دەبووەوە، تەنانەت ئەگەر کەسیش چاوی لەم نەبەردییەی نەبووایە، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوە بوو، زۆر چێژی لە ئازایی و بوێریی خۆی دەبینی. بەڵام ئێستا شتەکە تەواو جیاوازە، دۆخەکە وەک پێشوو نییە. ئەو پیاوەی بەم دوادواییە گیرۆدەی مالاخولیا و بەدگومانی و ڕاڕایی ببوو، بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا هاتبوو؛ هەرگیز لەو پیاوە ئازا و بوێرەی یەکەم جاری نەدەکرد. پێکەنینێکی پڕ لە نیگەرانی و ناخهەژێنی لە سینەوە دەهاتە دەرەوە و لەپشتی دەرگا داخراوەکەوە، هەستی بە تەواوی جووڵەکان و نزیکبوونەوەی ئەو کەسە نامۆیە دەکرد.

"ئاها! ئێستا ئەو دێتە ناوەوە، ئەو خەریکە دەگات، خەریکە لە چواردەوری خۆی دەڕوانێت، بەهێواشی گوێ لە

پێپلیکانەکان دەگرێت، بۆ ئەوەی بزانێت کەس نایەتە خوارەوە! بەهێواشی هەناسە دەدات، بۆ ئەوەی کەس تەنانەت گوێی لە هەناسەکانیشی نەبێت و پێی نەزانن... وردەوردە خەریکە دێتە سەرەوە، بەهێواشی... ئاها خەریکە دەسکی کیلۆنەکە دەگرێت، ڕای دەکێشێت، بێ وچان هەوڵی لەگەڵ دەدات! هیوادارە دەرگاکە کلیل نەدرابێت! کەواتە دەزانێت هەندێ جار من لەبیرم دەچێت دەرگاکە کلیل بدەم! سەرلەنوێ دەسکی کیلۆنەکە ڕادەکێشێتەوە؛ تۆ بڵێیت وا گومان بکات کیلۆنەکە شکاوە؟ جێگەی داخە ئەگەر بەم شێوەیە لێرە بڕوات! ئایا هەر بەڕاستی جێگەی داخ نییە بهێڵم ئا بەم شێوەیە، بە دەستی بەتاڵ، بڕوات؟"

هەر بەڕاستی هەموو شت خەریک بوو بەو شێوەیە ڕووی دەدا، کە خۆی وێنای کردبوو. هەر بەڕاستی کەسێک بە بێدەنگی و هێمنی لە بەشەکەی تری دەرگاکەوە وەستابوو، هەوڵی لەگەڵ کیلۆنەکە دەدا و دەسکەکەی ڕادەکێشا "بەدڵنیاییەوە ئامانجێکی لەم کارەی هەبوو، کە دەیکرد" بەڵام ڤێلچانینۆڤ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، ئامادەکاری تەواوی کردبوو. بە جۆرە خۆشییەکی نائاساییەوە چاوەڕوانی وەها ساتێک بوو. خۆی ئامادە کرد، هەستێکی زۆر سەیری تێ گەڕابوو بۆ ئەوەی زۆر بەخێرایی کیلۆنەکە ڕابکێشێت و لەپڕ دەرگاکە بکاتەوە و یەکسەر خۆی لە بەردەم ئەم شەولەبانە کە ببووە سەرچاوەی ترس و مەراقی، قوت بکاتەوە و غافڵگیری بکات. بەڵێ، ڕێک بیری لە چی کردبووەوە، ئەنجامیشی دا، ڤێلچانینۆڤ ساتێکی تەواو گونجاوی هەڵبژارد، لەپڕ دەسکی کیلۆنەکەی داگرت و

بەخێرایی پاڵی نا بە دەرگاکەوە، هێندەی نەمابوو دەرگاکە بکێشێت بەو کابرایەی شریتە ڕەشەکەی بە کڵاوەکەیەوە بەستبوو و بیدات بە عەردەکەدا.

"لێرە چی دەکەی، ئەی پیاوی بەڕێز و لەخواترس؟"

# ٣

# پاڤێل پاڤلۆڤیچ ترووسۆتسکی

پیاوەکە لە شوێنی خۆیدا، بێ ئەوەی بچووکترین دەنگی لێوە بێت، وەک پەیکەرێکی بێگیان وشک ببوو. هەردووکیان بەپێوە، لەناو دەرگاکەدا، ڕووبەڕووی یەک چاویان بڕیبووە یەکتری. ساتێک بەم شێوەیە تێپەڕی. لەناکاو ڤێلچانینۆڤ میوانە ناوەختەکەی خۆی ناسییەوە.

لە هەمان کاتدا زۆر ڕوون بوو، کە میوانە ناوەختەکەش هەستی بەوە کردبوو، کە ڤێلچانینۆڤ ئەمی بەتەواوەتی ناسیوەتەوە. درەوشانەوەیەک لە چاوەکانیدا بەدی دەکرا، کە هەستەکەی پشتڕاست دەکردەوە. لەپڕ هەموو ڕوخساری لە زەردەخەنەیەکی شیریندا نوقم کرد.

بە دەنگێک، کە پڕ بوو لە هەستی شادمانی، هەرچەند لە ڕاستیدا شادیدەربڕین لە وەها کاتێکدا زۆر بێمانا دەهاتە پێشچاو، میوانی ناوەخت وتی، "ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، پێم وا بێت شانازیی ئەوەم پێبەخشراوە، کە لەگەڵ بەڕێز ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ گفتوگۆ بکەم؟"

ڤیلچانینۆڤ، کە تووشی شڵەژان ببوو، وتی، "بەدڵنیاییەوە ئەبێت تۆش پاڤێل پاڤلۆڤیچ تروسۆتسکی بیت؟"

"نۆ ساڵ بەر لە ئێستا، ئێمە ناسیاوی یەکتر بووین لە شاری "ت،" ئەگەریش ڕێم بدەن بەیادتان بهێنمەوە - من و تۆ دوو هاوڕێی گیانیبەگیانیی یەکتر بووین.

"بەڵێ... بەدڵنیاییەوە، بەڵام وەک دەبینن، ئێستا کاتژمێر سێی شەوە! هەروەها نزیکەی دە خولەکێک دەبێت بەرێزتان بەئەسپایی کێلۆنی دەرگای ماڵەکەمت بەگیر هێناوە و لە پەستا بای دەدەن، ئیتر نازانم بۆ ئەوە وا دەکەن تا بزانن دەرگای ماڵەکەم کلیل دراوە یاخود نا!"

میوانی ناوەخت، لە کاتێکدا کە هەستی بە تەریقبوونەوە دەکرد، لە هەمان کاتدا سەری سووڕ مابوو، دەستی بە گیرفانیدا کرد و کاتژمێرە گیرفانییەکەی خۆی دەر هێنا و لە کاتژمێرەکەی ڕوانی، هاواری کرد، "کاتژمێر سێیە! کەواتە کاتژمێر سێیە! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ بەڕاستی شەرمەزارم و داوای لێبووردنتان لێ دەکەم، ئەبووایە پێشتر لە کاتژمێرەکەم بڕوانییایە پێش ئەوەی بەم ناوەختە جاڕزتان بکەم و بێمە سەروەختتان. بەڕاستی خەجاڵەتم. کەواتە من ئێستا دەڕۆم هەوڵ دەدەم کاتێکی گونجاوتر سەرتان لێ بدەمەوە ڕۆژێک یان دووانی تر دێمەوە بۆ لاتان و بۆتان ڕوون دەکەمەوە، چونکە ئەمویست بابەتێکتان لەلا باس بکەم! بەڵام ئێستا..."

ڤیلچانینۆڤ کابرای لە قافا گرت، وتی، "نا، نا! ئەگەر هەر بەڕاستی ئەتانەوێت پەردە لەسەر ڕووی شتێکی گرنگ هەڵبماڵن، ئەوە تکاتان لێ دەکەم هەر ئێستا پێم بڵێن! تکا دەکەم ئا بەم شێوەیە لەپشت دەرگاکەوە ڕامەوەستن فەرموون تەشریفتان

بێننە ژوورەوە. گومانی تێدا نییە کە بەڕێزتان بەم نیوەشەوە کارێکی گرنگتان هەبووە و بۆیە هەست ئەکەم گرنگیی ئەم بابەتە لەخۆڕا و بەم درەنگوەختە ئێوەی نەهێناوەتە بەردەم ماڵەکەم، چونکە لەو باوەڕەدا نیم بەم درەنگوەختە خەوتان لە چاوی خۆشتان و منیش زڕاندبێت و تەنها بۆ ئەوە هاتبن بۆ ئێرە، تا کێلۆنی دەرگاکەم تاقی بکەنەوە...“

ڤێلچانینۆڤ هەستی بە دڵخۆشی دەکرد، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەستی بە دڵەڕاوکێ و شڵەژان دەکرد. هەستی کرد ناتوانێت بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بیرکردنەوەکانی کۆ بکاتەوە. بە جۆرێک لە جۆرەکانیش، هەستی بە شەرمەزاریی خۆی دەکرد، کە نە هیچ شتێکی نهێنی لەئارادا بوو، نە هیچ جۆرە مەترسییەکیش. هەموو ئەو خەیاڵانەی کردبووی، دەر کەوت کە هیچ نەبووە؛ هەموو ئەم خەیاڵانە بریتی بوو لە پەیکەری مرۆڤێکی گەمژە، بریتی بوو لەم پاڤێل پاڤلۆڤیچەی هەنووکە لە ماڵەکەیدایە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هێشتاش لەو بڕوایەدا نەبوو کە هەموو ئەم شتانە هێندە سادە بێت. هەستێکی زۆر نامۆی بۆ دروست بووبوو، وەک ئەوەی پێشبینیی ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکی لەناکاو و نەخوازراو بێتەوە. ڕێنماییی میوانە ناوەختەکەی کرد، تا لەسەر کورسییەکی دەسکدار دانیشێت، خۆشی بەوپەڕی بێئۆقرەییەوە لەسەر تەختەخەوەکەی دانیشت، هەمووی مەترێک لێوەی دوور نەبوو، خۆی بۆ پێشەوە چەماندبۆوە و دەستەکانی خستبووە سەر ئەژنۆکانی و بەجاڕزییەوە چاوەڕێ بوو کابرا بکەوێتە قسەکردن. کونجکاوانە لە میوانە ناوەختەکەی خۆی دەڕوانی و پێداچوونەوەی بە

ژیانی ڕابردووی خۆی لەگەڵ ئەم پیاوە دەکرد و وردەوردە شتەکانی بیر دەکەوتەوە. بەڵام، ئەوەی مایەی سەرسامی بوو، ئەوە بوو کە کابرای میوان تەواو لە بێدەنگیی خۆیدا نغرۆ ببوو، تەواو بێدەنگ و کپ، وا دەر دەکەوت لەیادی کردبێت بۆ ئەوە "فەرمووی هاتنەژوورەوەی" لێ کراوە، تا بەخێرایی چی لە هەگبەیدایە هەڵی بڕێژێت؛ بە پێچەوانەوە، زۆر بەتوندی چاویشی بڕیبووە چاوی ڤێلچانینۆڤ، وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بێت تا بەقسەی بکات. ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو، چونکە زۆر بەسادەیی، ئەو شەرمی دەکرد، لە سەرەتادا بە هیچ شێوەیەک هەستی بە ئاسوودەیی نەدەکرد، هاوشێوەی مشکێک وا بوو، کە بووبێت بە داوەوە.

بەڵام پێدەچوو کە چیی تر ڤێلچانینۆڤیش ئارامیی نەمابێت، بۆیە هاواری لێ بەرز بۆوە، "کەواتە پێم بڵێن، بزانم مەبەست لە هاتنتان بۆ ئێرە و بەم ناوەختە چییە! زۆر ڕوونە کە ئێوە نە خێون و نە تارماییی خەونێکی ناخۆش! بەدڵنیاییەوە و بە هیچ کلۆجێکیش ڕێی تێ ناچێت بەم درەنگوەختەی شەو هاتبن بۆ ئێرە، تا سەر بخەنە سەرم و ڕۆڵی خێو یان تارماییم بۆ بگێڕیت؟ پێم بڵێ پیاوی باش، چیتان هەیە تکایە، زوو پێم بڵێن!"

میوانەکە کەمێک جووڵا و زەردەخەنەیەکی کرد و بەوریاییەوە کەوتە ئاخاوتن، "ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، ئەوەی کە ئێوەی زۆر تووشی پەشۆکان و سەرسووڕمان کردووە، ئەوەیە کە بۆچی من بەم ناوەختە و لە بارودۆخێکی ئاوا تەمومژاویدا هاتوومەتە خزمەتتان... بەڵام ئێستاش کە ڕابردوومان و چۆنێتیی جیابوونەوەمان لە یەکتری بەبیری

خۆم دەهێنمەوە، بەڕاستی ئێستا زۆر بەلامەوە سەیرە... هەرچەندە، هەربەڕاستی، من هیچ مەبەستێکی وام نەبوو کە وەبیر خۆمی بهێنمەوە، ئەمەش تەنها بەڕێکەوت ڕووی دا..."

"چۆن بەڕێکەوت؟ بەڵام من لە پەنجەرەکەوە چاوم لێتان بوو کە لەسەر نووکەپێ بە شەقامەکدا گوزەرتان کرد!"

"ئەها... منت بینیوە! کەواتە وا پێدەچێت ئێو لە خودی خۆشم باشتر ئاگاداری هەموو شتێک بن! بەڵام هەست دەکەم لە هەموو شت زیاتر بینینی من ئێجگار تووڕەی کردبن... تەماشا بکە، من سێ هەفتەیەک بەر لە ئێستا گەیشتوومەتە ئێرە بۆ بەجێهێنانی چەند کارێکی تایبەت بە خۆم... هەرچەندە پێویست بە خۆناساندنیش ناکات، چونکە پێشتر ناوەکەمتان بەڕەوانی وت و ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەمناسن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەر خۆمت پێ دەناسێنمەوە؛ من پاڤێل پاڤلۆڤیچ تروسۆتسکیم. لە ڕاستیدا بۆیە لێرەم، لە هەوڵی ئەوەدام لەسەر ئەم کارەی ئێستام خۆم بگوێزمەوە بۆ سەر کارێکی تر و لە بەڕێوەبەرایەتییەکی تر و ئەرکێکی نوێتر و هەڵبەت پلەیەکی بەرزتریش... بەڵام ڕاستیتان بوێت، ئەمە مەبەستی سەرەکیی من نییە لە هاتنم بۆ ئێرە... ئەگەر ڕاستیتان بوێت، هەڵبەت ئەگەر حەز بکەن و هەر بەڕاستییش بتانەوێت، ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە، کە ئەوە بۆ ماوەی سێ دانە هەفتەی ڕێکە لەم شارە بێ ئیش و کار، هەرخەریکی کاتبەفیرۆدان و سووڕانەوەی بێسوودم، ئەگەر ڕاستیت بوێت، هەر بەمەبەست خۆم کاری گوێزانەوەکەم دوا دەخەم - هەرچەند ئەگەر کاری گوێزانەوەکەشم سەر بگرێت و تەواو ببێت، ئەوە هەر بەئەنقەست لەبیر خۆمی ئەبەمەوە و وا خۆم دەر دەخەم، کە کارەکەم هێشتا تەواو نەبووە و بە هۆی

ئەو دۆخە دەروونییەی لە ئێستادا هەمە، لەوە ناچێت وا بەزوویی پترسبۆرگەکەتان بەجێ بهێڵم. بەتەواوی سەرگەردان بووم؛ هەر خەریکی هاتوچۆ و ئێرەوئەوێم، وەک ئەوەی ئامانجی سەرەکیی خۆمم ون کردبێت. بەم بارودۆخە دەروونییەی کە هەمە، تەنانەت زۆریش دڵخۆشم کە ئامانجی خۆمم ون کردووە!..."

ڤێلچانینۆڤ برۆکانی هێنایەوە یەک و نەیهێشت قسەکانی تەواو بکات، پەڕییە ناو قسەکانی و لێی پرسی، "چ جۆرە بارودۆخێکی دەروونی؟"

میوانی ناوەخت سەری بەرز کردەوە و بە چاوی کراوەوە ڕووی لە ڤێلچانینۆڤ کرد، کڵاوەکەی بۆ درێژ کرد و ئاماژەی بۆ شریتە ڕەشەکە کرد، کە پێوەی بەستبوو، "تەماشا بکەن، ڕەنگە ئێستا بزانن لە چ بارودۆخێکی دەروونیدام؟"

ڤێلچانینۆڤ بێهەستانە، سەرەتا چاوی بڕییە شریتە ڕەشەکە و دواتریش چاوی بڕییە میوانەکەی. لەناکاو ڕوخساری بە شێوەیەکی زۆر ترسناک ڕەش داگەڕا.

"نەڵێیت ناتالیا ڤاسیلیڤنا مردووە؟"

"بەڵێ! ناتالیا ڤاسیلیڤنا! مانگی سێی ڕابردوو... بە نەخۆشیی سیل، زۆر لەناکاو، دوای دوو یان سێ مانگ لەو نەخۆشییە، گیانی سپارد و ئا بەم شێوەیە بەتەنیا جێی هێشتم کە دەمبینی!"

لە کاتێکدا بە هەستێکی زۆر قووڵەوە میوانی ناوەخت ئەم قسانەی لە زار دەهاتنە دەر، دەستی لە هەردوو لاوە دەر هێنا بە دەستی چەپی ئەو کڵاوەی گرتبوو، کە شریتە ڕەشەکەی پێوە بەستبوو، نزیکەی دە چرکەیەکیش سەرە ڕووتاوە و بێمووەکەی ڕوو بە عەردەکە شۆڕ کردبۆوە.

لەوە دەچوو ئەم هەڵسووکەوتە نامۆیەی میوانەکە و

ئەم جووڵەیەی کە کردی، لەپڕ ژیانی کردبێتەوە بەبەری ڤێلچانینۆڤدا، زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانە کەوتە سەر لێوەکانی، زەردەخەنەکە نەک هەر گاڵتەجاڕانە بوو، بگرە لەو جۆرە زەردەخەنە ژەهراوییانە بوو، کە دەماری مرۆڤ دەگرن و پەستی دەکەن، بەڵام ئەم شادییەی ڤێلچانینۆڤ زۆر درێژەی نەکێشا، کە هەواڵی مەرگی ئەو خاتوونە (کە ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش دۆستایەتیی لەگەڵیدا هەبوو بوو و بەباشییش دەیناسی، بەڵام بە هۆی تێپەڕبوونی کاتەوە سەرکەوتوو بووبوو لەوەی بەتەواوی لەبیری خۆی دەری بکات) لە شوێنی خۆی دای چڵەکاند و تووشی واقوڕمانی کرد. یەکەم وشە کە لە زاری دەر هات، بە شێوەی گلەیی و سکاڵا دەری بڕی و وتی، "بەڕاست ئەمە ڕێی تێ دەچێت؟ ئەی بۆچی ڕاستەوخۆ نەهاتی و ئەم هەواڵەم پێ ڕابگەیەنیت؟"

"لە دڵنەواییکردنتان گەلێک سوپاس دەکەم. بەڕاستی هەست بە پەژارەی ئێوەش دەکەم و پێزانینی زۆریشم بۆ ئەو پەژارەیەتان هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە..."

"سەرەڕای ئەوەی کە چی؟"

"سەرەڕای ئەوەی کە چەندین ساڵە لە یەکتریش دابڕاوین، کەچی ئێوە هاوبەشی ئەم کۆستکەوتنەی منتان کرد و هاوسۆزیی خۆتان بۆ دەر بڕیم، تەنانەت نازانم چۆن سوپاسگوزاریی خۆمتان بۆ دەر ببڕم. تەنها ئەمە بوو کە دەمویست پێتانی ڕابگەیەنم. هەڵبەت ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، کە گومانم لە دڵسۆزیی هاوڕێکانی ترم هەبێت: لێرە دەتوانم چاوم بە چەندین هاوڕێی دڵسۆز و جێمتمانە بکەوێت و بیاندۆزمەوە، هەر بۆ نموونە ستێپان میخایلۆڤیچ باگاوتۆڤ. بەڵام ئەلێکسی

ئیڤانۆڤیچ، هەر وەک دەزانن، سەرەڕای هاوڕێیەتییەکەمان، کە دەتوانم ڕێ بە خۆم بدەم بڵێم هاوڕێیەتییەکەمان، چونکوو تا ئێستاش من ئەو هاوڕێیەتییەمان بەرز دەنرخێنم و بەوپەڕی ڕێز و شکۆوە یادی دەکەمەوە و باسی لێوە دەکەم. ئەوا بۆ ماوەی نۆ دانە ساڵ دەبێت، کە تۆ بۆ تەنها جارێکیش چییە لە دوای ڕۆشتنت لەلای ئێمە لە ماوەی ئەم نۆ ساڵەدا، تەنها جارێکیش چییە سەردانێکت نەکردین؛ هیچ نامەگۆڕینەوەیەکیش لەگۆڕێدا نەبوو..."

میوانەکە بە یەک ڕیتمی موزیکی هاوئاهەنگ، دەستەواژەکانی دەر دەبڕی. تەواوی ئەو کاتەی کە قسەی دەکرد، چاوی لە عەردەکە بڕیبوو، بەڵام هیچ گومانی تێدا نەبوو، کە تەواوی ئەو کاتەی تێدەپەڕی، هەموو شتەکانی دەبینی. بەڵام ڤێلچانینۆڤیش هەنووکە هێمنیی خۆی بەدەست هێنابۆوە.

بە هەستێکی زۆر نامۆوە، کە تا دەهات، ئەو هەستە بەهێزتر و بەهێزتر دەبوو، چاوی بڕیبووە پاڤێل پاڤلۆڤیچ و زۆر بەقووڵی گوێی لێ گرتبوو. تەنانەت کاتێک کە لەناکاو پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە ئاخاوتن وەستا، یەک شەپۆل بیرۆکەی سەیر و جۆراوجۆر و چاوەڕواننەکراو خۆی خزاندە مێشکیەوە. هێندە خرۆشابوو، کە هاواری کرد، "بەڵام زۆر سەیرە، چۆن تا ئێستا تۆم نەناسیبووەوە؟ بە لایەنی کەمەوە زیاتر لە پێنج جار من و تۆ ڕێکەوتی یەکترمان کردبوو لە کاتی تێپەڕبوون بەسەر شەقامەکاندا!"

"بەڵێ، بە هەمانشێوە منیش چاکم لەبیرە، کە بەردەوام دەهاتنە سەر ڕێگەکەم! پێم وا بێت دوو جار یان سێ جارێک دەبوو..."

"لەڕاستیدا ئەوە تۆ بوویت، کە بەردەوام دەهاتیتە سەر ڕێگەکەم، نەک من!"

ڤێلچانینۆڤ لە شوێنی خۆی هەستایەوە و کتوپڕ بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دای لە قاقای پێکەنین.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بۆ ساتێک لە قسەکردن وەستا و بەسەرنجەوە و بەوردی تەماشای هاوڕێکەی کرد. بەڵام یەکسەر بەردەوام بۆوە، "سەبارەت بەوەی کە دەڵێن بۆچی منتان نەناسیوەتەوە؟ پێدەچێت بە هۆی تێپەڕبوونی ئەو ماوە زۆرەوە منتان لەبیر چووبێتەوە، سەرباری ئەوەش، ئەم ئاوڵەیەشی کە ماوەیەک دەبێت تووشی بووم، هەندێک شوێنەواری لەسەر ڕوخسارم بەجێ هێشتووە."

"ئاوڵە؟ ڕاست دەفەرموون، شوێنەواری ئاوڵە بە ڕوخسارتانەوە دەبینرێت! بەڵام سەرەڕای ئەوە، ئایا توانیت کە..."

"چارەسەری بکەم؟ هەرشتێک ڕەنگە ڕوو بدات. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، کەسێک ئاوا تووشی لێقەومان ببێت، هەرگیز ناتوانێت هیچ بڵێت."

"هەر بەڕاستی هەمووی وەک یەکە، بەڕاستی مایەی پێکەنینە! بەڵام بەردەوام بن، بەردەوام ببن، هاوڕێ خۆشەویستەکەم!"

"سەرەڕای ئەوەی چاوم پێت کەوت، بە هەمان شێوە..."

"بۆستە بزانم! بۆچی هەر ئێستا وتت "چارەسەری بکەم؟" مەبەستم ئەوە بوو کە بە دەربڕینێکی شیاوتر مەبەستی خۆمتان پێ ڕابگەیەنم. بەڵام فەرموون بەردەوام ببن، بەردەوام ببن!"

ڤێلچانینۆڤ بە هۆی چەند هۆکارێکەوە وردەوردە هەستی بە دڵخۆشییەکی سەیر دەکرد. ئەو هەستە خەماوییە پێشتر

هەیبوو، ئێستا وردەوردە دەگۆڕا بۆ هەستێکی تر، کە تەواو جیاواز بوو لەوەی پێشووتر، بە هەنگاوی خێرا بەناو ژوورەکەدا سەر و خواری دەکرد و ئەهات و ئەچوو.

"سەرەڕای ئەوەی تەنانەت چاویشم پێتان کەوت، لەگەڵ ئەوەشدا نیازم بوو کاتێک کە پێم نایە پترسبۆرگ، چاوم پێتان بکەوێت و بتاندۆزمەوە، سەرلەنوێ پێتان ڕادەگەیەنمەوە، کە هێشتاش لە ڕووی ڕۆحییەوە هەست دەکەم تەواو تێکشکاوم... هەست بە تێکشکانێکی دەروونیی زۆر ناخۆش دەکەم، بەتایبەت لە مانگی سێوە کە..."

"ئاهـ بەڵێ! تۆ تووشی تێکشکانی دەروونی بوویت لە مانگی سێوە... کەمێک ڕابوەستە. بەڕاست جگەرە ناکێشن؟"

"ئێوە باش دەزانن، کە ڕۆژانی زوو، ئەو کاتەی هێشتا ناتالیا ڤاسیلیڤنای کۆچکردوو لە ژیاندا بوو من..."

"بەڵێ، بەڵێ، بەدڵنیاییەوە؛ لە مانگی سێوە؟"

"بە ئەرک نەبێت ئەتوانن جگەرەیەکم بدەنێ؟"

"بێگومان، فەرموون ئەمە جگەرە. دای بگیرسێنن و بەردەوام بن! بەردەوام بن! بە شێوەیەکی ترسناک..."

ڤێلچانینۆڤ، لە کاتێکدا جگەرەکەی بۆ ئەو داگیرساند، دووبارە بەخێرایی گەڕایەوە سەر جێگەی خەوەکەی.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بۆ ساتێک لە قسەکردن وەستا و تەماشایەکی ڤێلچانینۆڤی کرد و وتی، "بەڕاست، تۆش هێندە باش نایەیتە بەرچاو. ئایا بەڕاست تەندروستیتان باشە؟"

ڤێلچانینۆڤ بەتووڕەییەوە هاواری کرد، "نەفرەت لە تەندروستی من! بەردەوام بە!

میوانەکە لە شوێنی خۆیەوە تەماشای پەشێویی

هاوەڵەکەی خۆی دەکرد، پێدەچوو ئاسوودەتر بێت، هەروەها بڕوابەخۆبوونەکەشی وردەوردە گەشەی دەکرد.

دووبارە دەستی کردەوە بە ئاخاوتن، "بەڵام پێم ناڵێن درێژە بە چ شتێک بدەم؟ ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، سەرەتا ئەوە بهێنەرە پێشچاوی خۆت، کە پیاوێک تێکشکاوە - بەڵام تێکشکانێکی ئاسایی نا، بەڵکوو سەرتاپا تێکشکاوە، ئەگەر بتوانین بەمشێوەیە گوزارشتی لێبکەین؛ پیاوێک کە دوای بەسەر بردنی بیست ساڵ لە ژیانی هاوسەرێتیی بەخۆشبەختی، پاشان لەپڕ بە هۆی ڕووداوێکەوە سەراپای ژیانی قڵپ دەبێتەوە و دەگۆڕێت، لەناو شەقامەکاندا، بێ ئەوەی ئامانجێکی دیاریکراوی هەبێت، وێڵ و سەرگەردانانە بەدوای هیچەوە وێڵە، هەر وەک ئەوەی لە چۆڵەوانییەکدا خۆی لەیاد کردبێت، لەگەڵ ئەوەشدا چێژێکی ڕاستەقینە لەم لەیادکردنەی خۆی ببینێت. زۆر سروشتییە ئەگەر بێت و هەندێک جار بەرێکەوت چاوم بە ناسیاوێکم یان تەنانەت هاوڕێیەکی ڕاستەقینەش بکەوێت، ئەوە هەر بەئەنقەست خۆمی لێ هەڵە دەکەم و تا پێشم بکرێت، خۆمی لێ نزیک ناخەمەوە، ئەمە مەبەستم لەو کاتانەیە، کە خۆم لەیاد دەکەم. بەڵام هەندێک کاتی تر کە هەموو شتێکم وەبیر دێتەوە، هەموو ئەو کەسانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان شایەتی ئەو ژیانەی ڕابردووم بوون و ڕابردوویەک کە ئێستا بەسەر چووە و هەرگیزیش ناگەڕێتەوە، لەم جۆرە کاتانەدا دڵم زۆر بەتوندی لێدەدات و حەز دەکەم خێرا خۆم بگەیەنمە ئەو هاوڕێیەی مەبەستمە و ئیتر گوێ بە ڕوودانی هیچ مەترسییەک نادەم و باز دەدەم بەسەر هەموو مەترسییەکاندا و تەنها بۆ ئەوەی بە هەموو بوونی خۆم و سۆز و خۆشەویستیمەوە هاوڕێکەم

لە ئامێز بگرم و تێر لە ئامێزیا بگریم. چیی تر گرنگ نابێت بەلامەوە نیوەی شەو بێت یان قرچەقرچی گەرمای نیوەڕۆ بێت، تەنانەت ئەگەر پێویست بکات کاتژمێر چواری بەیانییش بێت، هەر بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەم خەبەری دەکەمەوە. من تەنها سەبارەت بە کاتی هاتنەکەم بەهەڵەدا چووم، بەڵام سەبارەت بە هەڵبژاردنی هاورێکەم، بەهەڵەدا نەچووم، ئەم ساتە بۆ من زۆر ساتێکی بەنرخ بوو و سەبارەت بە هاتنە ناوەختەکەشم، بە هۆی ئەم بارودۆخە دەروونییەی کە هەستی پێ ئەکەم، هەر بەڕاستی پێم وا بوو هێشتا تازە کاتژمێر دوانزەیە. تەنانەت هەندێ کات پیاو پەژارەکانی خۆی دەخواتەوە و پێی سەرخۆش دەبێت. هەرچەند ئەوەی ئێستا تێکم دەشکێنێت بەسەر یەکدا، پەژارە نییە لە ڕاستیدا! بەم تازەیییە شتێکی تر هەراسانی کردووم و تێکوپێکم ئەشکێنێت بەسەر یەکدا..."

ڤێلچانینۆڤ بە دڵتەنگی و جۆرێکیش لە گرنگیپێدانەوە وتی، "بەڕاستی زۆر بەنامۆیی لە خۆتان دەدوێن!"

"بەڵێ، ڕاست دەکەن، من زۆر بەنامۆیی لە خۆم دەدوێم..."

"خۆ... گاڵتە و شتی واش ناکەن؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە زۆر هەستی بە ئازار کرد، بەم قسەیەی دوایی ڤێلچانینۆڤ، بەسەرسامییەوە وتی،

"گاڵتەکردن! ئەویش لە کاتێکی لەم شێوەیەدا، کە من کۆڵێک پەژارەم لەسەر دڵ کۆ بۆتەوە..."

"ئاهـ لێت ئەپاڕێمەوە کە چیی تر باسی ئەوە مەکەن!"

ڤێلچانینۆڤ هەر کە وای وت، هەستایە سەر پێ و دەستی کردەوە بە هاتوچۆ بەناو ژوورەکەدا. پێنج خولەکێک بەم

شێوەیە بەبێدەنگی تێپەڕی کرد. لەوەدا بوو کە میوانەکەش هەستێتە سەر پێ، بەڵام لەناکاو ڤێلچانینۆڤ گوڕاندی بەسەریدا، "هەڵنەستیت لە شوێنی خۆت، هەڵنەستیت!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش، کە بەم شێوە فەرماندەرانە گوێی لەم قسەیە بوو، خێرا و گوێڕایەڵانە یەکسەر لەناو کورسییەکەی خۆیا نوقم بۆوە."

ڤێلچانینۆڤ، وەک ئەوەی لەپڕ بیرۆکەیەک تووشی سەرسووڕمانی کردبێت، لەناکاو لە بەردەمی میوانەکەیدا ڕاوەستا، وتی، "بەڵام ئێوە زۆر گۆڕاون. هەر بەڕاستی بە شێوەیەکی زۆر ترسناک گۆڕاون! بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی! مرۆیەکی تەواو جیاوازن ئێستا!"

"بە ڕای من هیچ جێگەی سەرسووڕمان نییە! نۆ ساڵ دووری، کاتێکی کەم نییە بۆ گۆڕانی شێوەی مرۆڤ!"

"نا، نا، نا، مەبەستەکەی من تێپەڕینی ساڵەکان نییە! هەر بەڕاستی لە ڕووی شێوە و باری جەستەییەوە گۆڕانێکی ئەوتۆتان بەسەردا نەهاتووە، بەڵام من مەبەستم لە گۆڕانێکی ترە، ئێستا تۆ پیاوێکی تەواو جیاوازیت!"

"ئێ ئەمەش هەر ئاساییە، ڕەنگە ئەو گۆڕانەشی کە تۆ باسی دەکەیت و من نایزانم، هەر بە هۆی ئەم نۆ ساڵەوە بێت."

"ئەی بۆ نەڵێین لە مانگی سێوە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بزەیەکی دزێوی خستە سەر لێوەکانی، "هە، هە! بیرۆکەکەتان تا بڵێی جێگەی پێکەنینە... بەڵام ئەگەر بوێریی ئەوەم تێدا بێت - هەر بەڕاستی ئەمەوێت لێتان بپرسم مەبەستتان چ جۆرە گۆڕانێکە بەدیاریکراوی!"

"زۆر باشـە، مـادەم تـۆ داخوازیـی ئـەوەم لـێ دەکەیت! منیش بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە وەڵامتان دەدەمـەوە، لـە ڕاستیدا ئـەو پاڤێل پاڤلۆڤیچـەی جاران دەمناسی، مرۆیەکی تا بڵێی بەڕێز و بەویقار، خۆشسلوک و مرۆیەکی تا بڵێی ژیر بوو، بـەڵام ئەمـەی ئێستا دەیبینم و لـە ماڵەکەمدایە، لـە مرۆڤێکی هـەرزە بـەولاوە، هیچی تر نییـە!"

ڤێلچانینۆڤ لەوپەڕی تووڕەییدا بـوو، کە تەنانـەت کۆی لـە دەربڕینی هیچ وشـەیەکی ناشاییستە نەدەکردەوە بەرامبەر ئەو کەسەناشی کە باش بوون لەگەڵیدا."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وەک ئەوەی چێژ لە هەڵچوون و تووڕەبوونی خانەخوێکەی ببینێت، بـە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانـەوە وتی، "مرۆیەکی هـەرزە! کەواتـە تۆ بـەو شـێوەیە بیر دەکەیتـەوە؟ ئێستاش چیی تر مرۆیەکی ژیر و بەویقار نیم – چیی تر ژیر نیم؟"

"نەفرەت لـە ژیری! ئێستا زاتی ئەوەم هەیـە بڵێم، کە تۆ هەر بەڕاستی زۆر ژیریت."

ڤێلچانینۆڤ لـە دڵی خۆیدا وتی، "باشـە، بەڕاست من خۆم زۆر بـە چاوقاییم دەزانی، کەچی تەماشـا بکە، ئـەم مردوومراوە لـە من چاوقاییمترە! ئەبێت چ ئامانجێکی نهێنیی هەبێت و چ گۆبەندێکی لەژێر سـەردا بێت؟"

میوانەکە، کە زۆر خرۆشابوو، ئاگای لـە خۆی نەمابوو، لەسـەر کورسییەکەی جووڵـەی تێ کەوتبوو بەمـلا و بـەولای خۆیدا خولی دەدا، لەنـاکاو هـاواری کـرد، "ئاهـا دۆسـتی مـن، هاوڕێی گەلێک شـرینم! ئێمـە خەریکی چ بەزمێکین؟ ئێمە ئێستا لـەم سـەر زەمینـە نین، ئێمـە لـە کۆمەڵگەیەکی خانـەدان و مەزندا

نین! ئێمە دوو هاوڕێی کۆنین، گەلێک کۆن و گەلێک گیانی بەگیانین! ئێستا بەوپەڕی ڕاستگۆیی و دۆستایەتییەوە لە یەک شوێندا کۆ بووینەتەوە تا گیان بکەینەوە بەبەری ئەو هاوڕێیەتییەی بە هیچ نرخێک مەزندە ناکرێت، یادی بەخێر، کە جاران ئەو خوالێخۆشبووەش لەگەڵمان کۆ دەبۆوە و مەجلیسەکانمانی جوانتر دەکرد!"

هەست و سۆزی، بە شێوەیەکی وەها لە خۆی دوور خستبۆوە کە سەرلەنوێ سەرە بێمووەکەی خۆی ڕوو بە عەردەکە، وەک جاری پێشوو، شۆڕ کردەوە، ڕوخساری لەناو کڵاوەکەیدا حەشار دا. ڤێلچانینۆڤ بە ڕق و تووڕەیییەوە لێی دەڕوانی.

لەپڕ خەیاڵێک بە مێشکیدا برووسکەی کرد، "باشە کێ ناڵێت ئەم هەموو شتەی ئەیکات و ئەیڵێت، بیەوێت سەر بخاتە سەر سەرم و گاڵتەجاڕی بەرپا بکات! بەڵام نا... نەخێر، نا... نەخێر! بڕواش ناکەم سەرخۆش بێت، لەگەڵ ئەوەی دەمووچاویشی سوور هەڵگەڕاوە، تەنانەت گریمان ئەگەر سەرخۆشیش بووایە - خۆ هەر هەمان شتی دەکرد! باشە تۆ بڵێیت هەر بەڕاستی ئەم خوێڕییە چیی لە من بوێت و چ ئوینێکی لەژێر سەردا بێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، لە کاتێکدا وردەوردە کڵاوەکەی لە ڕوخساری دوور دەخستەوە و وا دیار بوو لەناو دنیای خەیاڵ و بیرەوەرییەکانی ڕابردوویدا تەواو نوقم بووبێت، لەناکاو دەنگی بەرز بۆوە، "بیرت دێت؟ بیرت دێت؟ بیری ئەو کاتانەی دووقۆڵی پیاسەمان دەکرد لەناو گوندەکاندا، ئەی ئەو ئێوارانەت بیر ماوە، کە بەیەکەوە بە قسەی خۆش

و جەفەنگبازی بەسەرمان دەبرد، یان ئەو کۆڕ و ئاهەنگی سەماگێڕانانە و دانیشتنەکانمان لەسەر مێزی یاریکردن لە ماڵی پایەدار، بەڕێزی میواندۆست سیمیۆنی سیمیۆنۆڤیچ؟ یان ئەو ئێوارانەت بیر دێتەوە، کە هەرسێکمان لەدەوری یەک کۆ دەبووینەوە و دەمانخوێندەوە! ئەی یەکەم دیدارت بیر ماوە، کە تۆ بەیانییەکی زوو هاتبوویت بۆ لامان و ئەتویست سەبارەت بە کارە بازرگانییەکانت پرسوجۆم لەگەڵ بکەیت؟ باشم بیرە کە سەرەتا خەریک بوو خراپ تووڕە ببیت، بەڵام لەناکاو ناتالیا ڤاسیلیڤنا خۆی کرد بە ژوورەوەدا و هەمووی دە خولەکێکی نەبرد، کە بوویت بە هاوڕێیەکی گیانیبەگیانیی خێزانەکەمان، ئەم هاوڕێییەتییەش نزیکەی یەک ساڵی ڕەبەقی خایاند؛ بەسەرهاتی ئەم هاوڕێیەتییەشمان، ڕێک وەک شانۆنامەکەی تۆرگینێڤ، *خانمی لادێیی*، بوو.

ڤێلچانینۆڤ سەری داخستبوو و چاوی لە عەردەکە بڕیبوو و بەهێواشی لە ژوورەکەدا سەر و خواری دەکرد، هەرچەند ئارامی لەبەر بڕابوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، بەوردی گوێی گرتبوو.

لە کاتێکدا کەمێک شڵەژانی پێوە دیار بوو، قسەکانی بە میوانەکەی بڕی و وتی، "لە ڕاستیدا ئەوەی تا ئێستا بە بیری مندا نەهاتبوو، ئەم شانۆنامەیەی *خانمی لادێیی*یە بوو، کە تۆ باسی لێوە دەکەیت. هەرگیزیش پێشتر نەمبینیبوو، کە تۆ بەم شێوە زیقنە قسە بکەیت و ئاوا دەمی خۆت خوار بکەیتەوە و بەم شێوە زارە ناسروشتییە قسە بکەیت. بۆ وات بەسەر هاتووە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ خێرا قسەکەی پێ بڕی و وتی، "ڕاستییەکەی

ئەوەیە، کە من پێشتر زۆر بەکەمی ئەدوام. واتە زیاتر بێدەنگیم هەڵدەبژارد. لەبریی قسەکردن. خۆشتان باش دەزانن، کاتێک خوالێخۆشبووی خێزانم قسەی بکردایە، ئەوە من وام بە باش دەزانی گوێ لە قسەکانی ئەو بگرم. بیرت دێت کە چەند شیرینانە قسەی دەکرد... بەتایبەت ئەو کاتانەی باسی لە شانۆنامەکەی *خانمی لادێیی*" و پاڵەوانە سەرەکییەکەی ناو ئەو شانۆنامەیە، ستوبندیڤ، بکردایە، بە شێوەیەکی سەرەکی، هەڵبەت تۆ حەقتە وام پێ بڵێیت و ڕاستیش دەکەیت. گەلێک جار، دوای ئەوەی تۆ بەجێت هێشتبووین، من و ئەو خوالێخۆشبووە یادمان لە یەکەم دیدارمان لەگەڵ تۆدا دەکردەوە و هەمیشە بەو دراماییەمان دەچوواند، ئەگەر ڕاستیتان بوێت، جۆرە لێکچوونێکی زۆر هاوشێوە لەو نێوانەدا دەبینرا. بەتایبەتی دەربارەی ستوبندیڤ."

ڤێلچانینۆڤ، کە تەواو لە ناوهێنانی ستوبندیڤ دەهری ببوو، چونکە ناوهێنانی ئەو کارەکتەرە دەبووە هۆی وەبیرهێنانەوە و زیندووکردنەوەی چەندین بیرەوەری ناخۆش و ئازاربەخش لە مێشکیدا، بەتووڕەییەوە پێی کوتی بە عەردەکەدا و هاواری کرد، "کامە ستوبندیڤ؟ نەفرەتی لێ بێت!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێکی شیرین و لەسەرخۆ وتی، "ستوبندیڤ کارەکتەرێکە، یەکێکە لە کارەکتەرەکانی ناو شانۆنامەکەی *خانمی لادێیی* و ڕۆڵی هاوسەر دەبینێت لەو شانۆییەدا. بەڵام ئەوەی من مەبەستم بوو لەم بابەتەدا، لە ڕاستیدا پەیوەندیی بە زنجیرەبیرەوەرییەکی شیرینتر و بەنرختری ژیانمەوە هەیە، دوای ئەوەی تۆ لەلامان ڕۆیشتیت، ستیپان میخایلۆڤیچ باگاوتۆڤ، بە هاوڕێیەتیی خۆی لەگەڵ

ئێمە، هەمان ئەو شانازییە گەورەیەی پێ بەخشین کە پێشتر ئێوە پێتان بەخشیبووین، ئەم هاوڕێییەتیەشمان لەگەڵ ئەو، ماوەی پێنج دانە ساڵی ڕەبەقی خایاند."

ڤێلچانینۆڤ هێشتا وەک پەیکەرێکی بێگیان لە شوێنی خۆی بەپێوە وەستابوو، وتی، "باگاوتۆڤ؟ مەبەستت لە کێیە؟ کامە باگاوتۆڤ؟"

"باگاوتۆڤ، هەمان ستیپان میخایلۆڤیچە، کە بە هاوڕێیەتیی خۆی، خۆشنوودی کردین، ڕێک ساڵێک دوای تۆ، هەروەها... هەروەها ڕێک هەمان شتی کرد، کە تۆ لەگەڵتا کردین."

ڤێلچانینۆڤ لە کۆتاییدا بیری کەوتەوە کە کێیە، هاواری کرد، "ئەی خوایە، بەڵێ! ئێستا ئەزانم باسی کێ دەکەن! باگاوتۆڤ! پێم وا بێت مۆڵگەی کەشتی و شتی وای هەبوو لە شارۆچکەکەی ئێوە..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان ئەو شەیدایی و خۆشییەی ڤێلچانیۆڤ، بەوپەڕی دڵخۆشییەوە هاواری کرد، "هەیبوو، هەیبوو! لەلای پارێزگاری پترسبۆرگ! لاوێکی تا بڵێی ڕێکپۆش و خانەدان بوو، سەر بە شکۆمەندترینی خێزانەکان بوو! کەسم نەدیبوو هێندەی ئەو لاوە جوانخاس بێت."

"بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ! بەڕاست بیرم لە چی دەکردەوە؟ بۆچی ئەویش، بە هەمان شێوە..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ دووبارە بە هەمان ئەو شاگەشکەییەی ڤێلچانینۆڤەوە، بەوپەڕی خۆشییەوە هەمان ئەو وشانەی دووبارە کردەوە، کە ئەو کردنی، وتی، "ئەویش بە هەمان شێوە، ئەویش بە هەمان شێوە! بەڵێ، ئەویش بە هەمان شێوە، لە هەمان ئەوکاتەی ئێمە لە ماڵی میواندۆستی بەخشندە،

خاوەنپایە بەڕێز سیمیۆن سیمیونۆڤیچ لە هۆڵە تایبەتەکەی بۆ نمایشی شانۆیی، خەریکی نمایشکردنی شانۆنامەی *خانمی لادێیی* بووین. ستیپان میخایلۆڤیچ ڕۆڵی ئاغای پێ درابوو و منیش ڕۆڵی هاوسەرم پێ درابوو، هەروەها خوالێخۆشبووی خێزانیشم ڕۆڵی خانمی لادێیی پێ درابوو. بەڵام بە هۆی پێداگریی ناتالیا ڤاسیلیڤنای خێزانی کۆچکردووم، ئەو ڕۆڵەیان لە من وەر گرتەوە. ئا بەم شێوەیە بوو، من ڕۆڵی هاوسەرم نەگێڕا. وەک ئەوەی ئەو ڕۆڵە بۆ من نەگونجێت و لەگەڵ کەسایەتییەکەمدا نەیەتەوە...“

ڤێلچانینۆڤ، کە لە تووڕەییدا گیانی دەلەرزی، بە شێوەیەکی ئابڕووبەرانە و بازاڕی و دوور لە ئەتەکێت، گوڕاندی بەسەریدا، ”شەیتان بەنەفرەت بێت! ئاخر پێم ناڵێیت چ لێکچوونێکی هاوبەش لەنێوان تۆ و ستوبندیڤدا هەیە؟ جەنابت پێش ئەوەی هەرکەسێکی دی بیت، یادت نەچێت کە تۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ تروسۆتسکیت، نەک ستوبندیڤ! پاشان ئەبێت بمبوورن، چونکە ئەمەوێت پێتان ڕابگەیەنم، کە بەڕێز باگاوتۆڤ ئێستا لێرەیە، لە پترسبۆرگ، ئەم بەهارە بەم دوو چاوەی خۆم بینیمن، کە جەنابتان هێندە بەتامەزرۆییەوە باس لەو خوێرییە دەکەن. بۆ بە هەمان شێوەی کە هاتوون بۆ لای من، ناچن بۆ لای ئەویش؟“

”ئەوە بۆ ماوەی دوو دانە هەفتەی ڕێکە، ڕۆژ نییە نەچمە بەردەم دەرگای ماڵەکەی بۆ ئەوەی چاوم پێی بکەوێت، بەڵام ڕێم پێ نادەن چاوم پێی بکەوێت! لەبەر ئەوەی نەخۆشە، هەر لەبەر ئەوە ڕێم پێ نادەن بیبینم! زۆر لەوە دڵنیا بن، کە من لە سەرچاوەیەکی زۆر باوەڕپێکراوەوە هەواڵی ئەوەم لایە، کە ئەو هەر بەڕاستی تووشی نەخۆشییەکی زۆر مەترسیدار و

کوشنده بووه. وای بۆ دەچم هەر لەبەر هۆکاری ئەم نەخۆشییە مەترسیدارە بێت، کە ڕێ بە کەس نادەن سەردانی بکەن و چاویان پێی بکەوێت! هاوڕێیەکی شەشساڵە! ئاخ! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، پێت دەڵێم و دووبارەشی دەکەمەوە: هەندێک جار کەسێک ئازارەکانی بە شێوەیەکە، کە پێی خۆشە بە قووڵاییی زەویدا ڕۆ بچێت و بەتەواوی تێیدا نوقم بێت! بەڵێ، هەر بەڕاستی؛ هەروەها هەندێ کاتی تر، کەسێک پێی خۆشە و دەیەوێت خۆی فڕێ بداتە ئامێزی یەکێک لە ناسیاوە کۆنەکانی یان باشتر بڵێم، خۆی فڕێ بداتە ئامێزی یەکێک لەوانەی لە ژیانی ڕابردوویدا هاوبەشیی کردووە، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەی بە دڵێکی ئاسوودەوە لە ئامێزی یەکدا بگرین، بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە ئەمە دەڵێم، بەدڵنیاییەوە بۆ هیچ مەبەستێکی تر نا، تەنها بۆ ئەوەی کەمێک لە ئامێزی یەکتریدا بگرین..."

ڤێلچانینۆڤ لەناکاو بەتووڕەییەوە هاواری کرد، "بە هەرحاڵ، زۆر باشە، پێتان وا نییە کە هەتا ئێرە بۆ ئەمڕۆ بەس بێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ یەکسەر لە شوێنەکەی خۆی قەڵەمبازی دا و وتی، "بەڵێ، بێگومان، تا ئێرە بۆ ئەمڕۆ بەسە، لە ڕاستیدا نەک هەر بەسە، بەڵکوو زۆریش بەسە! ئێستا نزیکی کاتژمێر چوارە و زۆر خەجاڵەتم کە ڕەنگە بە هۆی خودپەسەندی و زیادەگۆییەکانمەوە بێزارم کردبن..."

"گوێبگرە، بەدڵنیاییەوە خۆم سەردانت دەکەمەوە و بەم زووانە چاوم پێت دەکەوێتەوە، دوای ئەوە، هیوادارم... ڕاستەوخۆ و بەڕاشکاوی پێم بڵێیت، هەر بەڕاستی ئەمڕۆ خەیاڵ نەبوویت؟"

"خەیاڵ! بە هیچ کلۆجێک!..."

"کە هاتیت بۆ ئێرە، هیچ شتێکت نەخواردبۆوە یان پێشتر نەتخواردبۆوە؟"

"ئەزانی چی، ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ، هەست دەکەم کەمێک تات هەبێت."

"سبەینێ بەیانی، پێش کاتژمێر یەک دێم بۆ دیدارت و چاوم پێت دەکەوێت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە زۆر کەیفخۆش و ڕازی بوو لە دۆخەکە، خێرا پەڕییە ناو قسەکانی ڤێلچانینۆڤ و قسەیەکی مزری ئاڕاستە کرد و وتی، "ماوەیەکی زۆرە سەرنجتان دەدەم و وا دەر دەکەوێت هەر لەخۆتانەوە قسە ببزرکێنن! هەر بەڕاستی بە هۆی گەلحۆییی خۆمەوە کە لە خەوم کردن، هەست بە ئازاری ویژدان دەکەم... بۆیە من هەر ئێستا دەڕۆم، هەر ئێستا دەڕۆم! ئێوەش بۆخۆتان ڕابکشێن و هەوڵ بدەن کەمێک بخەون!"

ڤێلچانینۆڤ لەدوای کابراوە بەخێرایی هاواری کرد، "بەڵام ناوونیشانی خۆتت پێ نەوتم، کە لەکوێ نیشتەجێیت؟"

"بەڕاست پێم نەوتیت! من لە هۆتێل پۆکرۆڤسکی نیشتەجێم."

"کامە هۆتێل پۆکرۆڤسکی؟"

"ڕێک نزیکی کڵێسای پۆکرۆڤسکییە. نزیکە لە لایەکی شەقامەکەوە. بەس ڕاستیتان بوێت، ناوی شەقامەکە و ژمارەی شەقامەکەم بیر نەماوە، بەڵام هەر ڕێک نزیکی کڵێسای پۆکرۆڤسکییە."

"بەدڵنیاییەوە ئەیدۆزمەوە!"

"بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، هەرکات بێن، ئەتانخەمە سەرسەرم."

خەریک بوو بە پلیکانەکاندا دەچووە خوارەوە، کە سەرلەنوێ ڤیلچانینۆڤ قاوی دایەوە، "ڕابوەستە! بەڕاست، ناتەوێت جێگە و ڕێگەت بگۆڕیت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە کاتێکدا لەسەر پلەی سێیەمی پلیکانەکان وەستابوو، ئاوڕی بۆ لای ڤیلچانینۆڤ دەدایەوە، بە چاوێکی کراوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە هاواری کرد، "مەبەستت چییە لەوەی جێگە و ڕێگەم بگۆڕم؟"

لەبریی وەڵامدانەوە، ڤیلچانینۆڤ بە هەموو هێزی خۆیەوە دەرگاکەی بە دەنگێکی بەرز بە ڕوویدا داخست. بەوریاییەوە دەرگاکەی کلیل دا. کاتێک گەڕایەوە بۆ ناو ژوورەکەی، وەک ئەوەی ئەتکی ناموسیان کردبێت، بەخەستوخۆڵی تفێکی لە عەردەکە کرد."

دوای ئەوەی بۆ ماوەی پێنج خولەکێک لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بێجووڵە بەپێوە ڕاوەستا. بێ ئەوەی جلەکانی بگۆڕێت، خۆی فڕێ دایە سەر جێگەکەی و هەمووی خولەکێکی نەبرد، کە چاوەکانی چوونە خەوێکی قووڵەوە، ئەو مۆمەی لەبیری چووبوو بیکوژێنێتەوە، بەهێواشی لەسەر مێزەکە دەسووتا.

# ٤

# ژن و مێرد لەگەڵ دۆستەکەدا

لـە خەوێکـی زۆر قـووڵ ڕۆ چووبـوو، نزیکـی دەوروبـەری کاتژمێر نۆ و نیو بوو کە بەئـاگا هاتـەوە؛ لـە شـوێنی خـۆی تەکانێکـی دا و هەسـتا، لەسـەر جێگەکـەی دانیشـت، بەخێرایـی هەموو شـتێکی وەبیر هاتـەوە، بەتایبەت ئـەوەی پەیوەندیی بـە مەرگـی ئـەو ژنـە کۆچکردووەوە بـوو.

ئەو هەواڵـە لەناکاوەی دوێنـێ شـەوی ڕابردوو، سـەبارەت بـە مەرگـی ئـەو ژنـە، هەسـتێکی زۆر ناخـۆش و تـا ڕادەیـەک ئازاراوییشـی لەسـەر دڵـی بەجـێ هێشـتبوو. ئـەم ئـازار و ناخۆشـییە، بـە هـۆی بیرۆکەیەکی سـەیرەوە، کە دوێنێ شـەوی ڕابـردوو لـە ئامادەبوونـی پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ بـۆی دروسـت ببـوو، بـە شـێوەیەکی کاتـی بابەتـی مردنـی ئـەو ئافرەتـەی کـە سـەرەتا بـە بیسـتنی هەواڵـی مردنەکـەی دای چڵەکاندبـوو، لەبیـری چووبـۆوە. بـەڵام ئەمـڕۆ، هـەر لـە یەکـەم سـاتی خەبەربوونەوەیـەوە، هەمـوو ئـەو شتانەی کـە نـۆ سـاڵ بـەر لـە ئێسـتا ڕوویـان دابـوو، لەنـاکاو بـە شـێوەیەکی زۆر نائاسـایی و

بە شێوەیەکی زۆر ڕوون، هەر هەمووی لە مێشکیدا زیندوو بوونەوە.

ڤێلچانینۆڤ، ئەم ژنە کۆچکردووە، واتە ناتالیا ڤاسلیڤنا، خێزانی ئەم تروسۆتسکییەی بە شێوەیەکی ژێربەژێر خۆش دەویست و کاتێک ڕووی کردبووە شارەکەی ئەمان، شاری "ت،" بۆ بەدەمەوەچوونی "دۆسیەیەکی تری هەر لەسەر بابەتی میرات و هەندێک موڵکی تایبەتی،" یەک دانە ساڵی ڕێک خۆی بەم دۆسیەیەوە سەرقاڵ کرد، لە ڕاستیدا هۆکەی ئەوە بوو، کە بەڕاستی عاشقی ئەم ژنە ببوو، ئەگین خودی ئەو دۆسیەیە پێویستی بەو هەموو کاتە نەبوو، تا ئەم بەم شێوەیە لەوێ دای کوتێت، تەنیا هۆکار ئەو شەیدابوونە لەڕادەبەدەرە بوو، کە بەرامبەر بەو ئافرەتە هەیبوو. ئەم شەیدابوون و ئاشقبوونەی بەرامبەر بەو ژنە هێندە بەهێز بوو، کە بەتەواوی بیروهۆشی لە کار خستبوو، ئەگەریش بە شێوەیەکی ڕاستتر بڵێین، وەک کۆیلەی ناتالیا ڤاسیلیڤنای لێ هاتبوو. ئەگەر بهاتبایە و ئەم ژنە داوایەکی زۆر ناڕەوا و دوور لە هەستی مرۆڤایەتی و تەنها لەبەر مەیلێکی پووچی ژنانەی خۆی بکردایە، ئەوا ڤێلچانینۆڤ، بێ ئەوەی بیری لە دەرئەنجامی ئەم کارە بکردایەتەوە، بێ سێ و دوو ئامادە بوو سەری خۆشی لە ڕێگەی ئەنجامدانی ئەو کارەدا دابنایە و بە هیچ شێوەیەکیش بەلایەوە گرنگ نەدەبوو، ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگ بوو، تەنیا ئەوە بوو کە چۆن دڵی ئەو ژنە ڕازی بکات.

هەڵبەت هەرگیز پێشتر هەستێکی هاوشێوەی ئەم هەستەی ئێستای نەبووبوو. لە کۆتاییی ساڵەکەدا، کە کاتی

لێکجیابوونەوەیان چیی تر کاری نەکردەنی نەبوو، دەبوو هەر لێک جیا ببوونایەتەوە، هاتنەپێشەوەی وەها ساتێکی چارەنووسساز، ڤێلچانینۆڤی لە غەم و پەژارە و نائومێدییەکی قووڵدا نغرۆ کرد، هەرچەند ماوەی لێکدابڕانەکە زۆر کورتیش دەهاتە پێشچاو، بەڵام چەندین جار پێشنیاری ئەوەی بۆ ناتالیا ڤاسیلیڤنا کرد، کە مێردەکەی جێ بهێڵێت و پشت لە هەموو شت بکات و لەگەڵیدا بەرەو دەرەوەی وڵات بۆ هەتاهەتایە هەڵبێن. بەڵام بەهەندوەرنەگرتنی ئەم قسەیە و ڕاڕاییی ئەم ژنە (کە ڕەنگە سەرەتا وەک گاڵتە، یان بە هۆی جاڕزبوونی لە زۆریی دووبارەبوونەوەی ئەم داوایەی ڤێلچانینۆڤ، ڕەنگە بەتەواوی ئەم پێشنیارەی پەسەند بکردایە) ئەمە بوو کە وای لە ڤێلچانینۆڤ کرد بەناچاری دەست لەم داوایەی بشوات و دواجار بەتەنیا خۆی ئەم گەشتە بکات.

لە ڕاستیدا هەمووی دوو مانگێک تێپەڕ نەببوو، کاتێک لە پترسبۆرگ ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکرد و هەرگیزیش نەیتوانی وەڵامێکی بۆ بدۆزێتەوە. "هەر بەڕاست ئەو ئەو ژنەی خۆش ویستووە یان تۆ بڵێی ئەمە تەنها لە مەیلێکی *هەرزەکارانە* زیاتر، چیی دی نەبووبێت؟" هەڵبەت ڤێلچانینۆڤ ئەم پرسیارەی لە دێوانەیی یان لەوەی عەشقی یەکێکی تر هاتبێتە سەر ڕێی، نەدەکرد. تەواوی ئەو دوو مانگەی سەرەتا، کە گەڕابۆوە بۆ پترسبۆرگ، لەناو جۆرە سڕبوونێکدا نغرۆ ببوو، کە هیچ ئافرەتێک بەدەگمەنیش نەیدەتوانی سەرنجی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، لەگەڵ ئەوەی سەرلەنوێ و بەخێرایی توانیی پەیوەندییە کۆنەکانی نوێ

بکاتەوە و دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسابوو، کە دەست لەگەڵ سەدان ئافرەتی جوان تێکەڵ بکاتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەو پرسیار و دڕدۆنگییەی لەلای دروست ببوو، دەیزانی ئەگەر بێت و دەرفەتی ئەوەی بۆ بێتە پێشەوە و سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ شاری ت... ئەوە ڕاستەوخۆ یەخسیری داوی فێڵبازانەی ئەو ژنە دەبێتەوە. جوانیی ئەم ژنە بە شێوەیەک کاری لە دڵی کردبوو، کە تەنانەت هەتا پێنج دانە ساڵی ڕەبەق، هەر لەسەر ئەم بڕوایەی خۆی مایەوە. بەڵام لەدوای ئەو پێنج ساڵەوە، چیی تر ئەم بابەتە جێگەی سەرنجی نەبوو، بەڵکوو ئەم بابەتە بەتەواوی ببووە جێگەی ڕقلێبوونەوەیەکی زۆر، هەرکات ئەم ژنەی وەبیر بهاتایەتەوە، وای لێ هاتبوو تەنانەت ڕقی لە خۆشی بێتەوە. هەرچەند بیری لەو یەک ساڵە دەکردەوە، کە لە شاری ت بەسەری بردبوو، لە حاڵی خۆی تەریق دەبۆوە. هەرچەند بیری دەکردەوە، لەوە نەدەگەیشت کە چۆنچۆنی کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەم سۆزە *گەمژانە*یەوە و خەریک بوو لە داخان مێشکی دەتەقی، نەیدەتوانی باوەڕ بەوە بکات، کە ئەوە ئەم بووە ئاوا کەوتۆتە ژێر کاریگەریی سۆزێکی لەو شێوەیەوە. هەرچیی یادەوەرییەک لەو ئەشقەدا هەیبوو، کاتێک بیری دەکەوتەوە، هەمووی بێمانا و هەرزەکارانە دەهاتە پێشچاوی، هەرکاتێک ئەم شتانەی بیر دەکەوتەوە، ڕوخساری لە تەریقیدا سوور هەڵدەگەڕا و تا ئەو ئاستەی خەریک بوو دەیخستە گریان، هەموو ئەو یادەوەرییانە ببوون بە ئازار و ویژدانی بەتوندی ئازار دەدا. ڕاستە چەند ساڵێک دواتر، بە شێوەیەک لە شێوەکان، ئارامتر ببوویەوە، سەرلەنوێ

هەوڵی دا هەموو شت لەبیر بکات و تا ڕادەیەکیش ئەوەی بۆ چووە سەر. بەڵام ئێستا، وا لەناکاو دوای تێپەڕبوونی نۆ ساڵ، سەرجەم ئەو ڕووداوانە بە شێوەیەکی زۆر نامۆ لەگەڵ هەواڵی مەرگی ناتالیا ڤاسیلیڤنا، کە شەوی پێشتر پێی ڕاگەیەندرا، سەرلەنوێ زیندوو دەبنەوە.

ئێستا کە لەسەر جێگەی خەوەکەی دانیشتبوو، کۆمەڵێک بیرەوەریی تێکەڵوپێکەڵ بە یەک جار شاڵاویان بۆ مێشکی هێنابوو، لەنێوان هەموو ئەو بیرەوەرییە تێکەڵوپێکەڵانەی شاڵاویان هێنابوو بۆ مێشکی، تەنها هەستی بە یەک شت دەکرد و پەیی بە یەک شت دەبرد. ئەویش ئەوە بوو، ڕاستە سەرەڕای ئەوەی بیستنی هەواڵەکەی شەوی ڕابردوو لە سەرەتادا تاساندی، بەڵام لە ڕاستیدا مردنی ئەو ژنە بە هیچ شێوەیەک نەبووە مایەی جاڕزبوونی، بگرە تا ڕادەیەکیش هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد و لە خۆی دەپرسی، "ئەرێ هەر بەڕاست، ئەوە منم کە بە هیچ شێوەیەک هەستم بۆ مردنی ئەو ژنە ناجووڵێت و بۆی بەداخ نیم؟" ئەمە ڕاستی بوو، کە چیی تر ئەو هیچ هەست و کینەیەکی لە دڵدا بەرامبەر بەو ژنە نەمابوو. هەر بۆیە ئێستا دەتوانێت بە خەیاڵێکی زۆر ئاسوودەوە سەبارەت بەو ژنە دادوەریی خۆی بە شێوەیەکی بێلایەنانە و دادپەروەرانە بکات.

بڕوایەک، کە لە ماوەی ئەم نۆ ساڵەی ڕابردوودا بۆی دروست ببوو، ئەوە بوو کە ناتالیا ڤاسیلیڤنا لە چینێکی هەرە سادە و ئاساییی خانمانی گوندی بوو، بەڵام لەناو هەموو خانمە گوندییەکاندا جیاواز بوو، تا ڕادەیەکی زۆر لەوان جیاواز بوو وەک ئەوەی لەناو کۆمەڵگەیەکی

شکۆداردا پەروەردە کرابێت (کێش ناڵێت هەر بەڕاستی ئەم خانمە خۆی لە بنچینەوە کەسێکی خانەدان نەبووبێت؟ ڕەنگە ئەسڵەن هەر واش نەبێت و ئەوە تەنها بیرۆکەیەکی خەیاڵی بێت، کە من لە مێشکی خۆمدا بۆ ئەوم درووست کردبێت!) بە هەرحاڵ، ڤێلچانینۆڤ سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هەمیشە پێی وا بووە کە کەموکورتی و هەڵەیەک هەیە لە تێڕوانینەکانی بەرامبەر بەو ژنە، هەرچەندە ئێستاشی لەگەڵدا بێت، کە هێشتاش هەستێکی بەرامبەر بەو ژنە هەر لە دڵدا مابوو، بەڵام ڕاستییەکان پێچەوانەی ئەم هەستەیان دەسەلماند.

ئەم باگاوتۆڤەش بە هەمان شێوە لەگەڵ ئەم ژنە، پەیوەندییەکی ژێربەژێری چەندساڵەی لەگەڵ درووست کردبوو، ڕەنگە ئەویش بە هەمان شێوە کەوتبێتە "ژێر کاریگەریی جوانیی ئەم ژنەوە." ڕاستییەکەی، هەرچەندە باگاوتۆڤ سەر بە بەرزترین و شکۆدارترین چینە کۆمەڵایەتییەکانی پترسبۆرگ بوو، لە خێزانێکی خانەداندا گەورە ببوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، تا بڵێی کەسێکی مێشک پووت بوو هەر وەک ڤێلچانینۆڤ، کە هەمیشە وای پێ دەوت، تەنها لە پترسبۆرگ دەیتوانی ژیانێکی سەرکەوتووانەی هەبێت و بژی. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، پترسبۆرگ پشتگوێ دەخات و قوربانی بە هەموو شتە گرنگەکانی ژیانی خۆی دەدات و پشت لە هەمووی دەکات، تەنها لەپێناو ئەم ژنەدا! پێنج دانە ساڵی ڕێک لە تەمەنی خۆی لە شاری ت بەفیڕۆ دابوو. بەڵێ، دواجار دەگەڕێتەوە بۆ پترسبۆرگ، بەڵام ڕەنگە هۆکاری گەڕانەوەکەی ئەوە بووبێت، کە چیی تر

ئیشیان پێی نەمابێت و وەک تاکەپێلاویکی دڕاو و بێکەڵک فڕێ درابێتە دەرەوە. کەواتە هەر بەڕاستی دەبێت شتێکی ناوازە و تایبەت لەناو ئەم ژنەدا بوونی هەبووبێت، کە ئەویش ڕەنگە هێزی سەرنجڕاکێشان و یەخسیرکردن و زاڵبوون بەسەر دڵ و بیروهۆشی پیاواندا بووبێت!

بەڵام سەرەڕای ئەمەش، وا دەر نەدەکەوت ئەم ژنە ئەم توانایەی هەبێت، واتە سەرنجڕاکێشان و توانای یەخسیرکردن. تەنانەت هێندە جوانیش نەبوو. ڕەنگە هەر هیچ جوانییەکی نەبووبێت. بۆ یەکەم جار کە ڤێلچانینۆڤ ناسیی، تەمەنی تەنیا بیستوهەشت ساڵێک دەبوو. بە شێوەیەکی گشتی هێندە جوان نەبوو، بەڵام هەندێک جار کە ڕوخساری دەجووڵاند، جوانییەکی دڵڕفێنی پێ دەبەخشی، چاوەکانی جوان نەبوون، جۆرێک لە توندوتیژیی بێئەندازەی تێدا دەبینرا. زۆریش جەستەی لاواز بوو، لە ڕووی ڕۆشنبیرییشەوە باش پەروەردە نەکرابوو، بەڵام ژیرییەکەی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، بیرکردنەوەکانی یەکلایەنە بوو، زۆریش پێداگریی لە بیرۆکەکانی خۆی دەکرد. هەرچەندە هەندێک جار هەڵسوکەوتەکانی وەک هەڵسوکەوتی خانمێکی گوندی وا بوو، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی و جیاواز، ڕاستە ئەو هەڵسوکەوتی بەم شێوەیە بوو، بەڵام تا بڵێی کەسێکی بەئاوەز بوو، بەتایبەت لە بابەتی جلوبەرگپۆشیندا، چونکە بەڕاستی لە هەڵبژاردنی ئەو جلانەی لەبەری دەکردن، سەلیقەیەکی زۆر بێوێنەی هەبوو. لە ڕاستیدا هەستێکی هونەریی تایبەت بە خۆی هەبوو. سروشتەکەشی سروشتێکی بڕیاردەرانە و زۆریش سەپێنەرانە بوو. هیچکات نەدەتوانرا

بەئاسانی سازشی لەگەڵدا بکرێت لەسەر شتێک یان هەموو شتێک یان هیچ شتێک." لە کاتە دژوارەکاندا زۆر چەلەنگ و چاونەترس و بەهێز بوو، سەرەڕای ئەوەی زۆر بەخشندە بوو، لە هەمان کاتدا زۆریش بێویژدان بوو. مشتومڕکردن لەگەڵ ئەم ئافرەتە کاری نەکردەنی بوو؛ هەتا ئێوارە بتوتایە دوو کەڕەتی دوو دەکاتە چوار، ئەگەر بهاتایە و خۆی نەیوتایە دەکاتە چوار، هێز نەبوو ئەوە بخاتە مێشکیەوە کە دەکاتە چوار، چونکە لە ڕاستیدا بۆ ئەو، جگە لەوەی لە بیری خۆیدا بوو، هەموو شتێکی تر لای بێمانا بوو. هەرگیز بۆ هیچ شتێک خۆی بە خەتاکار و جێڵۆمە نەدەزانی. هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان ناپاکییە بەردەوامەکانی دەرهەق بە مێردەکەی، بۆ ساتێکیش چییە، ویژدانی ئازار نەدابوو. بۆ نموونە، ڤێلچانینۆڤ بە بڕوای خۆی ناتالیا ڤاسیلیڤنای بە خاتوو مەریەمی پاکیزە دەچوواند و لەو بڕوایەدا بوو لەو بچێت، هۆکاری ئەم لێکچوواندنەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە خاتوو مەریەمی پاکیزە وا بڕوای بە خۆی هێنابوو، کە دایکی خودایە – بە هەمان شێوەش، ناتالیا ڤاسیلیڤناش لە ناخی خۆیدا بڕوای بە خۆی هێنابوو، کە هەموو ئەو شتانەی ئەیکات، هیچی هەڵە نییە.

زۆر بەوەفا بوو لەگەڵ دۆستەکەیدا، بەڵام هەتا ئەو شوێنەی دۆستەکەی لە گوێڕایەڵیی دەر نەچووایە و بێزاری نەکردایە. زۆر چێژی لەوە دەبینی، کە دۆستەکەی ئازار بدات، بەڵام بەباشییش شارەزای ئەوە بوو، کە چۆن ئاشتیان بکاتەوە و دڵیان بەدەست بهێنێتەوە.

ئەو ژنە سروشتێکی هەستەوەر، دڵڕەق، تا ڕادەیەکی

زۆریش حەشەریی هەبوو. ڕقی زۆر لە بەدڕەوشتی بوو و زۆر بەتوندییش بەگژیدا دەچووەوە و ئیدانەی دەکرد، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو، کە خۆی کەسێکی بەدڕەوشت بوو! بەڵام هیچ جۆرە ڕاستییەک نەیدەتوانی لە بەدڕەوشتییەکانی خۆی بەئاگای بهێنێتەوە. هەر زۆر بەسادەیی نەیدەزانی کە ئاوایە. ڤێلچانینۆڤ، ئەو کاتەی هێشتا لە شاری ت بوو، بەم شێوەیە بیری دەکردەوە، (بەڵام ئەبێت پێشتر ئاماژە بەوە بکەم، کاتێک ئەمەی دەوت، کە خودی خۆشی بەشدار بوو لە داوێنپیسییەکانی ئەو ژنە) دەیوت، "ئەمە لەو جۆرە ژنانەیە، کە دەڵێی بۆ ئەوە لەدایک بوون کە ناپاکی لە مێردەکانیان بکەن." ئەم جۆرە ئافرەتانە هەرگیز نابن بە قەیرە، ئەم جۆرانە یاسای سروشتەکەیان وەهایە، کە شوو بکەن، دوای شووکردنیش مەرامەکانی خۆیان بەدی بهێنن. مێردەکانیان یەکەم خۆشەویستیانن، بەڵام تا ئەو کاتەی شوویان پێ نەکردوون، دوای شووکردن پێیان، باسێک لەم خۆشەویستییە بوونی نامێنێت. هیچ کەسێک هێندەی ئەم جۆرە ئافرەتانە بە کارامەیی و ئاسانی شوو ناکەن. بۆ یەکەم ناپاکییشیان کە ئەنجامی دەدەن، هەمیشە مێردەکەیان سەرکۆنە دەکەن، دواتر تا ماوەیەکی باش هەموو شتێک بە ڕاستگۆیی و وەفاداری دەڕواتە پێش. لە کۆتایشدا هەمیشە خۆیان لە سەددا سەد بە ڕاست دەزانن و بە دڵنیاییشەوە بەتەواوی خۆشیان بە پاک و بێگوناه دەزانن.

ڤێلچانینۆڤ بەتەواوی بڕوای بەوە هەبوو، کە نموونەی گەلێک لەم جۆرە ژنانە، هەر بەڕاستی بوونیان هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا بڕواشی بەوە هەبوو، کە کۆمەڵە

پیاوێکیش لەبەرامبەر ئەم جۆرە ژنانەدا بوونیان هەیە، کە چارەنووسیان تەنیا ئەوەیە بۆ هەمیشە لەگەڵ ئەم جۆرە لە ژنان ژیان بەسەر بەرن. ئەگەر بە شێوەیەکی تر گوزارشتی لێ بکەین، بە ڕای ڤیلچانینۆڤ، ئەرکی سەرەکیی ئەم جۆرە مێردانە ئەوەیە، کە مێردی هەمیشەیی بن، یان ڕوونتر بڵێین، کە ئەمانە لە مێردێکی کارتۆنی زیاتر، هیچی دی نین. "ئەم جۆرە لە پیاوان بۆ ئەوە لەدایک دەبن و گەورە دەبن، تەنیا بۆ ئەوەی یەک جار لە ژیانیاندا هاوسەرگیری بکەن و ببن بە مێرد و دواتریش دەبن بە داردەستی ژنەکانیان. هەرچەند ئەگەر بەڕێکەوت ئەم جۆرە پیاوانە خاوەنی جۆرە کەسایەتییەکی تایبەت بە خۆشیان بن و پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرزیشیان هەبێت، بەڵام ئەمە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، کە لە کەسێکی کارتۆنی و بێدەسەڵات بەرامبەر بە ویستی ژنەکانیان، لە ڕووکەشێک زیاتر، چیی دی نین. هەر وەک چۆن خۆر ناتوانێت بەر بە ڕۆشنایی خۆی بگرێت، ئەم جۆرانەش ناتوانن لەو شەرمەزاری و ڕسواییانەی بە هۆی ژنەکانیانەوە بۆیان دروست دەبێت، هەڵبێن، هەمیشە وەک کەسێکی سەرشۆڕ و سووک لەناو کۆڕ و کۆمەڵدا لێیان دەڕوانرێت. هەرچەند هەمیشە ئاگاداری ئەوەشن کە چی ڕوو دەدات، بەڵام هەمیشە خۆیان لە گێلی دەدەن و وەک ئەوەی نە بایان دیبێت نە باران، یان ڕەنگیشە هەر بەڕاستی سروشتیان وا بێت، کە هەمیشە بێئاگا بن لەم شتانە."

ڤیلچانینۆڤ زۆر بەتوندی بڕوای بە هەبوونی ئەم دوو دەستەیە لە ژنان و پیاوان هەبوو، بڕواشی وا بوو کە پاڤێل

پاڤلۆڤیچ تروسۆتسکی، نموونەیەکی هەرە زیندووی ئەم دوو دەستەیەیە.

ئەو پاڤێل پاڤلۆڤیچەی شەوی پێشووتر لەوێ بوو، بەدڵنیابییەوە زۆر جیاواز بوو لەو پاڤێل پاڤلۆڤیچەی پێشتر لە شاری ت ناسیبووی. بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراوانە گۆڕابوو. بەڵام ڤێلچانینۆڤ باش دەیزانی ئەو ناچار بووە و هەر دەبووایە ئاوا بگۆڕێت، کە ئەمەش لە ڕاستیدا بەتەواوی شتێکی سرووشتییە؛ ئەم بەڕێز تروسۆتسکییە ئەگەر بهاتایە تا ئێستاش ژنەکەی زیندووبا، ئەوا هەر وەک پێشتر چۆن بوو، ئا بەو شێوەیە لەسەر هەڵسوکەوتەکانی خۆی دەمایەوە. بەڵام ئەمەی ئێستا هەیە، ڕێک وەک ئەوەیە کە بەشێک بووبێت لە جەستەیەکی ساغ و لەناکاو ئەم بەشە جیا بووبێتەوە و سەربەخۆیی بەدەست هێنابێت، هەروەها بەتەواوی بووبێت بە بوونەوەرێکی زۆر سەرسووڕ هێنەر و تا بڵێی جیاوز لەوەی پێشتر.

بەڵام سەبارەت بە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە لە ڕابردوودا لە شاری ت بوو، ڤێلچانینۆڤ بەم شێوەیە ڕابردووی ئەم پیاوەی لەبیر بوو و ئێستا بەم شێوەیە بیری دەکەوتەوە: "بەدڵنیابییەوە لە شاری ت، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، زۆر بەسادەیی ئەتوانم بڵێم، لە مێردێک زیاتر، چیی دی نەبوو. ئەگەریش بۆ نموونە، بشڵێین فەرمانبەر بووە و بەباشی خزمەتی کردووە، ئەوە لە ڕاستیدا بە ویست و بە خۆشیی خۆی نەبووە، بەڵکوو ئەمەش ناچاریی ژیانی ژن و مێردایەتی ئەمەی پێ کردبوو. لە ڕاستیدا بۆیە خزمەتی دەکرد، ئەمەش هەر لەبەر خاتری ژنەکەی و پێگەی کۆمەڵایەتیی ژنەکەی لە شاری ت

بوو. بۆیە ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو، کە لە ناخی خۆیدا هەست بە دڵگەرمی و چێژ بکات سەبارەت بە ئەرکەکەی. ئەوکات تەنیا تەمەنی سیوپێنج ساڵێک دەبوو، کە سەروەت و سامانێکی گچکەی بۆ خۆی پێکەوە نابوو. هەرچەند لەو بەشەی ئەو کاری تێدا دەکرد، هێندە بەتوانا نەبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا کەموکوورییشی نەبوو. بەردەوام هاموشۆی خانەدانەکانی دەکرد و تێکەڵاویان دەبوو. بە کەسێکی زۆر دەستودڵفراوان ناوبانگی دەر کردبوو، بەم هۆیەشەوە لە شاری ت ڕێزێکی زۆر لە ناتالیا ڤاسیلیڤنای خێزانی دەگیرا. بەڵام هەرچۆنێک بێت، ناتالیا ڤاسیلیڤنا ئەم ڕێزگرتنەی زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو، کە لە دەرەوە بەرامبەری دەنوێنرا، بەڵکوو زۆر بەسادەیی پێشی وا بوو، کە ئەمە ئەرکە لەسەر ئەو خەڵکە و پێویستە لەسەریان ڕێزی بگرن. هەرچەندە لە دەرەوە بەم شێوەیە بوو، بەڵام لە ماڵەکەی خۆیدا، تا بڵێی خانەخوێیەکی دڵفراوان و شیرین بوو بەرامبەر ئەو میوانانەی ڕوویان دەکردە ماڵەکەی. بە شێوەیەکی زۆر لێهاتووانە ڕاهێنانی بە پاڤێل پاڤلۆڤیچ کردبوو، بە شێوەیەکی وەها فێری چۆنێتیی هەڵسوکەوتکردن و وتووێژکردنی کردبوو، کە تەنانەت توانای ئەوەی هەبوو پێشوازی لە بەرزترین چینی خانەدان و بەگزادەکان بکات بەبێ ڕوودانی هیچ گرفتێک. ڕەنگە بەلای ڤێلچانینۆڤەوە، وەک مرۆڤێکی زۆر ژیر و لێهاتوو دەر کەوتبێت. بەڵام بە هۆی ئەوەی ناتالیا ڤاسیلیڤنا حەزی نەدەکرد مێردەکەی زۆربڵێیی بکات، لەبەر ئەوە ئاسان نەبوو بۆ یەکێک، کە بتوانێت بەئاسانی پەی بە زیرەکییەکانی ببات. هەرچەند ئەو هەندێک خەسڵەتی

سروشتیی زۆر باشی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەدەر نەبوو لە هەندێک خەسڵەتی خراپیش. بەڵام خەسڵەتە باشەکانی بەتەواوی لەژێر سێبەرێکی تاریکدا داپۆشرابوون، هەروەها خەسڵەتە خراپەکانیشی بە هەمان شێوە بەتەواوی خنکێنرابوون.

بۆ نموونە، ڤێلچانینۆڤ بیری ئەوەی دەکەوتەوە، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەندێ کات حەزی لەوە بوو سەر بخاتە سەر دراوسێکانی و گاڵتەیان پێ بکات، بەڵام ژنەکەی بە یەک چاولێزیتکردنەوە، لەم کارەی پاشگەزی دەکردەوە. یان هەندێک جار حەزی لەوە بوو چیرۆکی کورت یان قسەی نەستەق بکات، بەڵام بۆ ئەمەش، هەمیشە چاوی لەسەر بوو؛ تەنها رێی پێ درابوو چیرۆکگەلێکی کورت و گرنگ بگێڕێتەوە، کە پەیوەندیی بە باتێکی گرنگەوە هەبێت، کە لەو کاتە و لەو شوێنەدا باسی لەسەر دەکرێت. یان هەرکات رێک بکەوتایە کە بچووایەتە دەرەوەی ماڵ و لەگەڵ هەندێک لە هاورێکانی کەیفوسەفا بکات، حەزێکی زۆری هەبوو کە لەگەڵ هاورێکانی بخواتەوە، هەرچەند دەیتوانی زۆریش بخواتەوە لەگەڵ هاورێکانی، بەڵام ئەم حەزەشی وەک تەواوی حەزەکانی تری، بە هۆی ترسی لە ژنەکەی، لە گۆڕ نرابوو. هەرچەند ئەگەر بەرووکەش لێت بڕوانییایە، نەتدەتوانی بەئاسانی پەی بەوە ببەیت، کە ئەم پیاوە دەستەمۆی ژنەکەیەتی و ناوێرێت بێ پرسی ژنەکەی پەنجە لە ئاو بکات. هەروەها ناتالیا ڤاسیلیڤنای ژنیشی وا خۆی نیشان دەدا، کە بەڕاستی ژنێکی گوێڕایەڵە بەرامبەر بە مێردەکەی، هەر بەڕاستییش وا بڕوای بە خۆی هێنابوو، کە بەو شێوەیەیە.

ڕێی تێ دەچوو پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەر بەڕاستی شێتانە ناتالیا ڤاسیلیڤنای خۆش ویستبێت، بەڵام لە توانای کەسدا نەبوو پەی بەم خۆشەویستییە ببات، لە ڕاستیدا شتێکی هێندە دژوار نەبوو کە پەی بەم هەستە شێتانەیەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ ببرێت، بەڵام ڕەنگە بە هۆی ئەو ئامادەکارییە پێشوەختانەیەی ناتالیا سەبارەت بەمە کردبووی، وای کردبوو بەڕاستی دژوار ببێت و ئاسان نەبێت بۆ هیچ کەسێک پەی بەم هەستە ببات. لەو ماوەیەی ڤێلچانینۆڤ لە شاری ت بەسەری بردبوو، چەندین جار ئەم پرسیارەی لە خۆی کردبوو، کە ئایا تۆ بڵێی مێردی ئەم ژنە بچووکترین گومانی لە پەیوەندیی نێوان من و ژنەکەی خۆی نەکردبێت. زیاد لە چەندین جاریش ئەم پرسیارەی زۆر بەپێداگرییەوە ئاڕاستەی ناتالیا ڤاسیلیڤنا کردبوو، بەڵام هەمیشە هەر هەمان وەڵامی بەوپەڕی پەستی و تووڕەیییەوە دەست دەکەوت، کە مێردەکەی هیچ شتێک سەبارەت بە پەیوەندییە نهێنییەکەیان نازانێت و هەرگیزیش ناتوانێت هیچ شتێکی دەربارە بزانێت. ناتالیا هەمیشە دەیوت، "لە ڕاستیدا ئەم کارانە پەیوەندیی بەوەوە نییە." یەکێک لەو خەسڵەتانەی لەم ژنەدا هەبوو لە هاوشێوەکانی جیا دەکردەوە، ئەوە بوو هەرگیز پشتی مێردەکەی نەدەدا لە زەوی و هەرگیز پێی پێنەدەکەنی و لەژێر هیچ بارودۆخێکدا ئامادە نەبوو بچووکترین گاڵتەی پێ بکات و هیچ شتێکی لە مێردەکەیدا بە مایەی پێکەنین و گاڵتەپێکردن نەدەزانی. ئەگەریش بهاتایە و کەسێک جورئەتی ئەوەی بکردایە بچووکترین جەسارەتی بەرامبەر بە مێردەکەی بکردایە، ئەوا ناتالیا زۆر بەتوندی بەرگری لە

مێردەکەی دەکرد و نەیدەهێشت کەسی گاڵتەپێکەر بەئاسانی قوتاری ببێت، کارێکی پێ دەکرد، با بە دەواری شەڕی نەکردبێت.

لەبەر ئەوەی منداڵی نەبوو، بە شێوەیەکی سروشتی وەک ئافرەتێکی خانەدان و خۆشگوزەران ژیانی بەڕێ دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ژیانی ماڵەوەشی وەلا نەنابوو، بەڵکوو کاروباری ماڵەوەش لەلای ئەو، تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، زۆریش گرنگیی پێ دەدا. خۆشییە کۆمەڵایەتییەکانی هەرگیز نەیبووە هۆکاری ئەوەی ماڵوحاڵەکەی خۆی بەتەواوی پشتگوێ بخات، بەڵکوو ئەو کاتانەی لە ماڵەوە بووایە، خۆی بە ڕێکخستن و ڕێکوپێککردنی ناو ماڵەکەی و هەندێک کاروباری تری ژنانەوە خەریک دەکرد و بەباشی ماڵەکەی خزمەت دەکرد. شەوی پێشوو، کاتێک پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەناو ئەو بیرەوەرییانەی کە دەیگێڕانەوە، لە شوێنێکدا باسی لەو ئێوارانە کرد، کە لەدەوری یەک کۆ دەبوونەوە و شتیان دەخوێندەوە، ئەمە ئەو کاتانە ڕووی دەدا، کە هەندێک جار ڤێلچانینۆڤ بە دەنگی بەرز شتی بخوێندایەتەوە، هەندێک جاریش پاڤێل پاڤلۆڤیچیش، تەنها بۆ ئەوەی ڤێلچانینۆڤ سەرسام بکات، بە دەنگێکی ڕەوان و بەرز دەیخوێندەوە. لە هەمان کاتدا ناتالیا ڤاسیلیڤناش بەدەم کاری دروومانەوە، هەمیشە بە ئاسوودەیی و هێمنییەوە گوێی لێ دەگرتن. هەندێ کات ڕۆمانێک لە ڕۆمانەکانی چارڵز دیکنزیان دەخوێندەوە، یان هەندێک ستوونی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ڕوسیایان دەخوێندەوە، تەنانەت هەندێک جار بابەتگەلی زۆر گرنگیشیان دەخوێندەوە. ناتالیا ڤاسیلیڤنا ئاستی ڕۆشنبیریی

ڤیلچانینۆڤی بەرز دەنرخاند. بەڵام بەهێمنی و بێ ئەوەی ئەمە دەر ببڕێت، تەنیا لە ناخی خۆیدا ئەم بەرزنرخاندنەی دەکرد. لە ڕاستیدا ناتالیا ڤاسیلیڤنا بە شێوەیەکی گشتی بایەخێکی ئەوتۆی نەدەدا بە بابەتگەلی ڕۆشنبیری و ئەدەبیات، لە ڕاستیدا وەک ئەوەی بڕیاری کۆتاییی لەسەر ئەو بابەتە دابێت و جێگەی قسەلەسەرکردنیش نەبێت، تەنانەت ئەگەر شتێک لەو بابەتانە سوودیشی هەبووایە بۆی، ئەم هێشتاش هەر بایەخی پێ نەدەدا و بەلایەوە گرنگ نەبوو، بەڵام ئەم شتە تەواو پێچەوانە بوو لەلای پاڤێل پاڤلۆڤیچ، زۆربەی جارەکان تامەزرۆییەکی زۆری نیشان دەدا سەبارەت بە بابەتە ڕۆشنبیری و ئەدەبییەکان.

پەیوەندییەکەی ڤیلچانینۆڤ، کە لە شاری ت لەگەڵ ئەو خێزانە هەیبوو، لە ناکاو کۆتایی هات، ئەمە لە کاتێکدا ڕووی دا، کە خۆشەویستییەکەی ڤیلچانینۆڤ گەیشتبووە دواترۆپکی خۆی، بگرە نزیکی شێتی ببووەوە. لە ڕاستیدا زۆر لەناکاو و بەسانایی وەدەر نرا. هەرچەندە هەموو شتەکان بە شێوەیەکی وا ئامادەکاریی بۆ کرابوو، کە لە کاتی ڕۆشتنیدا هەست بەوە نەکات کە هەر بەڕاستی وەدەر نراوە، نەوەک بە خواستی خۆی ڕۆشتبێت، هەر وەک تاکە پێڵاوێکی دڕاو و بێکەڵک فڕێ دراوەتە دەرەوە.

شەش هەفتە بەر لە ڕۆیشتنەکەی، سەروکەللەی ئەفسەرێکی لاو دەر کەوتبوو، کە هێندە نەدەبوو مەشقە سەربازییەکانی لە یەکەی تۆپهاوێژی لە یەکێک لە کۆلێژە سەربازییەکان تەواو کردبوو، گەیشتبووە شاری ت، هەروەها فێر ببوو زووزوو سەردانی خێزانی تروسوتسکیی دەکرد.

چیی تر ماڵەکە بەوەوە پێک هاتبوو، لە چوار کەس نەک سێ کەس. ناتالیا ڤاسیلیڤنا بە ڕوویەکی تا بڵێی خۆش و دڵفراوانانەوە پێشوازیی لەم لاوە دەکرد، ڕاستییەکەی، وەک منداڵێک هەڵسووکەوتی لەگەڵدا دەکرد.

ڤێلچانینۆڤ لە تەواوی ئەو ماوەیەی ئەو ئەفسەرە لاوە سەردانی ماڵەکەی تروسوتسکیی دەکرد، بچووکترین گومان چییە، لە مێشکیدا بەرامبەر ئەو لاوە بۆی دروست نەبووبوو، لە ڕاستیدا ئەو کۆمەڵە شتێکی تر بیری سەرقاڵ کردبوو، بۆیە دەرفەتی ئەوەی نەبوو، کە بیری خۆی بەوەوە سەرقاڵ بکات. لەبەر ئەوەی لەناکاو پێی ڕاگەیەندرابوو، کە دەبێت هەرچی زووترە، بڕوات و ڕۆیشتنەکەشی جێگەی مشتومڕ نەبوو، هەر دەبوو بڕۆیشتبا. یەکێک لەو سەدان بیانووانەی ناتالیا ڤاسیلیڤنا وەکوو بیانوویەک بۆ هەرچی زووتر ڕۆشتنەکەی دەهێنایەوە، ئەوە بوو کە باوەڕی بە خۆی هێنابوو سکی لیی پڕە، هەر لەبەر ئەم هۆکارە، شتێکی سروشتی بوو کە هیچ نەبێت، بە لایەنی کەمەوە، بۆ ماوەی سێ یان چوار مانگێک خۆی لێ دوور بخاتەوە و لە بەرچاوان ون ببێت، ئا بەم شێوەیە ئەگەر دوای چەند مانگێکیش لە ڕۆیشتنی ئەو سکی بەتەواوییش پڕ ببێت، ئەو کاتە هەر قسەوقسەڵۆکێکیش بکرێت، ناتوانرێت هیچ گومانێک لە مێشکی مێردەکەیا دروست بکرێت بەرامبەری، هەرکاتیش بارودۆخەکە ئاسایی بۆوە، سەرلەنوێ دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ لایان. لە ڕاستیدا ئەمە بیانوویەکی زۆر لاواز بوو و نەدەچووە ئەقڵەوە. هەرچەند ڤێلچانینۆڤ بە هۆی ئەو ئاگری ئەشقەی لە دڵیدا داگیرسابوو، چەندین جار

پێشنیاری ئەوەی بۆ ناتالیا کردبوو، تا لەگەڵیدا بەرەو پاریس یان ئەمەریکا هەڵبێت، بەڵام لە کۆتاییدا ناچار بوو خۆی بە تاقی تەنێ بەرەو پترسبۆرگ بگەڕێتەوە، ئەمەش بەو مەرجەی ئەم دابڕانە تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت بێت؛ واتە تەنیا بۆ ماوەی سێ یان چوار مانگێک، ئەگین بەدڵنیاییەوە، سەرەڕای هەموو ئەو شێر و ڕێوییەی ناتالیا ڤاسیلیڤنا وەکوو بیانوویەک دەیهێنایەوە بۆ ئەم دابڕانە، مەحاڵ بوو لەژێر هیچ بارودۆخێکدا لەو ژنە جیا ببێتەوە.

ڕێک دوای دوو مانگ لە پترسبۆرگ، نامەیەکی لە ناتالیا ڤاسیلیڤنا بەدەست گەیشتبوو. لەو نامەیدا داوای لە ڤێلچانینۆڤ کردبوو هەرگیز نەگەڕێتەوە بۆ لای، چوون ئێستا ئاشقی یەکێکی ترە و دۆستێکی نوێی هەیە و ئەوی خۆش دەوێت، سەبارەت بە بابەتی سکپڕییەکەشی پێی ڕاگەیاندبوو، کە بەهەڵەدا چووە و هەرگیز سکپڕ نەبووە. هەڵبەت چیی تر ئەم زانیارییانە لای ڤێلچانینۆڤ بایەخیان نەبوو، هەمووی زیادە بوون، ئیتر هەموو شت وەک ڕووناکی ڕۆژ ڕوون و ئاشکرا بوو؛ یەکسەر ئەو ئەفسەرە لاوەی وەبیر هاتەوە، کە بەردەوام هاموشۆی ماڵەکەی تروسۆتسکی دەکرد... ئەم پرسە بۆ هەتاهەتایە بە خێر و خۆشی کۆتایی هات. چەند ساڵێک دواتر بیستییەوە، کە ئەو باگاوتۆڤەی پێشتر بە هۆی چارەنووسیکەوە پێی کەوتبووە ئەو شارەوە، ئەویش پێنج دانە ساڵی ڕێکی لەوێ بەسەر بردبوو. ڤێلچانینۆڤ ئەم پەیوەستبوونە و ئەم مانەوە درێژەی لەلای خۆی بەم شێوەیە لێک دەدایەوە، کە ڕەنگە بە هۆی ئەو ڕاستییەوە بێت، کە ناتالیا ڤاسیلیڤنا بە هۆی هەڵکشانی تەمەنی و

نزیکبوونەوە لە تەمەنی نائومێدی، بەدڵنیاییەوە وای لێ کردبوو زیاتر وەفادار ببێت بەرامبەر بە دۆستە نوێیەکەی.

نزیکەی کاتژمێرێک ڤێلچانینۆڤ بەم شێوەیە لەسەر جێگەی خەوەکەی مابووەوە. لە کۆتاییدا کەمێک بە خۆیدا هاتەوە و لە زەنگۆڵەکەی دا تا ماڤرا قاوەکەی بۆ بهێنێت، بەخێرایی قاوەکەی نا بە سەریەوە و ڕێک کاتژمێر یانزە، بۆ دۆزینەوەی هۆتێل پۆکرۆفسکی لە ماڵ دەر چوو. لە کاتی ڕۆشتنی بەرەو هۆتێلەکە، بیرۆکەیەکی تایبەتی هەبوو، کە هەر سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە بە بیریدا هاتبوو. بە جۆرێک لە جۆرەکان هەستی بە شەرمەزاری دەکرد لەو ڕەفتارە نەشیاوەی دوێنێ شەوی ڕابردووی، کە بەرامبەر پاڤێل پاڤلۆڤیچ نواندبووی، هەر بۆیە دەیویست هەرچۆنێک بووە، ئەمڕۆ چاوی پێی بکەوێت و هەموو ئەو شتانەی دوێنێ شەو ڕووی دابوو، بە جۆرێک لە دڵی دەر بکات و ئەو هەستە ناخۆشەی دروست ببوو، بیسڕێتەوە.

هەموو ئەو خەیاڵانەی دوێنێ شەوی ڕابردوو سەبارەت بە کیلۆنی دەرگاکە و ئەوەی ڕووی دا، هەمووی لە ڕێکەوتێک زیاتر، چیی دی نەبوو، یان ڕەنگە هەمووی بە هۆی شڵەژاویی بارودۆخی پاڤێل پاڤلۆڤیچەوە بووبێت و پێدەچوو شەوی ڕابردوو بەتەواوی مەست بووبێت، یان دەکرێت شتێکی جیاوازتر لە هەموو ئەو شتانەش بووبێت. بەڵام ئەوەی ڕوون نەبوو، بەڕاستی خۆشی نەیدەزانی بۆچی ئێستا دەیەوێت سەرلەنوێ چێوەیەکی نوێ بداتەوە بە پەیوەندییەک لەگەڵ ئەم بێوەپیاوەدا، لە کاتێکدا هەموو شت لەنێوانیاندا بە شێوەیەکی سروشتی بە خێر و خۆشی

کۆتایی هاتبوو. بەڵام پێدەچوو شتێک سەرنجی ڕاکێشابێت. هەستێکی زۆر سەیر و نامۆی لەلا دروست ببوو، پێدەچوو هەر ئەم هەستەش بێت، کە ئا بەم شێوەیە پاڵی پێوە دەنا، تا ئەم پەیوەندییە نوێ بکاتەوە.

# ٥

# ليزا

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو سەبارەت بەوەی کە جێگە و ڕێگەی خۆی بگۆڕێت، هەروەها هۆکاری ئەو پرسیارەی دوێنێ شەوی ڤێلچانینۆڤ بۆ گۆڕینی شوێنەکەی، هۆکارەکەی لەلا ڕوون نەبوو، مەگەر هەر خودا بۆخۆی بزانێت بۆچی وەها پرسیارێکی لێ کردووە. لە ڕاستیدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ هێندە هۆشی بەلای خۆیەوە نەبوو، تا بتوانێت سەرەداوێک لە هۆکاری کردنی ئەو پرسیارە بۆ خۆی وەچنگ بخات.

هەر بە یەکەم پرسیارکردنی لە ناوونیشانی شوێنەکە لە دوکانێکی بچکۆلەی نزیک کڵێسای پۆکرۆڤسکی، یەکسەر ئوتێلەکەیان نیشانی ڤێلچانینۆڤ دا، کە هەمووی دوو هەنگاوێک لە شەقامەکەی بەرامبەریەوە دوور بوو. ڕاستەوخۆ بەرەو ئوتێلەکە هەنگاوی نا و خۆی کرد بە ئوتێلەکەدا. لەناو ئوتێلەکەشدا پرسیاری ئەو ژوورەی کرد، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ لێی نیشتەجێیە. پێیان ڕاگەیاند کە بەڕێز ترۆسۆتسکی لە یەکێک لەو کوختانەدایە، کە نزیک گۆڕەپانی ئوتێلەکەیە

و لە یەکێک لە ژوورە پڕ لە کەلوپەلەکانی ماریا سیسۆڤنا دەژی. لە کاتێکدا بەسەر پلیکانە تەنگ و لەبەردروستکراوە تەڕ و پیسوپۆخڵەکەدا بۆ نهۆمی دووەم سەر دەکەوت، بۆ ئەو نهۆمەی ئەو ژوورانەی تێدا بوو، کە پڕ بوو لە کەلوپەلی ناوماڵ، لەناکاو دەنگی گریانێک هاتە بەرگوێی. دەنگی گریانەکە لە دەنگی گریانی منداڵێکی حەوت بۆ هەشت ساڵان دەچوو؛ دەنگەکە زۆر بەسوێ بوو، گوێی لە هەنسکی گریانێکی کپکراو بوو، کە لەگەڵیدا دەنگی پێکوتانبەزەویدا و هاوارێکی زۆر شێتگیرانە تێکەڵ بەو گریانە دەبوو، کە ئەویش بە هەمان شێوە بەکپی، بەڵام هەندێک جار بە دەنگێکی نووساو و لەپڕ دەنگەکە بەرز دەبۆوە و دەهاتە بەرگوێیان، ئاشکرا بوو ئەم دەنگەی دووەمیان دەنگی پیاوێکی تەواو پێگەیشتوو بوو. وا دەر دەکەوت پیاوەکە هەوڵی ئەوە بدات منداڵەکە بێدەنگ بکات و لە خەمی ئەوەدا بوو، کە کەسێک گوێی لە دەنگی گریەوزاری منداڵەکە ببێت. بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو، کە خۆی لەو کچە بچکۆلەیە زیاتر هاتوهاواری نابۆوە. هاوارکردنەکانی بەسەر ئەو کچە بچکۆلەیەدا، زۆر بێبەزەییانە بوو، دیار بوو کیژۆڵەکەش بەدەم هەنسک و قوڵپی گریانەوە داوای بەخشینی دەکرد. کاتێک ڤێلچانینۆڤ خۆی کرد بە ڕاڕەوە تەنگەکەدا لە بەشی سەرەوە، کە لە هەردوو لاوە دەرگای هەبوو، لووتی تەقی بە لوتی ئافرەتێکی لادێیی باڵابەرزی کەتەی پیسوپۆخڵەوە، کە تەمەنی دەوروبەری چل ساڵێک دەبوو، خێرا پرسیاری پاڤێل پاڤلۆڤیچی لێ کرد. ژنەکەش ئاماژەی بۆ ئەو دەرگایە کرد، کە دەنگی گریانەکەی لەپشتەوە لێوە دەهاتە دەر. لە ڕوخسارە قەڵەو و پەمەیییەکەی

ئەم ژنەدا جۆرێک لە بێزاری و نەفرەت دەبینرا، لە کاتێکدا بە پلیکانەکاندا دەڕۆیشتە خوارەوە، بە تورەییەوە وتی، "چاوتان لێیە چۆن خۆی سەرگەرم کردووە!"

ڤێلچانینۆڤ لەوەدا بوو لە دەرگاکە بدات، بەڵام خێرا لەو بڕیارە پاشگەز بۆوە و ڕاستەوخۆ، بێ ئەوەی لە دەرگاکە بدات، خۆی کرد بە ژوورەوەدا. پاڤێل پاڤلۆڤیچی بەرچاو کەوت لە ناوەڕاستی ژوورێکی بچووک و جەنجاڵ بە هەندێک کەلوپەلی ناو ماڵ، کە هێندە زەق و ناشرین بوو، مرۆڤ بە بینینی جاڕز دەبوو، کەلوپەلەکان بە ڕەنگێکی زۆر سادە نەخشێنرابوو، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە نە چاکەتی لەبەردا بوو، نە هێلەک، بەپێوە وەستابوو. ڕوخساری لە تووڕەییدا ڕەش داگەڕابوو، هەوڵی دەدا بە هاوارکردن و هەڕەشەکردن، یان بەو شێوەیەی ڤێلچانینۆڤ بیری لێ دەکردەوە، تەنانەت مشتیشی توند کردبۆوە تا بیوەشێنێت و ئەو کیژۆڵە هەشت ساڵەیەی پێ بێدەنگ بکات، کە جلوبەرگێکی شڕۆڵە و هەژارانەی لەبەردا بوو، جلەکانی جلێکی خانمانە بوو، عەزییەکی کورتی ڕەشی لەخووریدروستکراوی لەبەردا بوو. وا دیار بوو ئەو کچە بچکۆلەیە لە ترسا هەر بەڕاستی فێی لێ هاتبێت، بە شێوەیەکی شێتگیرانە هەنسکی دەدا و دەستە بچکۆلانەکانی ڕوو بە پاڤێل پاڤلۆڤیچ درێژ کردبوو، وەک ئەوەی بیەوێت لە ئامێزی بگرێت و ماچی بکات و دەستبەدامێن لێی دەپاڕایەوە، تا لێی خۆش ببێت سەبارەت بە شتێک. بەڵام لە یەک چرکەدا هەموو ئەم بارودۆخە لەناکاو گۆڕانی بەسەردا هات. هەر هێندەی کیژۆڵەکە ڤێلچانینۆڤی بەرچاو کەوت، قیژەیەکی کرد و بەرەو ژوورە گچکەکەی تەنیشت غاری دا،

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش، کە بۆ ساتێک وەک سەرلێشێواوی لێ هاتبوو، بەزۆر زەردەخەنەیەکی هێنایە سەر لێوەکانی. ڕێک وەک هەمان زەردەخەنەکەی شەوی ڕابردوو بوو، کاتێک ڤێلچانینۆڤ دەرگای سەر پلیکانەکانی لەناکاو بەخێرایی بە ڕوویدا کردبۆوە و ئەمیش زەردەخەنەیەکی لەم شێوەیەی بۆ کردبوو.

بەوپەڕی سەرسامییەوە هاواری کرد، "ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ! هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم بێیت... بەڵام بفەرموون، ئاوا لەوێدا ڕامەوەستن، بەتەواوی وەرنە ژوورەوە، تکا دەکەم بفەرموون! لەسەر ئەم چەرپایە یان وەرن لەسەر ئەم کورسییە دەسکدارە دابنیشن، منیش..."

هێندە بەشپرزەیی چاکەتەکەی لەبەر کرد، کە بیری چوو هێلەکەکەی لە ژێرەوە لەبەر بکات.

ڤێلچانینۆڤ لەسەر کورسییەکە دانیشت و وتی، "پێویست بە ڕەسمییات ناکات، چۆنن، هەر بەو شێوەیەی خۆتان بمێننەوە!"

"نا، نا! ڕێم بدەن با کەمێک ڕەسمییات بدەم بە خۆم، ئاوا بەم شێوەیە، ئێستا زیاتر بەڕێزتر و شیاوتر دەر دەکەوم. بەڵام بۆچی خۆت ترنجاندۆتە ئەو قوژبنەوە و لە دوورەوە دانیشتوویت؟ وەرن لەسەر ئەم کورسییە دەسکدارەی نزیک مێزەکە دابنیشن... زۆر باشە، ئەزانی هەر بەڕاستی هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم، کە تۆ بێیت بۆ ئێرە! هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان شێوە کە ئەم قسانەی دەکرد، لەسەر قەراغی کورسییەکی حەسیریی دەسکدار

دانیشت؛ لەتەنیشت میوانە چاوەڕواننەکراوەکەیدا نا، بەڵکوو بە شێوەیەک لەسەر کورسییەکە دانیشت، کە گۆشەی کورسییەکە ڕێک ڕووبەڕووی ڤێلچانینۆڤ بێت.

"بۆچی لەو باوەڕەدا نەبوویت کە دێم؟ بۆ مەگەر شەوی ڕابردوو پێم نەوتبوویت ئەمڕۆ و لەم کاتەدا دێم!"

"پێم وا بوو نایەیت؛ ئەم بەیانییە، کاتێک خەبەرم بۆوە و بەباشی بیرم لە هەموو ئەوەی دوێنێ شەوی ڕابردوو، کە ڕووی دا، کردەوە، بەڕاستی لێت ناشارمەوە، کە تەواو بێهیوا بووم لەوەی جارێکی تر سەرلەنوێ بتبینمەوە."

لە تەواوی ئەو کاتەی ڤێلچانینۆڤ هاتبووە ژوورەوە، هەر لە چواردەوری خۆی ورد دەبۆوە. ژوور هەمووی ترشابوو بەسەر یەکا، جێگەی خەوەکان ڕێک نەخرابوون، هەرچیی جلوبەرگ بوو، هەر پارچەیەکە لە شوێنێک فڕێ درابوو، لەسەر مێزەکەش، هەندێک کوپی لەسەر بوو، کە خڵتە و پاشماوەی قاوەی پێوە بەجێ مابوو، هەندێک وردەنان، هەروەها بوتڵێک شەمپانیای سەرنەنراوە، کە نیوەیی کرابوو، لەتەنیشتیشیەوە پەرداخێک دانرابوو. بە تیلەی چاویش لە ژوورە گچکەکەی تەنیشتی دەڕوانی، بەڵام بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر ئەو ژوورەدا، وا دیار بوو منداڵەکەش هەر لەو ژوورە گچکەیەدا خۆی حەشار دابووبێت، نووزەی لێوە نەدەهات.

لە کاتێکدا ڤێلچانینۆڤ ئاماژەی بۆ بوتڵە شەمپانیاکە دەکرد، وتی، "بەدڵنیاییەوە بڕوا ناکەم ئێستا ئەم بوتڵەت نیوە کردبێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەشێواوی وتی، "ئەوە پاشماوەی..."

"هەر بەڕاستی گۆڕاویت!"

"ڕاستییەکەی، ئەمە خوویەکی خراپە کە لەپڕ فێری بووم، بەڵێ، بڕواتان بێت بەڕاستمە و درۆ ناکەم! لەو ڕۆژەوە، من تووشی ئەم خووە بووم. ناتوانم بەر بە خۆم بگرم. بەڵام ئاسوودە بن، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، چوون من ئێستا بە هیچ جۆرێک سەرخۆش نیم. دڵنیاش بن لەوەی هیچ جۆرە قسەیەکی نابەجێ ناکەم وەک ئەوەی دوێنێ شەو کردم لە ماڵەکەتدا. بەڵام ئەوەی بە ئێوەی دەڵێم، ڕاستییەکەیەتی. ڕێک هەمووی لەدوای ئەو بەروارەوە بوو، ڕاستیتان بوێت، ئەگەر بهاتایە شەش مانگ لەمەوپێش کەسێک پێی بوتمایە بەم شێوەیە تێک ئەشکێم بەسەر یەکا، یان تەنانەت ئەگەر یەکێک ئەم ڕوخسارە و ئەم بارودۆخەی ئێستامی لە ئاوێنەیەکدا پێ نیشان بدامایە، دڵنیا بن هەرگیز باوەڕم نەدەکرد."

"کەواتە دانی پێدا دەنێیت، کە دوێنێ شەو سەرخۆش بوویت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێکی نزم، لە کاتێکدا لە تەریقیدا چاوی لە عەردەکە بڕیبوو، دانی پێدا نا، "بەڵێ، دانی پێدا دەنێم کە سەرخۆش بووم! بەڵام بەتەواوی نا، لەبەر ئەوەی چەند کاتژمێرێک بەر لەوەی بێم بۆ لات، خواردبوومەوە. ئەمەوێت ئەمەتان بۆ ڕوون بکەمەوە، لە ڕاستیدا ڕەنگە باوەڕ نەکەن، بەڵام بارودۆخی من هەتا ئەو کاتە باشە، کە سەرخۆش ببم، بەڵام کاتێک سەرخۆشی بەرم ئەدا، ئیتر ئەبم بە بوونەوەرێکی شەڕانی و دڵڕەق، وەک شێتم لێ دێت، پاشان زیاتر لەناو غەم و پەژارەکانی خۆمدا نغرۆ دەبم و زیاتر هەست بە پەژارەکانم دەکەم. ڕەنگە هەر ئەمە بێت کە وام

لێ دەکات پەنا بەرمە بەر خواردنەوە. ئێستا وام لێ هاتووە، هەموو جۆرە گاڵتەبازی و گەمژەیییەک ئەنجام دەدەم، لەخۆڕا شەڕ بە خەڵک دەفرۆشم لەسەر شتی هیچ. پێدەچێت دوێنێ شەویش کە هاتمە خزمەتتان، بە شێوەیەکی زۆر نامۆ خۆمم پێ ناساندبێتنەوە؟"

"وا هەست دەکەم دەتەوێت بڵێیت هیچت بیر نەماوە؟"

"بیرم نەمابێت! نا، لە ڕاستیدا هەموو شتێکم زۆر بەباشی بیرە..."

ڤێلچانینۆف بە دەنگێکی ئاشتکەرەوانەوە وتی، "دەبینیت، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، ڕێک بەو شێوەیە بوو، کە خۆم بیرم لێ کردبۆوە. لێتان ناشارمەوە، کە خودی بەندەش دوێنێ شەوی ڕابردوو کەمێک تەنگەجیکەڵدانانە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا کردن... زۆر بێئۆقرە بووم. خۆم دان بەمەدا دەنێم و ئەمەتان بەوپەڕی ڕاستگۆیییەوە پێ دەڵێم. هەندێک جار هەستێکی زۆر خراپم بۆ دروست دەبێت و هەست بە باشی ناکەم، پاشان بێقەزا بیت، هاتنە چاوەڕواننەکراوەکەی تۆش، بەو نیوەشەوە..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەرێکی ڕاوەشاند، وەک ئەوەی سەری لە خۆی سوور مابێت و بیەوێت لۆمەی خۆی بکات، وتی، "بەڵێ نیوە شەوبوو، نیوەشەو بوو! بریا دەمزانی چ هۆکارێک وای لێ کردم هەڵبستم بەم کارە! ڕاستییەکەی، ئەگەر خۆتان دەرگاکەتان لێ نەکردمایەتەوە، ئەوە زۆر دڵنیا بن کە بە هیچ کلۆجێک نەدەهاتمە ژوورەوە و هەر لە بەردەم دەرگاکەوە بە ڕێی خۆمدا دەگەڕامەوە. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، هەفتەی پێشووش سەردانم کردیت، بەڵام لە ماڵ نەبوویت. بەڵام ئەبووایە هەرگیز جارێکی تر نەگەڕامایەتەوە، لێتان ناشارمەوە، ئەلێکسی

ئیڤانۆڤیچ، سەرەڕای ئەو بارودۆخە ناهەموارەشی ئێستا پێیدا تێدەپەڕم، هێشتاش هەندێک هەستی خۆبەزلزانیم تێدا ماوە. بە هەمان شێوە ئەو کاتەشی لەسەر شەقامەکە، بۆ یەکەم جار چاومان بە یەکتری کەوت، لە دڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە و دەمگوت، 'باشە تۆ بڵێی هەر بەڕاستی نەمناسێتەوە، خۆ ئەگەر بیناسیمایەتەوە، بەدڵنیاییەوە بەو شێوەیە ڕووی لێ وەر نەدەگێڕام و خۆی لێ هەڵە نەدەکردم. بەڵام دواتر ئەموت، نۆ ساڵ لەیەکدابڕان گاڵتە نییە! ئاخر چۆن بتوانێت بەئاسانی بمناسێتەوە!' بۆیە هەرچۆنێک ئەمهێنا و ئەمبرد، بۆم لێک نەدەدرایەوە و نەمدەتوانی بڕیاری ئەوە بدەم، کە بێم بۆ لات یان نەیەم. دوێنێ شەوی ڕابردووش، زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە خۆمم لەو بەشەی پترسبۆرگ بینییەوە، هەر بەڕاستییش ئاگاداری کات نەبووم. هەموو ئەمەش کە ڕووی دا، بە هۆی ئەم نەفرەتییەوە ڕووی دا،" پەنجەی بۆ بوتڵە شەمپانیاکە درێژ کردبوو، "هەروەها بە هۆی هەست و سۆزە گەمژانەکەی خۆشمەوە! بەڵێ، بەڕاستی هەست و سۆزێکی زۆر گەمژانە! ئەگەر بهاتایە و ئەم کارەم لەگەڵ هەرکەسێکی دی، جگە لە تۆ، بکردایە، ئەوە بەدڵنیاییەوە هیچ ئومێدێکم بە دووبارەنوێکردنەوەی پەیوەندییەکانم نەدەبوو! بەڵام تۆ، سەرەڕای هەموو ئەو شتانەشی کە دوێنێ بە هۆی ڕەفتارە نابەجێکانی منەوە ڕوویاندا، تۆ لەبەر خاتری ئەو هاوڕێیەتیە لەمێژینەیەی پێشتر لەنێوانماندا هەبوو، گەورەیت نواند و ئەمڕۆ بە هاتنت بۆ ماڵەکەم سەرفرازت کردم."

ڤێلچانینۆڤ زۆر بەوردی گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو، پاڤێل پاڤلۆڤیچیش وا دیار بوو زۆر بە دڵسۆزی و

ڕاستگۆییەوە قسەکانی دەکات، تەنانەت بە جۆرێک لە ویقار و باوەڕبەخۆبوونەوە قسەی دەکرد، بەڵام هێشتاش ڤێلچانینۆڤ لەو کاتەوەی خۆی کردبوو بە ژوورەوەدا، باوەڕی بە یەک وشەش چییە، لە تەواوی قسەکانی کە گوێی لێ گرتبوو، نەکردبوو.

"پێم بڵێ بزانم، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کەواتە تۆ لێرە بەتەنیا ناژیت؟ ئەو کچە بچکۆلەیە کێیە، کە کەمێک لەمەوپێش لەلای تۆ بینیم؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ زۆر سەری لەو قسەیە سووڕما و برۆکانی بەرز کردنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بێ ئەوەی لەڕوو دابمێنێت و بە ڕوویەکی خۆشەوە سەیرێکی ڤێلچانینۆڤی کرد و بە زەردەخەنەیەکی زۆر شیرینەوە وتی، "مەبەستت چییە ئەم کچە بچکۆلەیە کێیە؟ بۆ مەگەر نازانیت ئەمە لیزایە!"

ڤێلچانینۆڤ، وەک ئەوەی شتێک ناخی بهەژێنێت، بەمینجەمینجێکەوە وتی، "کامە لیزا؟"

هەژاندنەکە زۆر لەناکاو بوو، کەمێک لەمەوپێش کە خۆی کرد بە ژوورەوەدا، چاوی بە لیزا کەوت، بەڕاستی تووشی سەرسووڕمان بوو، بەڵام بەدڵنیاییەوە هیچ جۆرە هەستێکی بۆ دروست نەبووبوو و هیچ بیرۆکەیەکی تایبەتی بەرامبەر ئەو کچە نەبوو.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەرلەنوێ زەردەخەنەیەکی بۆ کردەوە و وتی، "بەڵێ، ئەوە لیزاکەی خۆمانە، ئەوە لیزای کچمانە!"

ڤێلچانینۆڤ بە جۆرێک لە ترسنۆکی و گومانبردنێکی زۆرەوە و بە دەنگێکی لەرزۆک و نزمەوە پرسیی، "کچەکەتان! مەبەستت ئەوەیە کە تۆ و ناتالیا... ناتالیا ڤاسیلیڤنا منداڵتان هەبوو؟"

"ئەی چۆن، بەڵێ، بەدڵنیاییەوە! بەڵام لۆمەتان ناکەم، ئێوە مافی خۆتانە کە نەزانن، بەڕاست، ئەبووایە بە چ شێوەیەک تۆ ئەم هەواڵەت ببیستایە؟ نازانم بۆ هێندە بێئاگام لە خۆم! ئەبووایە هیچ نەبێت، بە شێوەیەک لە شێوەکان پێم ڕابگەیەندیتایە، کە منداڵمان بووە، بە هەرحاڵ، دوای ڕۆشتنی تۆ لەلامان، خودای دلۆڤان بە بەخشینی ئەم کیژۆڵەیە بەختەوەری کردین!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەک ئەوەی لە خۆشیدا هەستی بە ورووژانێکی زۆر کردبێت، لەسەر کورسییەکەی بازێکی دا و وا دەر دەکەوت دۆخەکەی زۆر بەدڵ بێت.

ڤێلچانینۆڤ، کە ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو، وتی، "بەڕاستی من هیچ شتێکم لەم بارەیەوە نەبیستبوو."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە ڕوویەکی پڕ لە شادی و دەنگێکی شیرین و دڵگیرەوە وتی، "بەدڵنیاییەوە، بەدڵنیاییەوە، کێ هەبوو تا ئەم هەواڵەتان پێ ڕابگەیەنێت؟ ئەگەر بیرتان مابێت، من و ئەو خێزانە هەژارەم بەتەواوی بێهیوا بووبووین لەوەی چیی تر منداڵمان ببێت، بەڵام لەپڕ خودای بەخشندە قاپیی ڕەحمەتی خۆی بە ڕوودا ئاوەڵا کردین و بەم کچە دەوڵەمەندی کردین. مەگەر هەر خودا بۆخۆی بزانێت کە ئەمە چ مانایەکی هەبوو بۆ من! هەر ڕێک یەک ساڵ دوای ڕۆیشتنەکەی تۆ، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم. نا، نەخێر، ساڵێک نا، نزیکەی ساڵێکیش نەدەبوو. یەک تۆز ڕابوەستن، با بیرم بکەوێتەوە؛ ئەگەر بەهەڵەدا نەچم و مێشکم هەڵم نەخەڵەتێنێت، پێم وا بێت تۆ یان مانگی دە بوو یان یازدە بوو کە لەلامان ڕۆیشتیت؟"

"من کاتێک شاری ت-م بەجێ هێشت، سەرەتای مانگی نۆ

بوو، بەڵێ، ١٢ی نۆ بوو، زۆر بەباشی بیرمە، کە ئەو بەرەوارە لەلاتان ڕۆشتم."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەوپەڕی سەرسامییەوە هاواری کرد، "وتت لە مانگی نۆدا، وایە؟ ئممم!... بیرم لە چی دەکردەوە؟ زۆر باشە، ئەگەر بەم شێوەیە بێت کە تۆ دەیڵێیت، کەواتە با بزانم، ئێوە لە دوانزەی نۆدا لەلامان ڕۆیشتیت، لیزاش ٨ی پێنج لەدایکبوو. کەواتە مانگی نۆ، دە، یازدە، دوازدە، یەک، دوو، سێ، چوار، کەواتە هەشت مانگ و چەند ڕۆژێک دەکات! ئەگەر ئەتانزانی ئەو ژنە داماوەم..."

ڤێلچانینۆڤ بە دەنگێکی تێکشکاو و لاڵەپەتییەکەوە وتی، "نیشانم بدە... بانگی بکە..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەمێک شڵەژا لەوەی ڤێلچانینۆڤ لەپڕ قسەکانی بڕی و وەک ئەوەی قسەکانی هیچ نرخێکی نەبووبێت لەلای، بۆیە وتی، "بەدڵنیاییەوە! هەر ئێستا ڕاستەوخۆ ئەیهێنمە خزمەتتان و پێتانی دەناسێنم!"

هەر کە وای وت، خێرا بەرەو ژوورە بچووکەکەی تر چوو، کە لیزای لێ بوو. هەمووی سێ یان ڕەنگە چوار خولەکێک تێنەپەڕیبوو بەتەواوی، کە لە ژوورە بچووکەکەوە دەنگی چرپەچرپێکی خێرا و لالانەوەیەکی بەکوڵ بەرز بۆوە، دەنگی لیزا بەباشی نەدەبیسترا، ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "بەدڵنیاییەوە ئەو کیژۆڵەیە ئێستا ئەپاڕێتەوە، کە بەزۆر ڕاپێچی دەرەوەی نەکات." لە کۆتاییدا هەردووکیان پێکەوە هاتنە دەرەوە.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وتی، "دەبینیت، بەتەواوی سەری لێ شێواوە، زۆر شەرمنە، زۆریش خۆبەزلزانە... ڕێک چۆتەوە سەر هاوسەرە هەژارەکەم!"

لیزا هاتە ژوورەوە، چاوی بڕیبووە عەردەکە، چیی تر نەدەگریا؛ باوکی توند پەلی گرتبوو. کیژۆڵەیەکی کەمێک درێژ و لاواز بوو، بەڵام تا بڵێی کیژێکی جوان بوو. چاوە گەورە و شینەکانی بە ڕووی ڤێلچانینۆڤدا هەڵهێنا و زۆر بەخێرایی و بە شێوەیەکی گومانـاوی چاوی لـە سەردانکەرەکە بڕی، بە شێوەیەکی زۆر مڕومۆچانە لێی ڕوانی، بەڵام هەر زوو سەری خۆی نەوی کردەوە. چاوەکانی پڕ بوون لـە ترس و گومـان، وەک ڕوانینی ئەو منداڵـەی میوانێکی بێگانە دێتە ماڵەکەیـان و بۆ ساتێک بەبێدەنگی و بەتەنیا لـەلای ئەو میوانـە بێگانەیـە بەجێی دەهێڵن، منداڵەکـەش بەهێمنی خۆی ئەترنجێنێتە سووچێکەوە و بە شێوەیەکی پڕ لـە ترس و گومـان و متمانەنەکردن، چاو دەبڕێتە نـاو چاوەکانی میوانـە بێگانەکە. بەڵام پێدەچوو ڕوانینی ئەم کیژۆڵەیە بە جۆرێکی تر بێت و شتێکی تر لەپشت ئەو نیگایانەوە بێت، ڤێلچانینۆڤ پێی وا بوو کە نیگاکردنی ئەو منداڵە هەرگیز لـە نیگاکردنی منداڵێکی ئاسـایی نەدەچوو.

باوکی ڕاستەوخۆ کیژۆڵەکەی هێنایە بەردەمی میوانەکە. "کچی خۆم، ئەم پیاوە وەک مامت وایە، ئەم پیاوە کاتی خۆی دایکتی زۆر بەباشی دەناسی. ئەم پیاوە هاوڕێیەکی خۆشەویستی ئێمە بوو. شەرم مەکە، دەستەکانت دەر بهێنە."

کیژۆڵەکە کەمێک خۆی بۆ دواوە چەماندەوە و بە جۆرێک لە گومان و ترسەوە دەستەکانی دەر هێنا.

لە کاتێکدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەوردی ڤێلچانینۆڤی خستبووە ژێر نیگاکانیەوە، دەستی کرد بە هەندێک ڕوونکردنەوە، "ناتالیا ڤاسیلیڤنای خێزانی ڕەحمەتیم، بەداخەوە، بە هۆی مەرگە

لەناکاوەکەیەوە فریا نەکەوت بەباشی ڕای بهێنێت و بەباشی فێری سڵاوکردنی بکات، ئەوەی فریا کەوتبوو فێری بکات، ئەوە بوو کە هاوشێوەی سڵاوکردنی باوی نێو ئینگلیزەکان کەمێک بچەمێتەوە و دەستەکانیشی ئاوەڵا بکات."

ڤێلچانینۆڤ بەتەواوی ئاگای لەوە بوو کە لەژێر چاودێریی خانەخوێکەیدایە و چاوی لەسەرە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک هەوڵی نەدا نیگەرانی و هەستەکانی خۆی بشارێتەوە، وەک ئەوەی داکوترابێت بە کورسییەکەدا، لە کاتێکدا دەستەکانی لیزا لەناو دەستەکانیدا بوو، بێ ئەوەی چاوەکانی لەسەر ئەو منداڵە بتروکێنێت، چاوی تێ بڕیبوو. بەڵام پێدەچوو لیزا لەڕادەبەدەر نیگەرانی شتێک بێت و نەوێرێت قسە بکات، نیگەرانییەکەی هێندە زۆر بوو، بیری چووبۆوە دەستەکانی لەناو دەستی میوانەکەدایە، چاویشی لەسەر باوکی نەدەتروکاند. بە ترسێکی زۆرەوە بەوردی گوێی بۆ هەموو ئەو قسانە ڕاگرتبوو، کە باوکی دەیکردن. ڤێلچانینۆڤ یەکسەر ئەو چاوە گەورە و شینانەی ناسییەوە، بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو و کەوتبووە ژێر کاریگەرییەوە، بریتی بوو لە ڕوخسارە سپی و ناسکەکەی ڕەنگی پرچی. هەموو ئەم شتانە، بۆ ئەو ماناگەلێکی ئێجگار گرنگی هەبوو. ڕوخساری لەگەڵ هێڵکاریی لێوەکانی زۆر بەڕوونی ناتالیا ڤاسیلیڤنای وەبیر دەهێنایەوە. لە کاتێکدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ ناوەناوە بە هەستێکی لەڕادەبەدەر گەرمەوە هەندێک شتی بۆ ڤێلچانینۆڤ باس دەکرد و پێی دەوت، بەڵام پێدەچوو ڤێلچانینۆڤ هەر گوێشی لێ نەبووبێت. تەنها ئەم چەند دەستەواژەیەی کۆتاییی بیست، ".. ئا بەم

شێوەیە تۆ ناتوانیت ئەو شادییە بێئەندازەیەی ئێمە لەو کاتەدا بهێنیتە بەرچاوی خۆت، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، کاتێک خودا ئەم دیارییە بەنرخەی پێ بەخشین! هەر بە لەدایکبوونی، ئیتر ئەم کچە بوو بە هەموو شتێکی من لەم دنیایەدا، هەمیشە لە دڵی خۆمدا دەموت، ئەگەر بێت و ڕۆژێک بە هۆی ویستی خوداوە ئەم هێمنی و خۆشییەم لێ تێک بچێت و کۆتایی بێت، هیچ نەبێت، لیزام بۆ ئەمێنێتەوە. سەبارەت بەمە، هیچ گومانێکم نەبوو!"

ڤێلچانینۆڤ بە جۆرێک لە گومانکردنەوە پرسیاری کرد، "ئەی ناتالیا ڤاسیلیڤنا؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە کەمێک ڕەنگی بەو پرسیارە تێک چوو، دەستبەجێ وەڵامی دایەوە، "ناتالیا ڤاسیلیڤنا؟ تۆ ئەوت باش دەناسی، گومانی تێدا نییە بەباشی لەبیرتە، کە ئەو حەزی نەدەکرد زۆر هەستەکانی خۆی دەر بخات. بەڵام کاتێک لە سەرەمەرگدا ماڵئاواییی لەم کچە بچکۆلەیەی کرد... چیی تر نەیتوانی ئەم جارەیان وەک جارەکانی تر ڕێ لە شاردنەوەی هەستەکانی خۆی بگرێت، هەموو شتێک ئاشکرا بوو! هەر وەک ئێستا پێم وتن، تەنها لە سەرەمەرگدا، ئەوەی کە ڕووی دا، بەم شێوەیە بوو: ڕۆژێک بەر لە مردنەکەی، لەپڕ زۆر هەڵچوو، زۆر تووڕە بوو. دەیوت، 'ئێوە هەوڵی ئەوە دەدەن من بەم دەرمانانە چارەسەر بکەن، لە کاتێکدا من هیچم نییە و تەنها تووشی تالێهاتنێکی زۆر ئاسایی بووم.' هەروەها دەیووت، 'ئەم پزیشکانەی ئێرە، سەر لە هیچ شتێک دەر ناکەن و هیچ نازانن، من دڵنیام بەم زووانە کە کوخ گەڕایەوە، ئەوا سەرلەنوێ، لە ماوەی کەمتر لە دوو حەوتوودا،

تەندروستییەکەم وەک جاری جاران بۆ دەگەڕێنێتەوە و چاکم دەکاتەوە!' ئەو هاوڕێ پیرەمانت وەبیر نایەتەوە؟ ئەوەی کاتی خۆی پزیشکی سوپا بوو؟ ناتالیای خێزانم مەبەستی ئەو کۆنەهاوڕێیەمان بوو. ئەگەر ڕێم بدەن زیاتر لەمەش بڵێم! پێنج کاتژمێرێک پێش ئەوەی بەتەواوی گیانی بسپێرێت، ئەوەی بیر کەوتبۆوە، کە سێ حەوتووی تر دەبێت سەردانی پووری بکات، دایکی ڕۆحیی لیزا، بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی لیزا و ڕۆژی ناونانی، دەبێت بچین هاوکاریی پووری بکەین لە ئامادەکارییەکاندا بۆ ئەو بۆنەیە..."

ڤێلچانینۆڤ، کە هێشتا دەستی منداڵەکە لەناو دەستەکانیدا بوو، لەناکاو لەسەر کورسییە دەسکدارەکەی هەستایە سەر پێ. لەناو هەموو ئەو شتانەی دەیبینی و دەیبیست، شتێک کە لە هەمووی زیاتر تووشی پەژارەی کردبوو، ڕوانینە تیژ و پڕ لە سەرزەنشتەکەی ئەو منداڵە بوو، کە لە باوکی خۆی پێی دەڕوانی. بەخێرایی و بە شێوەیەکی نامۆیانە پرسیاری کرد، "ئەم کچە نەخۆش نییە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە کەساسی و پەژارەیەکی زۆرەوە وتی، "لەو باوەڕەدا نیم، بەڵام... ئەم بارودۆخە ناهەموارەی تێی کەوتووین، بەو شێوەیەی لێ کردووە کە لە بەرچاوتاندایە... کچێکی تا بڵێی نامۆیە، زۆربەی کات تووڕە و نیگەرانە، بەتایبەت لەدوای مردنی دایکی ئاوای بەسەر هاتووە، هەر دوابەدوای ئەوەی دایکی گیانی سپارد، بە هۆی کاریگەریی ئەو مردنەی دایکی، دوو دانە هەفتەی ڕێک لە جێگەدا کەوت، زۆر خراپ تووشی فیلیهاتن ببوو. کەمێک پێش ئەوەی تۆ خۆت بکەیت بە ژوورەوەدا، گریەوزارییەکی زۆر سەیری

دەکرد... گوێت لێیە لیزا، گوێت لێیە؟ ئاخر پێم نالێیت ئەم هەموو شینوشەپۆڕەت لەپای چییە؟ هەمووی هەر لەبەر ئەوەیە کە من لە ماڵ دەر دەچم و بەتەنیا بەجێی دەهێڵم و ئەویش وا بیر دەکاتەوە، کە من چیی تر ئەوم خۆش ناوێت وەک ئەو کاتانەی هێشتا دایکی لە ژیاندا مابوو - ئەو بەوە لۆمەم دەکات. منداڵێک لە تەمەنی ئەمدا، دەبێت یاری بە بووکەڵەکانی بکات، نەک هەر خەریکی پیش خواردنەوە و بیرکردنەوە و خەیاڵی لەم جۆرانە بێت. ڕاستییەکەی، لێرە هیچ کەسێکیشی لێ نییە، تا یاریی لەگەڵ بکات."

"بەڵام بۆچی، چۆن دەبێت... بەدڵنیاییەوە ئەم دووانەتان لێرە بەتەنیا ناژین، وایە؟"

"بەڵێ، بۆ نا، هەردووکمان تەنیای تەنیاین، خزمەتکارەکەشمان ڕۆژی یەک جار زیاتر نایەت."

"کاتێک جەنابیشت ئەچیتە دەرەوە، ئەم کچۆڵەیە ئا بەم شێوەیە بەتەنیا لێرە بەجێ دەهێڵیت؟"

"ئێ لەمە زیاتر چیم لەدەست دێت؟ دوێنێ کە لە ماڵ دەر چووم، لەو ژوورە بچووکەدا دەرگام لەسەر کلیل دا، هەموو گریانەکەی ئەمڕۆشی هەر لەسەر ئەو بەجێهێشتن و دەرگالەسەرداخستنەی دوێنێی بووە. بەڵام ئێوە پێم بڵێن ئەبووایە لەمە زیاتر چ کارێکی ترم بکردایە؟ خۆتان دادوەر بن، دوێنێ نا پێرێ، کاتێک لە ماڵ چووبوومە دەرەوە، ئەو هەلەی قۆستبۆوە و چووبووە خوارەوە، کوڕێکیش لە گۆڕەپانەکەدا بەردێکی تێ گرتبوو، کێشابووی بە سەریدا. یان جارێکی تر دەستی کردبوو بە گریەوزاری، ڕای کردبوو بەو ناوەدا و لە هەرچیی کرێچیی ناو گۆڕەپانەکەیە، پاڕاوەتەوە تا بزانێت من

لەکوێم. ئێ ئەمەش کارێکی شیاو نییە، بەدڵنیاییەوە! دانی پیدا دەنێم منیش هێندە باش نیم؛ زۆر جار بۆ کاتژمێرێک لە ماڵ دەر دەچم، کەچی سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر دەگەڕێمەوە، ئەمەش ڕێک ئەو شتەیە، کە دوێنێ ڕووی دا. بەڵام باشیی لەوەدا بوو، ئەو کاتەی من لە دەرەوەی ماڵ بووم، خاتوونی خاوەن ماڵم ناردبوو بەشوێن کلیلسازێکدا، تا بێت قوفڵەکە بشکێنێت. ئای چەند لە حاڵی خۆم شەرمەزار بووم، چەند مرۆڤێکی بێهەست بووم، خۆمم وەک دڕندەیەکی قێزەون دەهاتە پێشچاو. هەموو ئەمانە کارگەلێکی تەواو شەیتانەیە، بەڵێ، تەواو شەیتانەیە...“

منداڵەکە بە ترس و دوودڵییەوە وتی، ”بابە!“

”ها، دیسانەوە دەستت پێ کردەوە! دیسانەوە بەزمەکەیە! کەمێک لەمەوبەر چیم پێ وتیت؟“

لیزای بچکۆلە بەتۆقیوی، لە کاتێکدا دەستە بچووکەکانی بەرەو باوکی درێژ کردبوو، بەخێرایی ئەمەی دووبارە دەکردەوە، ”چیی تر وا ناکەم، چیی تر وا ناکەم!“

ڤێلچانینۆڤ، کە ئارامیی خۆی لەدەست دابوو، بە دەنگێکی فەرماندەرانەوە وتی، ”ئێوە بەم بارودۆخەی ئێستا هەتانە، ناتوانن درێژە بە ژیانتان بدەن. لەگەڵ ئەوەی مرۆیەکی دەوڵەمەندن، پێم ناڵێیت چۆن... چۆن ئەتوانن ئا بەم شێوەیە لە بارودۆخێکی وەها و زنجێکی لەم شێوەیەدا بژین؟“

”لەم زنجەدا؟ ڕەنگە هەر ئەم هەفتەیە لێرە بین و دواتر بڕۆین. تا ئێستاش پارەیەکی زۆرمان بەفیڕۆ داوە، ئەگەر دەوڵەمەند بووینایە...“

ڤێلچانینۆڤ، کە بەتەواوی هێمنیی خۆی لەدەست دابوو،

خێرا قسەکانی پێ بڕی و وتی، "زۆر باشە، ئەمە بەسە، ئەمە بەسە."

وا دیار بوو ڤێلچانینۆڤ دەیویست بڵێت، پێویست ناکات خۆت سەغڵەت بکەیت و لەمە زیاتر بڵێیت، چونکە ئەوەی تۆ دەتەوێت بیڵێیت، من دەیزانم، ئەشزانم بە چ مەبەستێک ئەم قسانە دەکەیت. پاشان وتی، "گوێ بگرە، من پێشنیارێک دەکەم. تۆ ئێستا وتت هەفتەیەک یان دووانی تر لێرە دەمێنیتەوە. من خێزانێک دەناسم لێرە، کە وەک خێزانی خۆم وایە، ماڵەکەشیان وەک ماڵی خۆم وایە - بیست ساڵ دەبێت بەباشی دەیانناسم، باوکی خێزانەکە، کە ناوی ئالێکزاندەر پاڤلۆڤیچ پۆگۆریلیستێڤە، ڕاوێژکارێکی نهێنییە: ڕەنگە لە جێبەجێکردن و تەواوکردنی کارەکانتدا بتوانێت کارئاسانیت بۆ بکات. ئێستا لەگەڵ خێزانەکەیدا لە ڤێلا هاوینەییەکەیاندان، خاوەنی ڤێللایەکی زۆر نایابن. کلاڤدیا پێترۆڤنا وەک خوشک، یان ئەگەر لەوەش زیاتر بڵێم، وەک دایک وایە بۆ من. خاوەنی هەشت منداڵن، ڕێم بدەن با هەرچیی زووترە، لیزا ببەم بۆ لایان... با لەمە زیاتر کات بەفیڕۆ نەدەین. دڵنیام بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پیشوازیی لێ دەکەن و تا ئەو کاتەی تۆ لێرە بە کارەکانت ڕادەگەیت و تەواویان دەکەیت، ئەوان وەک منداڵی خۆیان چاودێریی دەکەن بۆت، ڕێک وەک منداڵی خۆیان!"

ڤێلچانینۆڤ بە شێوەیەکی زۆر سەیر ئارامیی خۆی لەدەست دابوو، بۆشی نەدەشاردرایەوە.

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش دانەجیرەی پێ کەوتبوو لە تووڕەییدا و بەتوندی ڕووی خۆی گرژ و مۆن کردبوو، بە ڕوانینێکی زۆر

تەوسئامێزەوە چاوی لە چاوەکانی ڤیلچانینۆڤ بڕی و وتی، "هەرگیز کاری وا ناکەم، ئەمە مەحاڵە!"

"بۆچی؟ بۆچی ئەمە مەحاڵە؟"

"چۆن بۆچی؟ چۆن لەناکاو بهێڵم منداڵەکەم لە خۆم دوور بخرێتەوە؟ ڕاستە ئەگەر کەسەکە هاوڕێیەکی دڵسۆز و ڕاستەقینەی وەک تۆ بووایە، بەدڵنیاییەوە ئەو کاتە هیچ لاریم نەدەبوو و هیچ خەمم نەدەبوو، ئەگەر بهاتایە و دوور لە چاوانی خۆشم بووایە. بەڵام چۆن داوام لێ دەکەیت منداڵەکەم بسپێرمە دەست ماڵێکی غەوارە! ئەویش چ جۆرە ماڵێک، ماڵێک لە هەرە چینە بەرزەکانی کۆمەڵگە! هەروەها ڕوونیش نییە کە بە چ شێوەیەک هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەن!"

ڤیلچانینۆڤ، کە تەواو دەهری ببوو، شێتگیرانە هاواری کرد، "بەڵام من پێم وتیت ئەو خێزانە وەک خێزانی ڕاستەقینەی خۆم وان! کلاڤدیا پیترۆڤنا تەنیا وتنی یەک وشەی منی بەسە، تا بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە کچەکەمان لێ وەر بگرێت، وەک ئەوەی کچی خۆم بێت، ئاگای لێ دەبێت!"

ڤیلچانینۆڤ بەتوندی پێی کێشا بە عەردەکەدا و لە قسەکانی بەردەوام بوو، وتی، "نەفرەتتان لێ بێت! خۆشت باش دەزانیت بۆیە ئەم هەموو زۆربڵێییە دەکەیت، تەنها بۆ ئەوەی بڵێن وەک باوکێکی دڵسۆز بەرگری لە داهاتووی منداڵەکەت دەکەیت... هیچ شتێکی دی نییە تا گفتوگۆی لەسەر بکەیت!"

"من تەنها مەبەستم ئەوە بوو، کە بڵێم ئایا هەر بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیر نییە؟ من دەبێت بچم بۆ لای و هیچ نەبێت ڕۆژی یەک-دوو جار ببینم و لە بارودۆخی ئاگادار بم، ئەگەر نەچم، دوایی چیم پێ دەڵێن؟ هە، هە! منداڵێکی

بێخاوەن! ئەویش لە وەهاماڵێکی خانەدان و دەوڵەمەنددا!"

ڤێلچانینۆڤ هاواری کرد، "بەڵام ماڵی ئەوان، ماڵێکی تا بڵێی سادەیە، بەو شێوەیە دەوڵەمەند نین، کە تۆ بیرت لێ کردۆتەوە! پێم وتیت منداڵیان زۆرە و ئەم کیژۆڵەیەش بۆخۆی لەوێ کەمێک دەبووژێتەوە. مەبەستی سەرەکییش هەر ئەمەیە... ئەگەر پێشت خۆش بێت، هەر سبەینێ زوو لەگەڵ خۆم ئەتبەم و خۆم بەو خێزانەت دەناسێنم. بەدڵنیاییشەوە تۆ ئەتوانیت سەردانیان بکەیت و سوپاسگوزاریی خۆشتیان بۆ دووپات بکەیتەوە، ئەگەر حەزت کرد، هەموو ڕۆژێک پێکەوە سەریان لێ دەدەین."

"بەڵام ئاخر..."

"قسەی قۆڕ! ئاخر و ماخری ناوێت، ئەتەوێت لەمە زیاتر چیت بۆ بکرێت! گوێ بگرە، ئەم ئێوارەیە وەرن بۆ لای من، شەویش هەر لای خۆم بمێننەوە، بۆ ئەوەی سبەینێ بەیانی زوو هەستین و دەوروبەری دوانزەی نیوەڕۆ بگەینە جێ."

"چەند مرۆڤێکی میهرەبان و خەمخۆرن! تەنانەت ئەتانەوێت شەوەکەشی لای خۆتان بمێنینەوە..." پاڤێل پاڤلۆڤیچ یەکسەر بە پێشنیارەکە قایل بوو. بە دەنگێک، کە پڕ بوو لە ڕەزامەندی، درێژەی دایەوە بە قسەکانی، "بەڕاستی ئێوە چاکەیەکی گەورە لەگەڵ من دەکەن بەم کارەتان. ئەی بەڕاست، نەتوت کە ڤێللاکە لەکوێیە؟"

"ڤێللاکەیان لە لیسنوییە."

"زۆر باشە، بەڵام ئەی سەبارەت بە جلوبەرگەکەی چی؟ باش دەزانیت لە وەها خێزانێکی خانەداندا و لە وەها ڤێللایەکی هاوینەشدا... ئێوە دەزانن... کە دڵی باوکێک..."

"چ جلوبەرگێک؟ ئەی مەگەر ئەم ماتەمینی بۆ پرسەی دایکی ناگێڕێت؟ بۆ مەگەر دەکرێت لەم جلە ڕەشانە زیاتر، جلی جیاوازتر بپۆشێت؟ بە بڕوای من، لەم جلانە باشتر و گونجاوتر هەر نەبووە! تەنها شتێک کە پێویستە هەیبێت، کراسێکی کەتانی پاکوخاوێن... لەگەڵ تارایەکی پاکوخاوێن، بەڕاستی کراس و تاراکەی خۆی گەلێک پیسە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە بایەخپێدانێکی زۆرەوە وتی، "هەر ئێستا، بەدڵنیاییەوە جلەکانی دەگۆڕێت، هەردووکیشمان ئەو شتانەی کە پێویستی پێیەتی، بۆی ئامادە دەکەین، جلەکانی ژێرەوەیشیم داوە بە ماریا سیسۆڤنا، تا بۆی بشوات."

ڤێلچانینۆڤ پەڕییە ناو قسەکانی، وتی، "کەواتە زۆر باشە، پێویستە پێیان بڵێیت تا گالیسکەیەکمان بۆ بهێنن، ئەگەر هەرچی زووتر ئەم کارەش بکەن، ئەوە باشتر."

بەڵام لەپڕ و دوور لە چاوەڕوانیی هەردووکیان، ڕووبەڕووی نارەزایی بوونەوە. لیزا بەتەواوی لە دژی ئەم بیرۆکەیە وەستایەوە. تەواوی ئەو کاتەی ئەو دووانە گفتوگۆیان دەکرد، ئەم بە ترس و بیمەوە گوێی بۆ تەواوی قسەکانیان گرتبوو ئەگەر تەنها بۆ ساتێکیش چییە، لەو کاتەدا کە ڤێلچانینۆڤ لە هەوڵی قایلکردنی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا بوو، کەمێک لە چاوەکانی ئەو کیژۆڵەیەی بڕوانییایە، ئەو کاتە ئەو پەژارە و نائومێدییە زۆرەی دەبینی، کە ئەو ڕوخسارە بچکۆلەیە لە خۆیدا هەڵی گرتبوو.

کیژۆڵەکە بە دەنگێکی نزم، بەڵام بەپێداگرییەوە وتی، "من ناڕۆم."

"ئەها، ئەها! خۆ چاوت لێیە، دیسانەوە وەک دایکی

هەڵسوکەوت دەکات! ڕێک لە دایکی دەچێت!"

"من وەک دایکم نیم، من وەک دایکم نیم!"

بەم شێوەیە، لیزا بەوپەڕی نائومێدییەوە هاواری دەکرد، دەستە بچکۆلانەکانی خۆی لەناو یەکا هەڵدەگلۆفی، وەک ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات بەرامبەر ئەو تۆمەتە نارەوایەی باوکی دەیدایە پاڵی و بە دایکی دەچوواند.

"بابە، بابە، ئەگەر تۆ بەجێم بهێڵیت..."

لەپڕ ئاوڕی دایەوە بەلای ڤێلچانینۆڤدا، کە تووشی سەرسامی ببوو لەم بەرهەڵستییەی لیزا، بەویشی وت، "ئەگەر تۆ بمبەیت، من..."

بەڵام کیژی داماو دەرفەتی ئەوەی نەبوو قسەکانی تەواو بکات، پاڤێل پاڤلۆڤیچ شاڵاوی بۆ برد و قۆڵی گرت، بێ ئەوەی توورەیی و هەستی خۆی بشارێتەوە، یەخەی لیزای بچکۆلەی گرت و بەرەو ژوورە بچکۆلانەکەی ڕاپێچی کرد. بۆ ماوەی چەند خولەکێک، هەر چرپەچرپیان بوو، پاشان لەپڕ دەنگی گریانێکی خنکاو بەرگوێی ڤێلچانینۆڤ کەوت. لەوەدا بوو ڤێلچانینۆڤ خۆی بکات بە ژوورە بچووکەکەدا، بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەو کاتەدا یەکسەر هاتە دەرەوە، بە زەردەخەنەیەکی خواروخێچ و ساختەوە ئاگاداری کردەوە، کە هەر ئێستا لیزا دێت. ڤێلچانینۆڤ هەوڵی دا سەیری نەکات و چاوەکانی کردبووە شوێنێکی تر.

لەو کاتەدا ماریا سیسۆڤناش خۆی کرد بە ژوورەوەدا، هەمان ئەو ژنە ڕوخسارلادێییە بوو، کە پێشتر لە ڕاڕەوەکەدا چاوی پێی کەوتبوو. جلەکانی لیزای پێچابووەوە و لەناو جانتایەکی خنجیلەی جواندا هێنابوویەوە، کە بردبووی بۆی

بشۆرێت، دای نا و تەماشایەکی ڤێلچانینۆڤی کرد و پرسیی، "کەواتە گەورەم، بەڕێزتان بۆ ئەوە هاتوون بۆ ئێرە، تا کیژۆڵەکە لێرە دوور بخەنەوە؟ کەواتە خێزانیشتان هەیە؟ بەڕاستی کارێکی زۆر مرۆڤانە و باش دەکەن، ئەمە کیژێکی زۆر گوناهە! بەم کارەتان، لەم شێتخانەیە ڕزگاری دەکەن."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەژێر لێوەوە بەخوتەوبۆڵەوە وتی، "نا، نا، ماریا سیسۆڤنا، ئیجگار بەو شێوەیەش نییە!"

"چی بەو شێوەیە نییە؟ وا ناوم دەبەیت، دەڵێی دەتەوێت ناوم بنێیت! بەڵێ، بۆ دەتەوێت نکوولّی لەوە بکەیت، کە ماڵەکەت ئەڵێی شێتخانەیە، ئایا هەر بەڕاست وا نییە؟ ئایا بەلاتەوە ڕەوایە کە کیژۆڵەیەک، کە ئێستا بەباشی لە شتەکان تێدەگات و ڕاست و چەپی خۆی لە یەکدی جیا دەکاتەوە، ئەم هەموو بەدرەفتارییانەی جەنابت ببینێت؟"

پاشان ڕووی کردە ڤێلچانینۆڤ و وتی، "گەورەم، گالیسکەکەمان بۆ بانگ کردوویت، پێم وا بێت بۆ لیسنوی بوو، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم؟"

"بەڵێ ، بەڵێ."

"زۆر باشە، بەڕاستی خێری پێوە بوو کە هاتن!"

لیزا لە ژوورە گچکەکەی هاتە دەرەوە و ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، چاوی لە عەردەکە بڕیبوو، جانتاکەی هەڵگرت. تەنها ڕوانینێکیش چییە، لە ڤێلچانینۆڤی نەڕوانی، هەستەکانی خۆی حەشار دەدا و وەک پێشتر نەڕۆیشت، تا باوکی لە ئامێز بگرێت، تەنانەت ئەو کاتەشی لێک جیا بوونەوە، بەڕوونی دیار بوو کە تەنانەت نەیدەویست لێشی بڕوانێت. بەلام پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەک خووی هەمیشەیی خۆی، ئەوی لە

ئامێز گرت و سەرە بچکولانەکەی رامووسی. لەم کاتەدا کە دیار بوو هەستی باوکایەتیی بەتەواوی جوولابوو، لێوەکانی لەرزین و چەناگەی جوولەی تێ کەوت، بەڵام کیژۆلەکە هەر چاوەکانی بە ڕووی باوکیدا هەڵنەهێنا. پاڤیل پاڤلوڤیچ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو - دەستەکانیشی دەلەرزی. هەرچەند کە ڤێلچانینۆڤ تا ئەوپەڕی توانای خۆی هەوڵی ئەوەی دەدا چاوی بەو دیمەنە نەکەوێت، بەڵام دوور لە ویستی خۆی، چاوەکانی چووە سەر ئەو دیمەنە خەمناکە. تەنها ئاواتی یەک شتی ئەخواست لەو کاتەدا، ئەویش هەرچی زووترە، ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێت.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت، "گوناهی من نییە، ئەمە شتێکە، هەر دەبوو ڕووی بدایە!" هاتنە خوارەوە، ماریا سیسۆڤنا لیزای ڕامووسی و ماڵئاوایی لێ کرد، لیزا چاوەکانی هەڵنەهێنا بە ڕووی باوکیدا، تا ئەو کاتەی لەناو گالیسکەکەدا دانیشت. لەناکاو بەخێرایی دەستەکانی بەرز کردەوە و قیژاندی، ئەگەر یەک خولەکی تر گالیسکەکە وەڕێ نەکەوتایە، دوور نەبوو خۆی لە گالیسکەکەوە هەڵبدایەتە خوارەوە بۆ باوکی، بەڵام ئەسپەکان کەوتبوونە جووڵە.

# ٦

# خەیاڵێکی نوێی مرۆڤێکی بێکار

ڤیلچانینۆڤ بەنیگەرانییەوە پرسیی، "هەست ئەکەیت نەخۆش بیت؟ پێیان دەڵێم ڕابوەستن، تا کەمێک ئاوت بۆ بهێنن..."

کیژۆڵەکە بە سۆزێک و نیگایەکی سەرزەنشتکەرانەوە لە ڤیلچانینۆڤی ڕوانی و بە دەنگێکی ڕوون، بەڵام پچڕپچڕەوە وتی، "بۆ کوێم دەبەیت؟"

"بۆ لای خێزانێکی زۆر میهرەبان، لیزا گیان، ئێستا ئەوان لە ڤیللایەکی هاوینەییی زۆر جواندان. منداڵی زۆریشی لێیە، هەموویان خۆشیان دەوێت، ئەوان زۆر میهرەبانن، لە من دڵگران مەبە لیزا گیان، بڕوات بێت، من تەنیا چاکەی تۆم دەوێت..."

چەند نامۆ دەبوو بەلای هەموو ئەوانەی ڤیلچانینۆڤیان دەناسی، ئا لەم ساتەدا چاویان پێی بکەوتایە.

لە کاتێکدا لیزا فرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس مابوو، گەرووی پڕ بوو لە گریان، چاوە جوانەکانی، کە پڕ بوو لە تووڕەیی، بڕیبووە ڤیلچانینۆڤ، وتی، "چۆن... چۆن... چۆن...

ئاخ، تۆ چەند بەدفەڕیت!"

"لیزا، من..."

"تۆ خراپیت، خراپیت، خراپیت، خراپیت!"

کیژەکە دەستە بچووکەکانی خۆی هەڵدەگلۆفی. ڤێلچانینۆڤیش بەتەواوی خۆی لەبیر چووبووەوە. "لیزا، خۆشەویستم، ئەگەر ئەتزانی چەندێک من بێهیوا دەکەیت!"

لیزا بە دەنگێکی فەرماندەرانەوە پرسیی، "ئایا هەر بەڕاستی ئەو سبەینێ دێت؟ ئایا هەر بەڕاست دێت؟"

"بەڵێ، بەڵێ، خۆم ئەیهێنم. ئەڕۆم بۆ لای و لەگەڵ خۆم ئەیهێنم."

لە کاتێکدا لیزا چاوەکانی لە عەردەکە بڕیبوو، بەچرپە وتی، "ئەو هەڵم دەخەڵەتێنێت!"

"ئایا ئەو تۆی خۆش ناوێت، لیزا؟"

"ئەو منی خۆش ناوێت."

"ئایا خراپ لەگەڵتا هەڵسوکەوت دەکات؟ وایە؟"

لیزا بەدڵتەنگی لە ڤێلچانینۆڤی ڕوانی و بێدەنگ بوو. دووبارە ڕووی خۆی لێ وەر گێڕا و وەک ئەوەی مانی گرتبێت، چاوەکانی خۆی ڕوو بە عەردەکە نەوی کرد. ڤێلچانینۆڤ دەستی کرد بە ماستاوکردن بۆی، زۆر بەگەرمی قسەی بۆ کچەکە دەکرد، تا هەرچۆنێک بووە، قایلی بکات. ڕاستییەکەی، خودی ڤێلچانینۆڤ خۆشی بەتەواوی تای لێ هاتبوو. لیزا گوێی بۆ قسەکانی ڤێلچانینۆڤ شل کردبوو، بەڵام وەک نەیارێک لە ڤێلچانینۆڤی دەڕوانی و گومانێکی زۆریشی لێی هەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر گوێی لێ گرتبوو. گوێگرتنەکەی بەتەواوی ڤێلچانینۆڤی خۆشحاڵ کردبوو،

تەنانەت دەستی کرد بە شیکردنەوەی ئەوەی پیاوێکی مەیخۆرەوە، چ جۆرە پیاوێکە. پێی وت خۆشی دەوێت و هەر خۆشی ئاگای لە باوکی دەبێت. دواجار لیزا چاوەکانی بە ڕوویدا هەڵهێنا بەگرنگیپێدانەوە لە ڤێلچانینۆڤی ڕوانی. بۆی باس کرد کە چۆن کاتی خۆی دایکی ناسیوە، تێبینیی ئەوەی کرد، کە قسەکانی سەرنجی کچەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، وردەوردە کچەکە وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. بەڵام بەخۆپارێزییەوە، بە کەمترین وشە و بە جۆرێک لە ڤیرسیچمەیییەوە وەڵامی دەدایەوە. بەڵام بە هیچ کلۆجێک ئامادە نەبوو وەڵامی پرسیارە سەرەکییەکانی ڤێلچانینۆڤ بداتەوە. بەتایبەت ئەو پرسیارانەی پەیوەست بووایە بە پەیوەندیی نێوان خۆی و باوکی لە ڕابردوودا، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی بێدەنگ ببێت بەرامبەر بەو جۆرە پرسیارانە. لە کاتێکدا ڤێلچانینۆڤ قسەی بۆ دەکرد، دەستەکانی ئەو هەر وەک پێشتر، لەناو دەستەکانیدا بوو، بەری نەدەدا، کچەکەش هەوڵی دەرهێنانی دەستەکانی خۆی نەدەدا لەناو دەستەکانی ئەودا. لە ڕاستیدا کیژەکە تەواوی کاتەکە بێدەنگ نەبوو. هەرچۆنێک بێت، هەندێک جار بەشڵەژاوی هەندێک وەڵامی لە زار دەر دەچوو، لەمەشەوە ڤێلچانینۆڤ بۆی دەر کەوت، کە ئەم کچە پێشتر باوکی لە دایکی زیاتر خۆش ویستووە، چونکە لە سەرەتادا باوکی زۆر شەیدای بووە و دایکیشی هێندە بایەخی پێ نەداوە، بەڵام کاتێک دایکی لە سەرەمەرگدا دەبێت، لەو کاتەدا کە هەمووان ژوورەکەیان چۆڵ کردبوو، تەنها هەردووکیان لە ژوورەکەدا بەتەنیا مابوونەوە، لیزای بەتوندی لە ئامێز گرتووە و ماچی کردووە، هەروەها

زۆریش گریاوە بۆی... ئیتر ئا بەم شێوەیە، ئێستا دایکی لە هەموو کەس زیاتر خۆشتر دەویست، لە هەموو کەس زیاتر، زیاتر لە هەرکەسێکی ئەم دنیایە، هەموو شەوێکیش لە هەموو کەسێک زیاتر خۆشی دەوێت. بەڵام منداڵەکە، بەدڵنیاییەوە زۆر بە خۆیدا دەنازی، هەر لەبەر ئەمە، کاتێک هەستی کرد زیاتر لەوەی پێویست بووە قسەی کردووە، کتوپڕ سەرلەنوێ لە بێدەنگییە قووڵەکەی خۆی ڕۆ چووەوە و بەکینەشەوە لە ڤێلچانینۆڤی ڕوانی، چونکە پێی وا بوو ئەو وای لێ کردووە ئەم هەموو شتە بڵێت. کاتێک ئەم گەشتە لە کۆتاییەکەی نزیک دەبووەوە، تووڕەیی و قینەکەی خەریک بوو بەتەواوی بزر دەبوو، بەڵام لە بیرکردنەوەدا نوقم ببوو، ڕوانینەکەی لە ڕوانینی ئاژەڵەێکی دڕندە دەچوو، ڕوخساری گرژ کردبوو، دڵتەنگ و مانگرتوو بوو. ڕاستی ئەوەی دەبرێت بۆ لای خێزانێکی غەوارە و هەرگیز پێشتریش لایان نەبووە، وا دەر دەکەوت لەو کاتەدا ئەوە ئەو شتە نەبێت، کە ئازاری بدات، ئەوەی ئازاری دەدا شتێکی تر بوو. ڤێلچانینۆڤ هەر زوو پەیی بەوە برد؛ وا گومانی برد، کە ئەو کچە شەرمەزار بووە لە بەردەمیدا. خۆی بە شەرمەزار دەبینێت، کە باوکی ئاوها بەسانایی ڕێی پێ داوە لەگەڵیدا بڕوات، وەک ئەوەی باوکی ویستبێتی لەکۆڵ خۆی بکاتەوە.

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "ئەو نەخۆشە، ڕەنگە زۆر خراپیش نەخۆش بێت، ڕەنگە ئازاری زۆر چەشتبێت... ئاخ، ئەی ئارەقخۆری خوێڕی! ئێستا لێی تێدەگەم!"

داوای لە گالیسکەوانەکە کرد خێراتر لێبخوڕێت. هیوایەکی زۆری بەو گوندە، بە ئاووهەوا سازگارەکەی، بە باخەکانی،

بە منداڵەکان، هەروەها بەو ژیانە نوێیەی چاوەڕوانیەتی، هەبوو. پاشان، سەبارەت بەوەی دواتر ڕوو دەدەن... بەڵام هیچ گومانێکی نەبوو لەوەی داهاتوویەکی پرشنگدار و پڕ لە هیوا چاوەڕوانیەتی. بەم شێوەیە، تاقە شتێک دەیزانی و تەواو لێی دڵنیا بوو، ئەوە بوو هەرگیز لەوەوپێش ئەم هەستەی ئێستای نەبووە، کە ئێستا ئەزموونی دەکات و پێی وا بوو هەرگیزیش ئەم هەستە لە ژیانیدا جێی ناهێڵێت. بیری کردەوە بە شێوەیەک، کە هەستی بە سەرکەوتن کردبێت، دەیوت، "ئامانجی سەرەکی، هەر ئەمەیە! ژیان هەر ئەمەیە!"

بیرۆکەگەلێکی مەزن بەهوروژم بە مێشکیدا برووسکەی کرد، بەڵام لەسەر هیچ یەکێک لەو بیرۆکانە هەڵوێستەی نەدەکرد و هەر بەلاساری وردەکاریی بیرۆکەکانی وەلاوە دەنا. هەر هێندەی وردەکارییەکەی وەلاوە دەنا، هەموو شتێک ڕوونتر دەر دەکەوت، هیچ شتێکیش جێگەی پرسیار نەبوو. پلانەکەی بۆ جووڵەکانی دواتری، بەڵگەنەویست بوو.

وەک ئەوەی بەوریاییەوە بیر لە شتێک بکاتەوە، لە دڵی خۆیدا وتی، "دەتوانرێت بە یەکخستنی هێزەکانمان، کار لەسەر ئەم بەدفەڕە بکرێت، بەم شێوەیە سەرەتا بەناچاری لیزا لە پترسبۆرگ لەلای خێزانی پۆگوریلتسێڤ بەجێ دەهێڵێت، هەڵبەت ئەمە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، دواتر خۆشی بەتەنیا گەشت دەکات و بەم شێوەیەش لیزا بۆ من بەجێ دەمێنێت، ئیتر ئەمە هەموو شتێکە. ئێ منیش لەمە زیاتر چیم دەوێت؟ هەروەها... بەدڵنیاییەوە، خودی خۆشی هەر ئەمەی دەوێت، ئەگینا بۆچی ئاوا ئازاری دەدات؟"

دواجار گەیشتن. بەڕاستی ئەو گوندەی ماڵەکەی خێزانی

پۆگوریلتسیڤی لێ بوو، تا بڵێی دڵڕفێن و جوان بوو. سەرەتا یەک ڕەوە منداڵ لە هەیوانەکەوە بەهەراوهوریا بەرەو ڕوویان هێرشیان برد و پێشوازییان لێ کردن، ماوەیەکی درێژ بوو ڤێلچانینۆڤ سەردانی نەکردبوون، منداڵەکان لە خۆشیی سەرلەنوێبینینەوەی ڤێلچانینۆڤ، تەواو خرۆشابوون، ڕوخساریان لە خۆشیدا دەگەشایەوە، زۆر هۆگری ڤێلچانینۆڤ بوون، پێش ئەوەی ڤێلچانینۆڤ لە گالیسکەکە بێتە دەرەوە، گەورەترین منداڵی خێزانەکە هاواری کرد، "بەڕاست دۆسیەکەتان چیی بەسەر هات؟ ئەی گەیشتن بەکوێ لەگەڵیدا؟"

تەنانەت گچکەترین منداڵیش بە پێکەنینێکی منداڵانەو پاک و بێگەردەوە هەمان شتی دووبارە کردەوە، پاشان هەموو منداڵەکان بەیەکەوە، بەوپەڕی شادییەوە لاساییی گەورەکەیان کردەوە و هەمان پرسیاریان کردەوە. حەزیان دەکرد کەمێک گاڵتەوگەپی لەگەڵدا بکەن سەبارەت بە دۆسیەکەی. بەڵام هەر هێندە لیزایان بینی، خێرا چواردەوریان دا و بەکونجکاوی، بە بێدەنگییەکی وردی منداڵانە کەوتنە سەرنجدان و وردبوونەوە لێی. پاشان کلاڤدیا پترۆڤنا لەگەڵ مێردەکەی هاتنە دەرەوە. ئەمیش لەگەڵ مێردەکەی، بە هەمانشێوە بەپێکەنینەوە سەرەتا پرسیاری دۆسیەکەیان لێ کرد.

کلاڤدیاپترۆڤنا خاتوونێک بوو، کە تەمەنی دەوروبەری سیوحەوت ساڵێک دەبوو، لەشولاری پتەو بوو، هێشتاش هەر جوان دەر دەکەوت، پێستی گەنمڕەنگ بوو، ڕوخساریشی پەمەییەکی کاڵی ناسک بوو. مێردەکەی تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵ دەبوو، تا بڵێی پیاوێکی بیرتیژ و زیرەک بوو. لەسەروو

هەموو ئەمانەشەوە، کەسێکی تا بڵێی خۆشخولق بوو. ماڵەکەی ئەوان، بەلای ڤێلچانینۆڤەوە، وەک ماڵی خۆی وا بوو، هەر بەو شێوەیەی خۆی گوزارشتی لێ دەکرد. بەڵام هۆکاری ئەم هەستەی ڤێلچانینۆڤ سەبارەت بەو ماڵە، لە ڕاستیدا بارودۆخێکی شاردراوە و تایبەتیی هەبوو، کە ئەویش، دەگەڕایەوە بۆ بیست ساڵ بەر لە ئێستا، کلاڤدیا پترۆڤنا، ئەو کاتەی هێشتا ڤێلچانینۆڤ خوێندکارێکی لاو بوو و لەوەدا بوو شووی پێ بکات. ئەمە بریتی بوو لە یەکەم خۆشەویستی، کە لەنێوانیاندا دروست ببوو، خۆشەویستییەکەشیان، خۆشەویستییەکی بەتین، پێکەنیناوی، تا بڵێی جوان بوو. بەڵام هەرچۆنێک بێت، ئەم خۆشەویستییە بە شووکردنی کلاڤدیا بە پۆگۆریلتسێڤ کۆتایی هاتبوو. دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ، سەرلەنوێ چاویان بە یەکتر کەوتبووەوە، خۆشەویستییەکەشیان بەتەواوی گۆڕابوو بۆ هاوڕێیەتییەکی هێمن و بێخەوش. ئەوەی لەو پەیوەندیی خۆشەویستییەی نێوانیان بەجێ مابوو، بریتی بوو لە دۆستایەتییەکی بەتین، کە دڵی هەردووکیانی ڕۆشن دەکردەوە و ئەم دۆستایەتییە جوانەش بۆ هەمیشە مایەوە لەنێوانیاندا. لە بیرەوەریی ڤێلچانینۆڤدا، ئەم هاوڕێیەتییە پاکترین و بێخەوشترین پەیوەندیی بووە کە هەیبووە، پێدەچوو ئەو خۆشەویستییە بۆ ئەو، ڕووداوێکی ناوازە بووبێت لە ژیانیدا، هەر بۆیە بایەخێکی تایبەتی هەبوو لای. لێرە، لەناو ئەم خێزانەدا، ڤێلچانینۆڤ کەسێکی سادە بوو، میهرەبان و دڵسۆز بوو، یاریی لەگەڵ منداڵەکان دەکرد، هەموو هەستەکانی وەک خۆی نیشان دەدا، پێی لە هەموو هەڵەکانی خۆی دەنا، هەرگیزیش

هیچ فیزیکی نەدەنواند. زیاد لە جارێک سوێندی بۆ خێزانی پۆگۆریلتسیڤ خواردبوو، کە ڕۆژێک واز لە هەموو شتێک دەهێنێت و دێت لەگەڵ ئەماندا دەژی و هەرگیز جارێکی تر بەجێیان ناهێڵێت. لە دڵی خۆیدا زۆر بەڕاستی بیری لەم پلانە کردبۆوە.

ئەوەی پێویست بوو لەسەر لیزا بیزانن، بە هەندێک وردەکارییەوە پێی وتن، هەرچەند لە ڕاستیدا تەنیا یەک داواکاری لەلایەن خۆیەوە بەس بوو، کە سەرپەرشتیی منداڵەکەی بۆ لەئەستۆ بگرن و پێویستی بە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی تایبەتیش نەدەبوو. کلاڤدیا پترۆڤنا منداڵەکەی ڕاموسی و لەلایەن خۆیەوە بەڵێنی دا هەرچی لەدەست بێت، دەرهەق بەم منداڵە دریغی نەکات. منداڵەکان دەستی لیزایان گرت و لەگەڵ خۆیان بردیان تا لە باخەکەدا یاری بکەن. دوای نیوکاتژمێرێک لە گفتوگۆیەکی گەرموگوڕ، ڤێلچانینۆڤ لە شوێنی خۆی هەستا و ڕووخسەتی ماڵئاواییکردنی خواست. هێندە بێئۆقرە ببوو، کە هەمووان بەتەواوی پەییان بە بێئۆقرەییەکەی برد. هەموویان واقیان وڕ مابوو. ئاخر ماوەی سێ دانە هەفتە دەبوو چاوی پێیان نەکەوتبوو، کەچی ئێستا، دوای نیوکاتژمێر، دەڕوات. پێکەنی و بەڵێنی دا ڕۆژی دواتر بگەڕێتەوە. هەموویان تێبینیی ئەوەیان کرد، کە ڤێلچانینۆڤ وا دەر دەکەوت بەڕاستی دڵخۆش بێت، لەناکاو دەستی کلاڤدیا پترۆڤنای گرت و بە پاساوی ئەوەی لەبیری چووە شتێکی گرنگی پێ بڵێت، پەلکێشی ژوورێکی تری کرد.

"بیرت دێت چیم پێ وتیت - بەتەنیا تۆ - سەبارەت بەو یەک ساڵەم لە شاری ت، ئەو شتەی تەنانەت هاوسەرەکەشت

هیچ نازانێت لەبارەیەوە؟"

"بەتەواوی لەبیرمە، گەلێک جار باست کردبوو."

"نا، ئەوە باسکردن نەبووە، بەڵکوو ئەوە دانپیدانان بووە تەنیا لای تۆ، تەنیا لای تۆ! هەرگیز نازناوی ئەو خانمەم پێ نەوتبوویت، ئەو خانمە ژنی ئەم پیاوەیە، تروسۆتسکی. ئەو ژنە کۆچی دوایی کردووە، لیزاش کە کچی ئەوە - کچی منە!"

کلاڤدیا پترۆڤنا بە کەمێک ڕووگەشییەوە پرسیی، "تۆ دڵنیایت لەوە؟ دڵنیایت بەهەڵەدا نەچوویت؟"

ڤێلچانینۆڤ بەوپەڕی شادییەوە وەڵامی دایەوە، "بەتەواوی دڵنیام، بەتەواوی دڵنیام، کە بەهەڵەدا نەچووم!"

پاشان تا پێی کرا، لەوپەڕی کورتیدا، بە خێرایی و شادییەکی زۆرەوە، هەموو شتێکی پێ گوت. ڕاستییەکەی، کلاڤدیا پترۆڤنا سەرجەمی ئەو چیرۆکەی دەزانی، تەنها ناوی خانمەکە نەبێت.

ڤێلچانینۆڤ هەمیشە لەوە دەترسا، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک لەو کەسانەی دەیناسین، بەڕێکەوت چاوی بە خاتوو تروسۆتسکی بکەوێت و بەوە بزانن، کە چەندێک ئەم ژنەی خۆش ویستووە، بۆیە هەتا ئەو ڕۆژەش نەیوێرابوو ناوی *ئەو ژنە* ئاشکرا بکات لای هیچکەس، تەنانەت لای تاقە هاوڕێکەشی، کلاڤدیا پترۆڤنا.

کلاڤدیا پترۆڤنا کاتێک گوێی لە چیرۆکەکەی بوو، لێی پرسی، "واتە باوکەکەش هیچ نازانێت؟"

"بە... بەڵێ، ئەو دەزانێت... بەڵام ئەوەی زۆر نیگەرانم دەکات، ئەوەیە هێشتا بۆم یەکلایی نەبۆتەوە!"

ڤێلچانینۆڤ وردەوردە پەرۆشی بە ڕوخسارییەوە دەر دەکەوت. پاشان بەردەوام بوو، "ئەو دەزانێت، ئەو دەزانێت؛ ئەمڕۆش و دوێنێش تێبینیی ئەوەم کرد. بەڵام ئەبێت بزانم تا چ ئاستێک دەزانێت. هەر لەبەر ئەمەیە کە ئێستا پەلەمە. ئەم ئێوارەیە دێت بۆ لام. هەرچەندێکی دەیهێنم و دەیبەم، ناتوانم لەوە تێبگەم، مەبەستم ئەوەیە تێناگەم چۆن بەم بابەتەی زانیوە - چۆن بە هەموو شتێکی زانیوە! هیچ گومانێکی تێدا نییە، کە سەبارەت بە باگاوتۆڤ هەموو شتێک دەزانێت. بەڵام سەبارەت بە من؟ خۆت دەزانیت ژنان چەند زیرەکن لە دڵنیاکردنەوەی مێردەکانیان لە بابەتگەلێکی وەهادا! ئەگەر فریشتەیەک لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە، ئەوا پیاو هەرگیز باوەڕی پێ ناکات، کەچی بڕوا بە ژنەکەی دەکات! سەرت ڕامەوشێنە و لۆمەشم مەکە، چوون من لۆمەی خۆم دەکەم، ڕاستییەکەی، زۆر لەمەوپێش لۆمەی خۆمم کردووە، لەسەر هەموو ئەو شتانەی ڕووی دا، زۆر لەمەوپێش!... ببینە، من زۆر لەوە دڵنیام کە ئەو دەزانێت، ئەم بەیانییە، کاتێک لەوێ بووم، خۆم ڕسوا کرد لە بەردەمیا. بڕوا بەمە دەکەیت، زۆر هەستم بە بێنرخی و شەرمەزاریی خۆم دەکرد، کە دوێنێ زۆر بەڕەقی مامەڵەم لەگەڵدا کردبوو، دواتر هەموویت بە تەواوی بۆ باس دەکەم. دوێنێ هاتبوو بۆ لام، بە ئارەزوویەکی پڕ لە کینە، کە بەری پێ نەدەگیرا تا تێم بگەیەنێت دەزانێت کێ ئابڕووی لەکەدار کردووە، دەشزانێت کێ وای بەسەر هێناوە. ئەمە هەموو هۆکاری هاتنە گەمژانەکەی بوو، لە کاتێکدا سەرخۆشیش بوو. بەڵام ئەمە بەلای خۆیەوە کارێکی تەواو سروشتی بوو! ئاشکرا بوو بۆ ئەوە هاتبوو، تا ڕقی

خۆی بەسەر مندا بەتاڵ بکاتەوە! بە شێوەیەکی گشتی، ئەم بەیانییەش و دوێنێش زۆر تەنگەجیکڵدانانە لەگەڵیا هەڵسوکەوتم کرد! بێباکانە، گەمژانە! خۆمم فریو دا لەبەر ئەو. بۆچی لە وەها ساتێکدا خۆی دەر دەخات، لە کاتێکدا من لەوپەڕی سەرلێشێواویدا بووم؟ با بزانیت، ئەو تەنانەت ئازاری لیزاشی دەدا، ئازاری ئەو منداڵە بەستەزمانە، پێدەچێت ئەمەش هەر لەپێناو بەتاڵکردنەوەی ڕقی خۆیدا بێت، بۆ ئەوەی هەرچیی ڕق و تووڕەییەتی، بەتاڵی بکاتەوە، ئەو بێباکە لەوەی ئەگەر تەنیا ئەو منداڵەشی دەست بکەوێت بۆ بەتاڵکردنەوەی ڕقەکەی! بەڵێ، ئەو داخلەدڵە - تا بڵێی کەسێکی هیچوپووچی لێ دەر چووە. بەڵێ، لە ڕاستیدا هێشتاش هەر زۆر داخلەدڵە. ئێستا بەلای خۆیەوە لە قەشمەرێک زیاتر، چیی دی نییە، هەرچەند مەگەر خودا بۆخۆی بزانێت، کە ڕۆژانی زوو، تا ئەوپەڕی توانای خۆی، کە پێی بکرایە، کەسێکی باش و بەویقار خۆی نیشان دەدا - بەڵام ئێستا کە وای لێ هاتووە، شتێکی زۆر سروشتییە کە ئاوا بکەوێتە ناو گێژاوی پیسی و بۆگەنییەوە! پێویستە مرۆڤ بە دیدێکی مەسیحییانە لەم خاڵە بڕوانێت! دەزانیت خۆشەویستم، ئەی باشترین هاوڕێم، ئەمەوێت بەتەواوی لەگەڵیدا هەڵسوکەوتم بگۆڕم؛ ئەمەوێت میهرەبان بم لەگەڵیدا. بەڕاستی ئەمە دەبێتە کارێکی باش لەلایەن منەوە، بۆ ئەوەی بزانیت، سەرەڕای هەموو شتێک، من ستەمم لەو کردووە! گوێ بگرە، دەزانیت شتێکی تریش هەیە، پێویستە ئەویشت پێ بڵێم. جارێکیان لە شاری ت پێویستم بە چوار هەزار ڕۆبڵ بوو، ئەویش یەکسەر ئەو بڕەی بەقەرد پێ دام، بێ ئەوەی هیچ بارمتەیەکیش داوا

بکات، لەگەڵ ئەوەشدا، خۆشحاڵییەکی ڕاستەقینەی نیشان دا، کە توانیویەتی هاوکاریم بکات. دەزانیت، لەو کاتەدا لێم وەر گرت، ئەو قەردەم لە دەستەکانی ئەو وەر گرت، پارەم بەقەرد لێ وەر گرت، تێدەگەیت وەک هاوڕێیەک!"

کلاڤدیا پترۆڤنا، بۆ وەڵامی هەموو ئەمانە، بەپەرۆشی وتی، "تەنیا زیاتر ئاگاداری خۆت ببە. ئەم شاگەشکەبوونەی تۆ، وام لێ دەکات هەست بە دڵەڕاوکێ بکەم بەرامبەرت! بەدڵنیاییەوە ئێستا لیزاش وەک منداڵی خۆم وایە. بەڵام هێشتا زۆری ماوە، هێشتا شتەکان زۆری ماوە تا بەتەواوی ڕێڕەوی خۆی وەر بگرێت! گەورەترین کار لە ئێستادا کە لەسەرتە بیکەیت، ئەوەیە تا ئەوپەڕی توانات هەوڵ بدەیت ئاگاداری خۆت ببیت؛ بەدڵنیاییەوە پێویستە زۆر ئاگاداری خۆت ببیت، بەتایبەتی لەو کاتانەی دڵخۆشیت یان لە خۆشیدا ئاگات لە خۆت نامێنێت، تۆ کاتێک دڵخۆش دەبیت، گەلێک بەخشندە دەبیت، هەر وەک ئێستا." کلاڤدیا پترۆڤنا ئەم دێڕەی کۆتاییی بە زەردەخەنەوە دەر بڕی.

هەمووان هاتبوونە دەرەوە بۆ بینینی ڕۆشتنەکەی ڤێلچانینۆڤ. ئەو منداڵانەی یارییان لەگەڵ لیزادا دەکرد لە باخەکەدا، لیزایان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. وا دیار بوو منداڵەکان ئێستا لە یەکەم جار زیاتر بەسەرسامییەوە لە لیزا بڕوانن. کاتێک ڤێلچانینۆڤ لەوەدا بوو لێی دابڕێت، لیزای لە بەردەمی هەموویاندا ڕامووسی، زۆر بە گەرمییش بەڵێنەکەی خۆی بۆ دووپات کردەوە، کە سبەینێ لەگەڵ باوکیدا دەگەڕێتەوە بۆ لای، لیزا چیی تر نەیتوانی زاڵ ببێت بەسەر خۆیدا، زۆریش شەرمی دەکرد. هەتا دواخولەکیش،

هەر بێدەنگ بوو تەماشای ڤێلچانینۆڤی نەکرد، بەڵام لەناکاو قۆڵی ڤێلچانینۆڤی گرت و بردی بەولاوە، بە چاوی پڕ لە پاڕانەوەوە چاوی بڕییە چاوەکانی ڤێلچانینۆڤ، دەیویست شتێکی پێ بڵێت. یەکسەر ڤێلچانینۆڤ کیژەکەی بەرەو ژوورێکی تر برد.

ڤێلچانینۆڤ بە بەسۆز و دەنگێکی دڵنیاکەرەوە پرسیاری لێ کرد، "چییە لیزا گیان؟"

بەڵام لیزا هێشتاش هەر بەدوودڵییەوە لە چواردەوری خۆی دەڕوانی، ڤێلچانینۆڤی خزاندە دوورترین سووچی ژوورەکەوە، دەیویست خۆی لە هەموویان بشارێتەوە.

"چییە لیزا؟ کێشە چییە؟"

لیزا لاڵ ببوو، قسەی بۆ نەدەکرا. بێ جووڵە چاوە شینەکانی بڕیبووە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤ، هەموو شەقڵی ڕوخسارە بچووکەکەی لە ترسێکی شێتانە زیاتر، هیچی تری تێدا نەدەبینرا. وەک ئەوەی لەبەر خۆیەوە وڕێنە بکات، بەچرپە وتی، "ئەو... خۆی لەسێدارە دەدات!"

ڤێلچانینۆڤ بەتۆقیوی پرسیی، "کێ خۆی لەسێدارە دەدات؟"

منداڵەکە بەهەناسەبڕکێوە وتی، "ئەو، ئەو! ئەو شەوە دەیویست بە گوریسێک خۆی لەسێدارە بدات! من بینیم! هەوڵی ئەوەی دەدا بە گوریسێک خۆی لەسێدارە بدات، خۆی ئەمەی پێ وتم! خۆی ئەمەی پێ وتم! پێشتریش مەبەستی بوو ئەم کارە بکات، هەمیشە مەبەستی بووە ئەم کارە بکات... خۆم شەوێک بینیم..."

ڤێلچانینۆڤ بەوپەڕی سەرسامییەوە چرپاندی، "مەحاڵە."

لەناکاو لیزا کەوتە ڕامووسینی دەستەکانی ڤێلچانینۆڤ. دەگریا، بەتوندی هەنسکی دەدا، لێی دەپاڕایەوە و تکای لێ دەکرد. بەڵام ڤێلچانینۆڤ نەیتوانی بەباشی لەو چرپەچرپە هیستریییەی ئەو کچە تێبگات. هەرگیز دیمەنی ڕوخساری پڕ لە ئازاری ئەو منداڵەی لەیاد نەدەچوو، کە پێی وا بوو ئەو منداڵە دواهەمین ئومێدیەتی لەم ژیانەدا، بۆیە بۆ هەتاهەتایە لە یادەوەرییەکانیدا مایەوە، ئەو دیمەنە پڕ لە ئازارە لە ئاگاییدا لە کۆڵی نەدەبۆوە، تەنانەت لە خەونەکانیشیدا سەردانی دەکرد.

لە کاتێکدا بەوپەڕی بێئۆقرەیی و نەسرەوتنەوە بەرەو شارۆچکەکە دەگەڕایەوە، بیری دەکردەوە، بە ئیرەیی‌پێبردن و بەغیلییەکەوە لە دڵی خۆیدا دەیگوت، "باشە دەکرێت، دەکرێت ئەم کچە هێندە باوکی خۆش بوێت؟ ئەم بەیانییە خۆی پێی وتم، کە دایکی زیاتر خۆش ویستووە... لەوانەیە ڕقی لێی بووبێت و هەرگیز باوکی خۆش نەویستبێت!... ئەی باشە مەبەستی چی بوو لەوەی خۆی لەسێدارە دەدات؟ ئەبێت مەبەستی چی بووبێت لەوە؟ تۆ بڵێی ئەو گەمژەیە خۆی لەسێدارە بدات؟... پێویستە هەموو شتێک ئاشکرا بکەم، بەدڵنیایییەوە دەبێت هەموو شتێک ئاشکرا بکەم! پێویستە هەرچی زووترە، هەموو شتێک چارەسەر بکەم - یەک جار چارەسەری بکەم و بیبڕێتەوە!

## ٧

# مێرد و دۆست یەکتر ڕادەمووسن

بە شێوەیەکی سامناک پەلەی ئەوەی بوو، کە هەموو شتێک ئاشکرا بکات. لە کاتێکدا بیری لە یەکەم دیداری خۆی لەگەڵ لیزا دەکردەوە، دەیوت، "ئەم بەیانییە زۆر شڵەژابووم. ئەم بەیانییە نەمپەرژایە سەر ئەوەی پەی بە بارودۆخەکە ببەم، بەڵام هەنووکە پێویستە هەموو شتێک ئاشکرا بکەم." هەر بۆ ئەوەی خێرا هەموو شتێک ئاشکرا بکات، لەوەدا بوو فەرمان بە گالیسکەوانەکە بکات، تا بیبات بۆ پەناگەکەی ترۆسۆتسکی، بەڵام خێرا لەو بیرۆکەیەی پاشگەز بووەوە و بڕیاری دا، "نا، باشترە وازی لێ بهێنم خۆی بێت بۆ لام، هەتا ئەویش دێت، منیش هەوڵ ئەدەم هەرچی زووە بەخێرایی ئەم کارە یاساییە نەفرەتییانەم تەواو بکەم."

بە پەرۆشی دەستبەکار بوو، بەڵام ئەم جارە هەستی کرد تەواو هۆشی لای خۆی نییە و لە توانایدا نییە ئەمڕۆ بە کارەکانی ڕابگات. لە کاتژمێر پێنجدا، کاتێک چووە دەرەوە بۆ خواردنی نانی ئێوارە، بۆ یەکەم جار بیرۆکەیەکی

قۆڕ هات بە مێشکیدا: ڕەنگە هەر بەڕاست بە هۆی خۆ تێهەڵقورتاندنی خۆیەوە بێت، لەم دادگا بۆ ئەو دادگا چوون و شوێنکەوتنی پارێزەرەکەی، کە ماوەیەک بوو خۆی لێ دەشاردەوە، بووبێت بە هۆی دواخستنی دۆسیەکەی. لە ناخی دڵییەوە بەم بیرۆکەیەی خۆی پێکەنی. ئەمەشی بە دڵێکی خۆشترەوە زیاد کرد بۆ بیرۆکەکەی، "ئەگەر ئەم بیرۆکەیە دوێنێ بۆم بهاتایە، ئەوا بەڕاستی تووشی خەم و پەژارەی دەکردم." سەرەڕای دڵخۆشییە زۆرەکەشی، کەچی هەر زیاتر و زیاتر بیروهۆشی لای خۆی نەدەما و زیاتر و زیاتریش بێئۆقرە دەبوو. دواجار لە بیرکردنەوەیەکی قووڵ ڕۆ چوو هەرچەندە بیرکردنەوە تێکەڵوپێکەڵەکانی یەک بەدوای یەک بە شتگەلێکی زۆری دەگەیاند، بەڵام نەیدەگەیاند بەو شتەی قایلی بکات.

دواجار بڕیاری دا، "پێویستم بەو مرۆڤەیە! پێویستە مەتەڵەکانی ئەو پیاوە هەڵبهێنم، دواتر دەتوانم بیروهۆشی خۆم کۆ بکەمەوە. ئەمە جەنگێکی ڕاستەقینەیە!"

کاتژمێر حەوت کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، پاڤێل پاڤلۆڤیچی نەبینی و سەرەتا زۆر سەری سووڕ ما، پاشان لەڕادەبەدەر تووڕە بوو، دواتریش بێئەندازە ماتومەلوول ما، لە کۆتاییشدا، وردەوردە ترسوبیم بەرۆکی گرت.

لە کاتێکدا لەناو ژوورەکەیدا خەریکی هاتوچۆ بوو، یان هەندێک جار خۆی لەسەر چەرپاکە درێژ دەکرد، بەردەوام لە کاتژمێرەکەی دەڕوانی و ئەمەی دووبارە دەکردەوە، "خوا دەزانێت، خوا دەزانێت ئەمە کەی کۆتایی دێت!" لە کۆتاییدا دەوروبەری کاتژمێر نۆ بوو، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەر کەوت.

لە دڵی خۆیدا وتی، "ئەگەر ئەم ڕسوایە هەوڵی ئەوەی ئەدا لەخشتەم بەرێت، ئەوا هەرگیز لەم ساتە لەبارتری دەست نەدەکەوت تا لە بۆسەی خۆیم بنێت - چوون لەم ساتەدا بەتەواوی سەرلێشێواوم." بەتەواوی دڵنیایی بۆ گەڕایەوە و کەمێک گیانی وەبەردا هاتەوە.

بەگەرمی و بە ڕوویەکی خۆشەوە پرسیاری ئەوەی لێ کرد، کە هۆکار چیی بووە ئا بەو شێوەیە درەنگ کەوتووە، پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەزۆر زەردەخەنەیەکی خواروخێچی بۆ کرد، بە گرنگیپێنەدان و جۆرێک لە ئاسوودەیی لێی دانیشت، هەڵسوکەوتی تەواو جیاواز بوو لە شەوی پێشووتر، بەلامسەرلایی کڵاوەکەی، کە شریتە ڕەشەکەی پێوە بوو، لە سەری خۆی داکەند و فڕێی دایە سەر کورسییەکی نزیک خۆیەوە. ڤێلچانینۆڤ یەکسەر هەستی بەم هەڵسوکەوتە و ئەم بێبایەخییەی میوانەکەی کرد و خۆی ئامادە کرد بۆ هەر پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو.

بەهێواشی، بەبێ ئەوەی وشەیەک چییە بەفیڕۆی بدات، بێ ئەوەی هیچ جۆرە دڵخۆشییەک لەو دڵخۆشییەی خۆی نیشان بدات کە ئەم بەیانییە هەیبوو، دەستی کرد بە گێڕانەوەی چۆنێتیی گەشتەکەی لەگەڵ لیزادا، بۆی باس کرد چەند بەمیهرەبانییەوە پێشوازیی لێ کراوە و بۆی ڕوون کردەوە، کە مانەوەی لیزا لەوێ، چەند بەسوودە بۆی، وردەوردە، بە شێوەیەک کە هەستی پێ نەکرێت، ئاڕاستەی گفتوگۆکەی بەتەواوی بەلای خێزانی پۆگۆریلستێڤدا گۆڕی، وەک ئەوەی ئەسڵەن لیزای هەر بیر نەمابێت، باسی لە دڵفراوانییەکەیان دەکرد، باسی لەوە دەکرد، کە چەند

لەمێژە دەیانناسێت، باسی لەوە دەکرد، کە پۆگۆریلستێڤ چەند پیاوێکی چەلەنگ و کاریگەرە، گەلێک شتی تریش. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەخوێنساردییەکەوە گوێی بۆ ڕادێرابوو ناوەناوەش لەژێر برۆکانیەوە، بە شێوەیەکی تەوساوییەوە، چاوی دەبڕییە ڤێلچانینۆڤ و بزەیەکی تەواو گاڵتەجاڕانەی بۆ دەکرد.

هەر بەمەبەست بەڕووگرژییەوە زەردەخەنەیەکی ژەهراویی کرد و لەژێر لێوەوە بەخوتەوبۆڵەوە وتی، "تۆ کەسێکی هەوەسپەرستیت."

ڤێلچانینۆڤ، کە زویر ببوو، خێرا بەرپەرچی دایەوە، "بە هەمان شێوە، ئەمڕۆ جەنابیشت تا خوا حەزکات مرومۆچن."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەناکاو شیڕاندی، وەک ئەوەی چاوەڕوانی وەها ساتێکی کردبێت، تا داخی دڵی خۆی بڕێژێت، "بۆ نابێت منیش وەک ئەو خەڵکە مڕومۆچ بم!"

ڤێلچانینۆڤ پێکەنی، "تۆ سەربەستیت لەوەی بتەوێت هەرچۆنێک بیت، تەنها خەمی ئەوەم بوو، کە بەڵایەکت بەسەر نەهاتبێت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ قیژاندی، وەک ئەوەی لافی ئەوە لێبدات کە شتێک ڕووی دابێت، "بەڵێ، بەسەرمدا هاتووە!"

"چی بووە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەمێک وەڵامەکەی دوا خست، پاشان وتی، "دیسانەوە، ستیپان میخایلۆڤیچەکەمان تەفرەی دامەوە... مەبەستم باگاوتۆڤە، ئەو لاوە پترسبۆرگییە جوانپۆش و بەڕێزە، ئەوەی لە باشترین چینی کۆمەڵایەتییە."

"دووبارە لە ماڵ نەبوو؟"

"نا، ئەم جارە لە ماڵ بوو. ئەم جارە بۆ یەکەم جار بوو ڕێیان دام چاوم پێی بکەوێت، چاوەکانم بڕییە ڕوخساری... بەڵام ئەو گیانی سپاردبوو!"

ڤیلچانینۆڤ بە شێوەیەکی تۆقینەر لە شوێنی خۆیدا تاسابوو، هەرچەندە هیچ هۆکارێکی ڕوون نەبوو بۆ ئەوەی بەو شێوەیە بتاسێت، "وتت چ... چی! باگاوتۆڤ گیانی سپاردووە؟"

"بەڵێ، هاوڕێی لەمێژینە و ڕاستگۆمان، هاوڕێی شەشساڵەمان! تەنها دوێنێ، دەوروبەری نیوەڕۆ بوو، کە گیانی سپاردبوو، من هیچ شتێکم لەو بارەیەوە نەدەزانی! پێم وا بێت لەو ساتەدا چووم، تا هەواڵێکی تەندروستییەکەی بپرسم. سبەینێ مەراسیمی بەخاکسپاردن و پرسەکەی دەگێڕدرێت، پێشتر کفنیان کردووە و لە تابووتیان ناوە. تابووتەکەی بە بەرگێکی قرمزی ڕووپۆش کراوە و ناوەکەشی بە مەخمەلێکی ئاڵتوونی... بە هۆی هەوکردنی مێشکەوە گیانی سپاردبوو. ڕێیان دام ببینم. ئەمەوێت لێت بپرسم، کە ئەمە چ مامەڵەیەکی ناوەخت بوو کە ئەو لەگەڵ من کردی، ئەم هاوڕێ ڕاستگۆ و لەمێژینەیەم، ئەو کەسەی بۆ شەش دانە ساڵی ڕەبەق هاوڕێم بوو؟ ئەزانی پێم وا بێت هەر لەبەر بینینی ئەویش بوو، کە هاتم بۆ پترسبۆرگ!"

ڤیلچانینۆڤ بزەیەکی کرد، "بەڵام بۆچی توورەیت لێی؟ خۆ ئەو داماوە بەئەنقەست نەمردووە!"

"بەڵام من ئەم قسانەم بەوپەڕی پەژارەوە و لە ناخی دڵمەوە کرد، ئەو هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویست بوو، ئەگەر بتزانیبا چەند بۆ من جێگەی بایەخ بوو، ئەوکات ڕەنگە

حەقت پێ بدامایە کە ئاوا بۆی بەپەرۆشم!"

کتوپڕ، بە شێوەیەکی تەواو چاوەڕواننەکراو، پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەردوو پەنجەی لە شێوەی جووتێک شاخدا بەرز کردەوە و خستیە سەر ناوچاوانە ڕووتاوەکەی و لەژێر لێوەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ هەر پێدەکەنی، نیوخولەکێک بەم شێوەیە دانیشتبوو، هەر لەبەر خۆیەوە پێدەکەنی و بە شێوەیەکی شێتانە و پڕ لە کینە و بێشەرمانە، چاوەکانیشی بڕیبووە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤ. ڤێلچانینۆڤ لە شوێنی خۆیدا سڕ ببوو، وەک ئەوەی لە بەردەم هەندێک خێودا ڕاوەستابێت. بەڵام ئەم سڕبوونە تەنها ماوەیەکی زۆر کورتی خایاند؛ زەردەخەنەیەکی تەوساوی پڕ لە بێشەرمی، بەهێمنی و لەسەرخۆ کەوتە سەر لێوەکانی. بەخوێنساردییەوە و بە منجەمنج لێی پرسی، "ئەمە مانای چییە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، لە کاتێکدا پەنجەکانی بۆ دواجار لەسەر ناوچەوانی دوور خستەوە، بەبێ ترس وتی، "ئەمە مانای ئەوەیە، کە شاخە!"

"ئەوانە شاخی تۆن؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە شێوەیەکی زۆر ناحەز و دزێوەوە وتی، "بەڵێ، هیی خۆمن، بە لێهاتوویی خۆم بەدەستم هێناون!"

هەردووکیان بێدەنگ بوون.

ڤێلچانینۆڤ وتی، "پێویستە بڵێم، کە تۆ کەسێکی زۆر بەجەرگیت!"

"بۆچی؟ هەر لەبەر ئەوەی ئا بەو شێوەیە سیمای خۆمم بۆ دەر خستیت؟ ئەزانی ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، باشتر نییە کە شتێکم پێشکەش بکەیت؟ تەواوی ئەو یەک ساڵەی لەلامان

بوویت لـە ت، ڕۆژ نەبوو بەجوانی میوانداریت نەکەین. داوای زۆر ناکـەم، تەنهـا بنێـرە یـەک بوتـڵ بهێنـن، گـەرووم وشـک بۆتـەوە."

"بەوپـەڕی خۆشـحاڵییەوە، ئەبووایـە پێشـتر قسـەت بکردایـە. چ شتێکت بۆ بهێنم بۆ ئـەوەی بیخۆیتـەوە؟"

"بۆچـی ئەڵێیـت بۆت بهێنم بیخۆیتـەوە؟ بڵێ چـی بهێنـم تـا بەیەکـەوە بیخۆینـەوە، بەیەکـەوە دەخۆینـەوە، وا نییـە؟"

پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ وای پـێ وت، لـە کاتێکدا چـاوی بڕیبـووە ڕوخسـاری ڤێلچانینـۆڤ، وەک ئـەوەی ململانێـی لەگەڵـدا بـکات، بـەڵام لـە هەمـان کاتیشـدا شـڵەژاوییەکی زۆریـش بـە ڕوخسـارییەوە دەبینـرا.

"شەمپانیا؟"

"چی لە شـەمپانیا زیاتر؟ هێشتا کاتی ڤۆدکا نەهاتووە..."

ڤێلچانینـۆڤ لەسـەرخۆ لـە شـوێنی خـۆی هەسـتا، زەنگـی بـۆ ماڤـرا لێدا و داواکارییەکانـی پـێ ڕاگەیانـد.

پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ بـە پێکەنینێکـی تـەواو نەشـیاوەوە وتـی، "ئەخۆینـەوە بـە خۆشـیی دووبارەیەکتربینینـەوە پرشـنگدارەکەمان دوای نـۆ سـاڵ دووری، ئێسـتا تـۆ تەنهـا تـۆ تاقـە هاوڕێیـت، کـە بـۆم بەجـێ ماویـت! چیـی تـر سـتیپان میخایلۆڤیـچ باگاوتـۆڤ بوونـی نەمـا! هـەر وەک هۆزانڤـان دەڵێـت:

پاترۆکڵی* مـەزن چیی تر بوونی نەما،

* پاترۆکڵ: پاڵەوانی یۆنانی، هاوڕێی ئاکیلی، کە لە گەمارۆدانی تەروادە بەشدار بوو. لە کاتێکدا ئاکیلی سەبارەت بە ئاگامێمنون تووڕە ببوو و لە جەنگکردن دەستی هەڵگرتبوو، بۆ خێمەکەی خۆی گەڕابۆوە، پاترۆکڵ بە چەکی پاڵەوانانە خۆی پرچەک دەکات و لەگەڵ سەرلەشکری تەروادە

سیرسایتی* بێنرخ هێشتا هەر دەژی!
کە گەیشت بە ناوی سیرسایت، پەنجەی خستە سەر
سنگی خۆی.

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا کەوتە ئاخاوتن لەگەڵ خۆیدا، "دەی مالۆس، باشترە هەرچی زووترە دەست بکەیت بە قسەکردن، حەزم بە سووسەکردن نییە." توورەییەکەی تەواو زیادی کردبوو، بۆ ماوەیەکی درێژ بەگران توانیی زاڵ ببێت بەسەر خۆیدا.

ڤێلچانینۆڤ بە ژێیەکی تا ڕادەیەک توورەوە وتی، "پێم بڵێ، لەو کاتەوەی جەنابت ستیپان میخایلۆڤیچ تۆمەتبار دەکەیت،" چیی تر ڤێلچانینۆڤ ئەوی بە باگاوتۆڤ ناو نەدەبرد، "من وا بیر دەکەمەوە، کە دەبێت تۆ خۆشحاڵ بیت بەوەی ئەو کەسەی ئەتکی ناموسی کردوویت، هەنووکە مردووە، ئیتر نازانم بۆچی دەبێت ئاوا توورە بیت؟"

"خۆشحاڵ! بۆچی خۆشحاڵ بم؟"

"وا خەیاڵ دەکەم، کە ئەوانە هەستی ڕاستەقینەی تۆ بن."

"ها، ها! ئەمەویت پێت بڵێم، کە جەنابت سەبارەت بە هەستەکانی من تا سەر ئێسکان لە هەڵەدان سەبارەت

---

دەکەوێتە جەنگەوە و بە دەستی هیکتۆر دەکوژرێت. هەر لە تۆڵەی وەرگرتنەوەی خوێنی ڕژاوی پاترۆکلدا دەبێت، کە سەرلەنوێ ئاکیلی دەگەڕێتەوە ناو ڕیزەکانی سوپای یۆنانی و لە دژی دانیشتووانی تەروادە دەکەوێتەوە جەنگ.

* سیرسایت: یەکێک لە کارەکتەرەکانی ناو کتێبی ئیلیادەی هۆمیرۆسی یۆنانی، کە کارەکتەرێکی بێغیرەت و ڕسوایە. خێڵ و شەلە، بێئەدەبییەکەی دەگەیەنێتە ئاستێک، کە گاڵتە بە ئاکیلی دەکات و ئاکیلییش لەسەر دەمدرێژییەکەی دەیکوژێت.

بەو مەسەلەیە، هەر وەک هەندێک لە دانایان فەرموویانە: 'دوژمنی مردوو باشە، بەڵام هیی زیندوو باشترە،' ها، ها!"

ڤێلچانینۆڤ بێشەرمانە و داخلەدڵانە وتی، "بەڵام تۆ بۆ ماوەی پێنج دانەساڵی ڕەبەق ڕۆژ نەبووە ڕاستەوخۆ نەیبینیت، باوەڕم وایە کاتی تەواوت لە بەردەستدا بووە تا بەتەواوی هەڵسەنگاندنی بۆ بکەیت."

"بەڵام ناشێت وا تێگەیشتبیت، کە ئەو کاتە زانیومە... ناشێت وا گومانت بردبێت، کە ئەو کاتە زانیومە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەک ئەوەی سەرلەنوێ بەتەواوی فڕێ درابێتە قوژبنێکەوە، لە شوێنی خۆی قوت بۆوە، پێدەچوو گەلێک دڵخۆش بێت بەو پرسیارە و لەمێژ بێت چاوەڕێی ورووژاندنی وەها پرسیارێک بێت.

"ئەتەوێت بەم قسانەت بەرەو کوێم بەریت، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ؟"

هەروەها ڕووناکیی شتێکی نوێ و تەواو چاوەڕواننەکراو لە ڕوخساریدا دەدرەوشایەوە، کە وا دەر دەکەوت ئەو ڕوخسارەی تا کەمێک بەر لە ئێستا پڕ بوو لە کینە و مرومۆچییەکی قێزەون، بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا هاتبێت.

ڤێلچانینۆڤ شڵەژا بوو و بەتەواوی واقی وڕ مابوو، وتی، "یانی ڕێی تێ دەچێت تۆ لەو کاتەدا هیچت نەزانیبێت؟"

"ڕێی تێ دەچوو کە بزانم؟ ڕێی تێ دەچوو کە بزانم؟ ئاخ لەدەست ئێوە، وەچەکانی ژوپیتێر! لەلای ئێوەمانان مرۆڤ لە سەگێک زیاتر، چیی دی نییە، هەمووان بەپێی سروشتە چرووکەکەی خۆتان دادوەری دەکەن. ئێوە هەر وان! سروشتتان وایە!"

لە کاتێکدا وای دەوت، بەپەلەپڕوزکێ بە بۆکسێک زرمەی لە مێزەکە هەڵساند، بەڵام یەکسەر بە هۆی دەنگەکەوە داچڵەکی و پێدەچوو دەنگەکە ترساندبێتی.

ڤێلچانینۆڤ وا خۆی نیشان دەدا، بەحساب هێمنیی خۆی پاراستووە، "گوێ بگرە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، بەدڵنیاییەوە ئەم شتە هیچ بایەخێکی نییە بۆ من، هەر وەک خۆت دەیبینیت، تۆ زانیبێتت یان نەتزانیبێت. بە هەرحاڵ، ئەگەر نەتزانیوە، ئەمە لە هەموو حاڵەتێکدا بۆ ناو و ناوبانگی خۆت باشترە... بەڵام هەرچۆنێک بێت، من لەوە تێناگەم، بۆچی منت هەڵبژارد و متمانەت بە من کرد؟..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە کاتێکدا سەری ڕوو بە عەردەکە نەوی کردبوو، بەخوتەوبۆڵەوە وتی، "مەبەستم تۆ نەبوو... تووڕە مەبە. مەبەستم تۆ نەبوو..."

لەو کاتەدا ماڤرا بە خۆی و شەمپانیاکەوە خۆی کرد بە ژوورەوەدا.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، دیار بوو بە هاتنەژوورەوەی ماڤرا گەلێک دڵخۆش ببوو، وەک ئەوەی گیانی وەبەر هاتبێتەوە، لە خۆشیدا هاواری کرد، "ئەوەش شەمپانیاکەمان! پەرداخ، کچە باشەکەم، پەرداخ بێنە، بە خوا چاکە! خۆشەویستم، داوای هیچی دیت لێ ناکەین. زۆر چاکە، پێشتر سەرەکەشیان هەڵپچڕیوە! تەمەندرێژ و سەرفراز بیت، کچە نازدارەکەم! فەرموون، ئیتر ئەتوانن بڕۆن بەلای ئیشی خۆتانەوە!"

هەر هێندەی کەمێک غیرەتی وەبەر هاتەوە سەرلەنوێ بەوپەڕی ڕووقاییمییەوە لە ڤێلچانینۆڤی ڕوانییەوە و بە بزەیەکی تەوساوییەوە وتی، "دانی پێدا بنێ، کە ئەم

مەسەلەیە زۆر جێگەی سەرنجتە و بەو شێوەیە نییە، کە بەتەواوی هیچ بایەخێکی نەبێت بۆت، بەڵکوو زۆریش حەز دەکەیت بزانیت، دڵنیام زۆر بێهیوا دەبیت ئەگەر هەر ئێستا هەڵسم و لێرە بڕۆم، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە."

"لێت یەقین بێت، کە تۆزقاڵێکیش چییە بێهیوا نابم."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بزەیەکی وای بۆ کرد، کە تێی بگەیەنێت چ درۆیەکی شاخداری کردووە!

پەرداخەکەی بۆ ڤێلچانینۆڤ پڕ کرد و وتی، "زۆر باشە، با دەست پێ بکەین!"

پەرداخەکەی بەرز کردەوە و وتی، "با پێکەکانمان هەڵدەین، بۆ سەلامەتیی ڕۆحی هاوڕێی کۆچکردوومان، ستیپان میخایلۆڤیچ، کە گەڕاوەتەوە بۆ ئاستانەی خودا."

پەرداخەکەی بەرز کردەوە و پاشان نۆشیی.

ڤێلچانینۆڤ لە کاتێکدا پەرداخەکەی دادەنایەوە، وتی، "من بەوەها بۆنەیەکەوە ناخۆمەوە."

"بۆچی ناخۆیتەوە؟ بەڵام ئەمە بادەنۆشییەکی چێژ بەخشە."

"ئەرێ بەڕاست، تۆزێک پێش ئەوەی بێیت بۆ ئێرە، نەتخواردبۆوە؟"

"با، کەمێکم خواردبۆوە. بەڵام بۆچی دەپرسیت؟"

"مەبەستێکی تایبەتیم نییە، بەڵام وا بە بیرمدا هات، کە دوێنێ شەوی ڕابردوو و ئەم بەیانییە بەتایبەتی، کە تۆ بەڕاستی و ڕاستگۆیانە ئازارت بۆ لەدەستدانی ناتالیا ڤاسیلیڤنا چەشتووە."

"ئینجا ئێستا کێ پێی وتوویت من بەڕاستی و ڕاستگۆیی ئازارم نەچەشتووە بۆ لەدەستدانی ئەو؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، هەر وەک جاری پێشوو، وەک ئەوەی لە شوێنی خۆی هەڵدرابێت، بەوشێوەیە کە ئەم قسەیەی بیست، لە شوێنی خۆی قوت بۆوە.

"من مەبەستم لەوە نەبوو، بەڵام پێویستە بەوە قایل ببیت، کە ڕەنگە جەنابت سەبارەت بە ستیپان میخایلۆڤیچ بەهەڵەدا چووبن - ئەمەش کێشەیەکی مەترسیدارە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ زەردەخەنەیەکی مەکربازانەی کرد و چاوێکی داگرت. "ئەی حەز ناکەیت بزانیت چۆن بۆم دەر کەوت، کە ستیپان میهایلۆڤیچ بووە؟"

ڤێلچانینۆڤ ڕەنگی سوور هەڵگەڕا. "دووبارە پێت دەڵێمەوە، کە ئەو بابەتە بۆ من هیچ گرنگییەکی نییە..."

ڕەنگی هێندەی تر سوور هەڵگەڕا، لە دڵی خۆیدا وتی، "باشتر نەبوو هەر ئێستا لەگەڵ بوتڵەکەدا فڕێم بدایەتە دەرەوە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەک ئەوەی هەوڵ بدات ڤێلچانینۆڤ دنە بدات، وتی، "زۆر باشە، کێشە نییە!"

پاشان پێکێکی تری بۆ خۆی تێکرد و وتی، "هەر ئێستا بۆت ڕوون دەکەمەوە، کە چۆن پەیم بە هەموو شتێک سەبارەت بەو بابەتە برد، هەروەها زۆر دڵخۆشم بەو مەیلە بەهێزەتان... بۆ تۆ کە کەسێکی مەیلخوازیت، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، زۆر سامناکانە مەیلخوازیت! ها، ها! ئەزیەت نەبێت، تەنها جگەرەیەکم بدەرێ، بەڵێ لە مانگی سێوە...!"

'فەرموو، ئەوەش جگەرە."

"ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، لە مانگی سێوە کەوتمە ژیانێکی زۆر ناخۆشەوە، گوێ بگرە پێتدەڵێم چۆن هەموو شتێک ڕووی دا. هاوڕێی خۆشەویستم، هەر وەک دەزانیت نەخۆشی سیل،" پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەرەبەرە هاوڕێیانەتر خۆی نیشان دەدا، "نەخۆشییەکی نائاساییە. کەسانی تووشبوو بە سیل، بەدەگمەنیش چییە گومانی ئەوە لە خۆیان ناکەن کە ڕەنگە سبەینێ بمرن کەچی پاشان لە یەک خولەکدا گیان دەسپێرن. پێت دەڵێم کە تەنها پێنج کاتژمێر پێشتر، ناتالیا ڤاسیلیڤنا پلانی بۆ ئەوە دانابوو، کە دوو هەفتەی تر سەردانی پووری بکات، کە نزیکەی سی میل لە شارەکەی خۆمانەوە دوور بوو. ڕەنگە تۆش بە هەمان شێوە ئاگاداری ئەو کارە یان ئەو خووە خراپە بیت، کە لەناو زۆرێک لە ئافرەتان و دڵخوازەکانیاندا بوونی هەیە، مەبەستم لە پاراستن و هەڵگرتنی نامە دڵدارییە پڕووپووچەکانیانە... باشتر وایە مرۆڤ هەر بۆ خۆپارێزی ئەو جۆرە نامانە بخاتە ناو کوورەی ئاگرەوە و لەناویان بەرێت، تۆش پێت وا نییە من لەسەر حەق بم؟ بەڵام نەخێر، ئەوان کاری وا ناکەن، بەڵکوو یەک پارچە کاغەزی بێکەڵکیش چییە، لەناوی نابەن، بەڵکوو هەمووی بەوریاییەوە لەناو سندوقێکدا، لە شوێنێکدا هەڵی دەگرن یان لەسەر مێزێک، تەنانەت زۆر بەگرنگییشەوە بەپێی ساڵ و مانگ و تەنانەت ڕیزبەندییش، هەمووی تۆمار دەکەن. ئاخۆ ئەمە ئاسوودەیان دەکات؟ نازانم، بەڵام گومانی تێدا نییە، کە ئەمە بۆ زیندووڕاگرتنی یادگارییەکانیان دەکەن. بەڵی، پێنج کاتژمێر بەر لە مردنەکەی، خەریکی پلاندانان بوو بۆ سەردانەکەی بۆ لای

پووری، ناتالیا ڤاسیلیڤنا بە شێوەیەکی سروشتی، تەنانەت تا دواساتیش هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو سەبارەت بە مردن. تا دواساتیش هەر چاوەڕوانی کوخ بوو. ئیتر بەم شێوەیە بوو ناتالیا ڤاسیلیڤنا گیانی سپارد، ئەوەی لەپاشی بەجێ ما، سندوقەکەی بوو کە لە داری ئەبەنوس دروست کرابوو، ناوەکەشی بە مرواری و ڕەنگی زیوی ڕازاێندرابۆوە، بەبێ دەستکاری لەسەر دۆلابەکەی بەجێ مابوو. سندوقچەیەکی زۆر قشتۆکە و جوان بوو بە کلیل و قوفڵەوە، ئەمە میراتییەک بوو، لە داپیرەیەوە بۆی بەجێ مابوو. لەناو ئەو سندوقەدا هەموو ڕاستییەکان ئاشکرا بوون، لە سەددا سەد هەموو شتێک، هەموو شتێک بەبێ هەڵاوێردن، هەموو شتێک بە بەرواری تەواوەوە، ساڵ و ڕۆژ، هەرچی شتی بیست ساڵی ڕابردووە. لەگەڵ ئەوەی ستیپان میخایلۆڤیچ حەزێکی زۆری بۆ ئەدەبیات هەبوو، هەر بەڕاستی ئەو چیرۆکی دڵدارییانەی پڕسۆزی دەنارد بۆ گۆڤارێک، بە سەدان لەم چیرۆکانە لەناو ئەو سندوقچەیەدا بوو - بەدڵنیاییەوە بۆ ماوەی پێنج دانە ساڵ خەریکی بڵاوکردنەوەی ببوون. هەندێک لەو نووسینانە بە دەستخەتی خودی ناتالیا ڤاسیلیڤنا ڕوونکردنەوەیان لەسەر نووسرابوو. ئایا ئەمە بابەتێکی دڵخۆشکەر و سەرسوورهێنەرە بۆ مێردی ژنێک؟ تۆ چۆن بیر ئەکەیتەوە سەبارەت بەمە؟"

ڤێلچانینۆڤ بەخێرایی بیری خۆی کۆ کردەوە، هەستی بە دڵنیایی کرد کە هەرگیز تاقە نامەیەکیش چییە نەیناردووە بۆ ناتالیا ڤاسیلیڤنا، نەک هەر نامە، بگرە هیچ جۆرە یادداشتنامەیەکیشی بۆ نەناردووە. هەرچەندە ئەو

تەنها دوو جار لە پترسبۆرگەوە نامەی نووسیبوو، بەڵام نامەکانی بە شێوەیەک نووسیبوو، کە هێندەی ئاماژەی بە ناوی مێرد کردبوو، هێندە ناوی ژنەکەی نەهێنابوو. بۆ کۆتا نامەی ناتالیا ڤاسیلیڤناش، کە داوای کۆتاییهێنان بە پەیوەندییەکەیانی کردبوو، ئەو هەرگیز وەڵامی ئەو نامەیەی نەدابۆوە.

کاتێک پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی بووە، بۆ ماوەی یەک خولەکی ڕێک بێدەنگ بوو، هەروەها لەگەڵ ئەو بێدەنگییەشیدا بزەیەکی هەتەرانەی خستبووە سەر لێوەکانی و وەک ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێک بێت. دوای ئەوەی هیچ وەڵامێکی چنگ نەکەوت، بە نیگەرانییەکی ئاشکراوە وتی،

"بۆچی هیچ وەڵامێکی پرسیارە بچووکەکەمت نەدایەوە؟"

"کام پرسیارە بچووکە؟"

"ئەوەی کە وتم، ئایا ئەوە بابەتێکی دڵخۆشکەر و سەرسووڕهێنەرە بۆ مێردێک، لە کاتی کردنەوەی سەری سندوقێکی لەو شێوەیەدا؟"

ڤێلچانینۆڤ لە شوێنی خۆی بەرز بووە و دەستی کرد بە هاتوچۆکردن بەناو ژوورەکەدا و دەستی بە شێوەیەک ڕاوەشاند، وەک ئەوەی ڕای خۆی دەر ببڕێت، بەبێزاری، هاواری کرد، "ئەها! ئینجا ئەوە کەی پەیوەندیی بە منەوە هەیە!"

"بەڵام من گرێوت لەگەڵ دەکەم، کە هەنووکە بیر لەوە دەکەیتەوە و لە دڵی خۆتدا دەڵێیت، لە مالۆسێک زیاتر نیە لە بەردەمما، تەپڵی ڕسوایی خۆی لێدەدات. ها، ها! تۆ مرۆڤێکی زۆر خۆشگلەییت... زۆر...

"بەهیچ کلۆجێک من وا بیر ناکەمەوە. بەپێچەوانەوە، ئەوە تۆیت کە لە داخی مردنی ئەو کەسەدا، کە ئەتکی ناموسی کردوویت، لە داخا خەریکە دیق دەکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا، عەرەقێکی زۆریشت خواردۆتەوە. من هیچ شتێکی نائاسایی لە تەواوی ئەم شتانەدا نابینم، بەتەواوی تێدەگەم کە بۆچی باگاوتۆڤت بەزیندوویی دەویست، هەروەها بەتەواوی ئامادەم ڕێز لەو بێزارییەتان بگرم، بەڵام..."

"بە بڕوای تۆ باگاوتۆڤم بۆچی بوو؟"

"ئەوە پەیوەندیی بە خۆتەوە هەیە."

"گرێو دەکەم بیرت لە دوێڵ دەکردەوە!"

ڤێلچانینۆڤ وردەوردە ئارامیی خۆی لەدەست دەدا و کەمتر دەیتوانی زاڵ ببێت بەسەر خۆیدا، هاواری کرد، "نەفرەت لە هەموو شت! من وام دەزانی هەر پیاوێکی بەئابڕوو... لەم جۆرە هەڵوێستانەدا هەرگیز ڕێ بە خۆی نادات لاقرتێ و قسەی هەلەقومەلەق، قۆشمەبازی و گەمژایەتی بکات، یان بە شێوەیەک سکاڵا بکات، کە مایەی پێکەنین بێت، یان بەوپەڕی بێزارییەوە قسەی توێکڵدار بکات، کە بەمەش، هێندەی تر خۆی سووک دەکات، بەڵکوو پێم وا بوو ڕاشکاوانە، ڕاستەوخۆ، بێ پێچوپەنا، وەک پیاوێکی بەئابڕوو هەڵسوکەوت دەکات!"

"هە، هە! ئینجا کێ ناڵێت من کابرایەکی بێئابڕوو نیم!"

"دیسانەوە ئەمەش هەر کێشەی خۆتە... بەڵام بە هەرحاڵ، پێم ناڵێیت لەبەر چ بیرۆکەیەکی شەیتانی باگاوتۆڤت بەزیندوویی دەویست؟"

"ئەبێت بۆچیم بویستایە، تەنها ئەمویست هاوڕێیەکم ببینم

و بەیەکەوە دابنیشین و بوتڵیکمان بەیەکەوە بخواردایەتەوە."
"بەڵام پێنەدچوو ئەو لەگەڵتدا بخواتەوە."
"بۆ نا؟ خانەدانێتییەکەی ناچاری دەکردا ئەوەتا، تۆ لەگەڵمدا دەخۆیتەوە، لە چ ڕوویەکەوە ئەو لە تۆ شایستەترە؟"
"من لەگەڵ تۆ نەمخواردۆتەوە."
"چۆن بوو ئاوا کتوپڕ لە خۆت بایی بوویت؟"
ڤێلچانینۆڤ کتوپڕ دای لە قاقای پێکەنینێکی شڵەژاو و تووڕە، "بەنەفرەت بیت! بەڕاستی تۆ جۆرێکی شەڕخوازیت! من وا بیرم دەکردەوە، کە تۆ تەنها مێردێکی هەمیشەییت و لەوە زیاتر چیی دی نیت!"
پاڤێل پاڤلۆڤیچ کتوپڕ گوێی قوڵاغ کرد و وتی، "مەبەستت چییە لە مێردی هەمیشەیی، ئەمە چییە؟"
"پەکوو، ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی مێرد... کاتێکی زۆری دەوێت تا بۆت باس بکەم. باشترە خۆت کۆ بکەیتەوە، کاتی ئەوەت هاتووە بڕۆیت، تەواو بێزار بووم لێت."
"ئەی شەڕخواز؟ وتت "شەڕخواز"!
"من تەنها بەگاڵتەوە وتم، جۆرێکی شەڕخوازیت."
"پێم بڵێ ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، تکات لێ دەکەم، بیکە بە خاتری خوا، بیکە بە خاتری حەزرەتی مەسیح، مەبەستت چییە لە جۆری شەڕخواز؟"
ڤێلچانینۆڤ کتوپڕ و بە شێوەیەکی زۆر سامناک دەهری بوو، هاواری کرد، "بەسیکە، ئەمە بەسە، ئەمە بەسە! ئیتر کاتی ئەوەیە ئێرە جێ بهێڵیت. دەی بڕۆ."
پاڤێل پاڤلۆڤیچ ئاگری گرت، "نەخێر، ئەمە بەس نییە!

تەنانەت ئەگەر لێشم بێزار بووبێت، هێشتاش هەر بەس نییە، پێویستە بەیەکەوە بخوێنەوە و زرینگە لە پەرداخەکانمان هەڵبستێنین! وەرە با بەیەکەوە بخوێنەوە، پاشان ئەڕۆم، بەس جاری مەڵێ بەسە!"

"پاڤێل پاڤلۆڤیچ، ئێستا ئەتوانیت بڕۆیت و ملت بشکێنیت یان نا؟"

"ئەتوانم ملم بشکێنم، بەڵام سەرەتا ئەخوێنەوە! تۆ وتت کە لەگەڵما ناخۆیتەوە، بەڵام من ئەمەوێت تۆ لەگەڵما بخۆیتەوە!"

هەنووکە پاڤێل پاڤلۆڤیچ ددانی جیڕ نەدەکردەوە و چیتر لە ژێرەوە بەلاقرتێوە پێنەدەکەنی. وا دەر دەکەوت هەموو شتێک سەرتاپا گۆڕانی بەسەردا هاتبێت. بە شێوەیەکی گشتی دەنگ و ڕوخساری وا دەر دەکەوت، بەتەواوی جیاواز بێت لەو پاڤێل پاڤلۆڤیچەی چەند ساتێک لەمەوبەر. ڤێلچانینۆڤ تەواو واقی وڕ مابوو.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەردەوام بوو، بەتوندی دەستەکانی ڤێلچانینۆڤی گرتبوو، بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە چاوەکانی دەڕوانی، وتی، "وەرە با بخۆینەوە ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ! تکایە ڕەتم مەکەرەوە."

ئاشکرابوو ئەو شتەی بەلای پاڤێل پاڤلۆڤیچەوە گرنگ بوو، بریتی نەبوو لەو کەمە خواردنەوەیە.

ڤێلچانینۆڤ لەژێر لێوەوە بەخوتەوبۆڵەوە وتی، "زۆر باشە، مادەم حەزت لێیە، قەیدی ناکا، بەڵام چی بخۆینەوە؟... خۆ جگە لە خڵتەکەی، هیچی دیی تیا نەماوە..."

"تەنها دوو پێکی تێدا ماوە، ڕاستە کە باشیش نییە،

بەڵام دەیخۆینەوە و زرینگە لە پەرداخەکانمان هەڵدەستێنین! پێکەکەت بگرە."

زرینگەیان لە پەرداخەکانیان هەڵساند و بەتاڵیان کردەوە.

"بەڵی لەو کاتەوە - بەڵێ لەو کاتەوە... ئاخ!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە شوێنی خۆیدا تەوێڵی لە ناو دەستەکانیدا بەتوندی گیر کردبوو، بۆ ماوەی چەند خولەکێک بەم شێوەیە مایەوە. ڤێلچانینۆڤ وا هەستی دەکرد و پێی وا بوو هەر ئێستا نا ئێستا وشەی کۆتاییی خۆی دەر دەپەڕێنێت و پەردە لە ڕووی هەموو شتەکان هەڵدەماڵێت. بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ وشەیەکیش چییە، لە زاری دەر نەهات؛ زۆر بەسادەیی چاوی بڕییە ڤێلچانینۆڤ و هەمان ئەو زەردەخەنە مەکربازانەیەی خستەوە سەر لێوەکانی کە پێشتر کردبووی.

ڤێلچانینۆڤ بەتوندی پێی کێشا بە عەردەکەدا و بەخێرایی هاواری کرد، "پێم بڵێ چیت لە گیانی من دەوێت، هەی نابووتی سەرخۆش! پێم ڕائەبوێریت!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەخێرایی سەری لەقاند و هاواری کرد، "هاوار مەکە، هاوار مەکە؛ چی بووە وا هاوار دەکەیت؟ من ڕانابوێرم، من ڕانابوێرم! ئەزانیت هەنووکە بۆ من، تۆ چی دەگەینیت؟"

کتوپڕ دەستی ڤێلچانینۆڤی گرت و ڕای مووسی. ڤێلچانینۆڤ لە شوێنی خۆیا حەپەسا.

"هەنووکە تۆ ئەوەیت بۆ من! ئێستاش- هەر ئێستا دەڕۆم و ملم دەشکێنم، تا هەرچی زووتره ئاسوودە بیت لەدەستم!"

ڤێلچانینۆڤ، كە هاتبۆوە سەر خۆی، هاواری كرد، "یەك دەقە ڕاوەستە، بمێنەرەوە! بیرم چوو پێت بڵێم..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەدەم دەرگاكەدا ئاوڕی دایەوە بۆ دواوە.

ڤێلچانینۆڤ سوور هەڵگەڕابوو، زۆر بەخێرایی ڕووی خۆی كرد بەولاوە و بەمنجەمنجەوە وتی، "سەیر بكە، پێویستە سبەینێ لای خێزانی پۆگۆریلستێڤ بیت... بۆ ئەوەی لە نزیكەوە پێیان ئاشنا ببیت و سوپاسیشیان بكەیت؛ پێویستە تۆ..."

"بەدڵنیاییەوە، پێویستە. بەدڵنیاییەوە لەوە تێدەگەم!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەخێرایی وای وت و دەستی بەخێرایی ڕاوەشاند، وەك ئەوەی ڤێلچانینۆڤ تێبگەیەنێت كە پێویستی بەوە نەدەكرد وەبیری بهێنێتەوە، چونكە خۆی لەبیری بووە.

"سەرباری ئەوەش، لیزا بەتاسەوە چاوەڕوانی بینینتە، بەڵێنم پێ دابوو..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەوپەڕی ورووژاوییەوە هاواری كرد، "لیزا! لیزا؟ ئەزانی لیزا بۆ من چ مانایەكی هەبووە و هەیە؟ هەیبووە و هێشتاش هەر هەیەتی! بەڵام... وازی لێ بێنە بۆ دواتر، هەمووی دانێ بۆ دواتر... بەڵام هەنووكە من تێر نەبووم بەم خواردنەوەیەم لەگەڵ تۆدا، ئەلێكسی ئیڤانۆڤیچ، ئەوە قایلی نەكردم، پێویستە شتێكی تریش بخۆمەوە بۆ ئەوەی بەتەواوی قایل ببم..."

كڵاوەكەی لەسەر كورسییەك داناو چاوی بڕییە ڤێلچانینۆڤ، كەمێك هەناسەبڕكێی پێ كەوتبوو، هەر وەك كەمێك پێش ئێستا. لەناكاو پێشنیاری كرد، "ماچم بكە، ئەلێكسی ئیڤانۆڤیچ!"

ڤێلچانینۆڤ کەمێک بەرەو دواوە هەنگاوی نا و بەئاشکرا وتی، "تۆ سەرخۆشیت!"

"بەڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماچم بکە ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ، تکایە ماچم بکە! ئەوە نەبوو هەر ئێستا منیش دەستم ماچ کردیت؟"

بۆ چەند خولەکێک ڤێلچانینۆڤ بێدەنگ لە شوێنی خۆی ڕاوەستابوو، وەک ئەوەی گورزێکیان بە سەریدا کێشابێت، گێژ ببوو. بەڵام لە ناکاو خۆی بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ چەماندەوە، لەبەر ئەوەی بالای پاڤێل پاڤلۆڤیچ تا ئاستی شانەکانی بوو، لێوەکانی ڕامووسی، کە زۆر بەخەستی بۆنی عەرەقی لێ دەهات. هەرچۆنێک بێت، زۆر لەوە دڵنیا نەبوو کە بەتەواوی ماچی کردووە یان نا.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەرلەنوێ لە بارودۆخێکی سەرخۆشانە و شڵەژاویدا هاواری کرد، چاوە مەستەکانی دەبریقانەوە. "باشە، هەنووکە، هەنووکە... هەنووکە پێت دەڵێم؛ ئەم بەیانییە بیرم لەوە دەکردەوە و بە خۆمم دەوت، ئەی ئەگەر ئەویش بە هەمان شێوە؟ چی دەبێت ئەگەر ئەم یەکەشیان، بیرم لەوە دەکردەوە، ئەگەر ئەمیش بە هەمان شێوە بێت... ئیتر ئەبێت لەدوای ئەمە بڕوا بە کێ بکەم!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کتوپڕ یای لە پرمەی گریان.

"کەواتە تۆ تێدەگەیت، هەنووکە تۆ تەنها هاوڕێیەکیت، کە بۆم ماویتەتەوە."

پاشان بە خۆی و کڵاوەکەیەوە ڕای کردە دەرەوەی ژوورەکە. بۆ ماوەی چەند خولەکێک ڤێلچانینۆڤ لە هەمان شوێنی جاری پێشووی خۆی بەپێوە ڕاوەستا هەر وەک

یەکەم جار کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەردانی کرد واتە جاری پێشوو.

"ئاخ! لە سەرخۆشێکی گەمژە زیاتر، چیی دی نییە!" کاتێک وای وت، بەتوندی دەستی ڕادەوەشاند، وەک ئەوەی بیەوێت ئەم بابەتە لە مێشکی خۆی دەر بکات. لە کاتێکدا جلەکانی بەتوندی لەبەری خۆی دادەکەند و دەچووە ناو جێگەکەیەوە، ئەمەی دووبارە کردەوە، "بەدڵنیاییەوە لەوە زیاتر، چیی دی نییە."

## ٨

# لیزا نەخۆشە

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، ڤێلچانینۆف لە چاوەڕوانیی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا، کە بەڵێنی پێ دابوو لە کاتی گونجاودا بێت و بەیەکەوە بچن بۆ لای خێزانی پۆگۆریلیستێف، لە کاتێکدا لە ژوورەکەیدا پیاسەی دەکرد و مژی لە جگەرەکەی دەدا و قومی بچووکیش لە قاوەکەی، هەرساتێک کە تێدەپەڕی، زیاتر هەستی بەوە دەکرد هاوشێوەی پیاوێکە، کە بەیانی لە خەو هەڵدەستێت و ناتوانێت ئەوە لەبیر بکات، کە شەو شەپازللەیەکیان یاوە لە بناگوێی... بەتۆقیوی بیری دەکردەوە و لە دڵی خۆیدا دەیوت، "ئممم!... ئەو بەتەواوی لە بارودۆخەکە تێدەگات و لە ڕێگەی لیزاوە حەقی خۆیم لێ دەکاتەوە!"

بۆ ساتێک شێوەی دڵفڕێنی کچەی داماوی بە شێوەیەکی خەفەتاوی هاتە پێشچاوانی. هەر کە بیری لەوە دەکردەوە کە دوو کاتژمێرێکی تر دووبارە چاوی بە لیزاکەی خۆی دەکەوێتەوە، دڵی خێراتر لێی دەدا. زۆر بەگەرموگوڕی بڕیاری

دا و لە دڵی خۆیدا وتی، "ئاها! قسەکردن سەبارەت بەمە، هیچ کەڵکێکی نییە! هەنووکە ئەمە هەموو ژیان و هەموو ئامانجی منە! تازە ئەم شەپازللانە یان ئەو یادەوەرییانەی ڕابردوو، چ بایەخێکیان هەیە؟ تا ئەم ساتەش، ژیانی من چۆن بووە؟ سەرلێشێواوی و خەفەت.... بەڵام هەنووکە... تەواو شتەکە جیاوازە، هەموو شتەکان گۆڕاون!"

بەڵام سەرباری دڵگەرمییەکەی، کەچی زیاتر و زیاتر گومانەکانی فرەتر دەبوون.

"ئەو دەیەوێت لە ڕێگەی لیزاوە ئەشکەنجەم بدات - ئەمە شتێکی ڕوونە! بە هەمان شێوە ئازاری لیزاش دەدات. ئەو دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە ئەو هەلە بقۆزێتەوە و بەتەواوی حەقی هەموو شتێکم لێ بکاتەوە... ئممم!... بەدڵنیاییەوە، ناتوانم ڕێی پێ بدەم ئەوە دووبارە بکاتەوە، کە دوێنێ لەگەڵمدا کردی." ڤێلچانینۆڤ کاتێک ئەمەی وت، یەکسەر ڕەنگی لە تووڕەییدا سوور هەڵگەڕا، "فەرموو ئەوە کاتژمێر دوانزەیە و تا ئێستا لە هیچ کونێکەوە دیار نییە."

بۆ ماوەیەکی درێژ چاوەڕوانی کرد، تا دوانزە و نیو، تا بهاتایە، نیگەرانییەکەی زیاتر و زیاتر گەشەی دەکرد. پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەر نەکەوت. دواجار ئەو بیرۆکەیەی کە ماوەیەکی درێژ بەر لە ئێستا مێشکی ورووژاندبوو، ئەو بیرۆکەیەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەمەبەست نایەت و زۆر بەسادەییش دەیەوێت گۆمەزێکی وەک ئەوەی دوێنێ شەوی پێشوو بنێتەوە و تووڕەبوونەکەی خۆی بەسەر ئەمدا بەتاڵ بکاتەوە. "ئەو باش دەزانێت من پشتم بە ئەو بەستووە، ئەی باشە ئێستا ئەبێت لیزا بارودۆخی چۆن بێت؟ ئەی باشە ئێستا بە چ

ڕوویەکەوە لە بەردەمیدا بەبێ ئەو خۆم دەر بخەم؟"

لە کۆتاییدا پەتی ئارامیی پچڕا و لەوە زیاتر نەیتوانی چاوەڕوانی بکات، لە کاتژمێر یەکدا بەتەنیا لە ماڵ دەر چوو، بەرەو ئوتێل پۆکرۆفسکی بەڕێ کەوت. لە شوێنی نیشتەجێبوونەکەی پێیان ڕاگەیاندبوو، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە ماڵەوە نەخەوتووە، بەڵام تەنها دەوروبەری کاتژمێر نۆی سەرلەبەیانی گەیشتۆتە ماڵەوە و لە چارەکێک زیاتر نەماوەتەوە، پاشان سەرلەنوێ لە ماڵ دەر چۆتەوە. ڤێلچانینۆف بەپێوە لە بەردەم ژوورەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ ڕاوەستابوو، گوێی لەو قسانە گرتبوو، کە خزمەتکارەکە دەیکرد، دوور لە ویستی خۆی دەستی خستە سەر کێلونی دەرگا داخراوەکە و دەسکی کێلونەکەی بۆ دواوە و بۆ پێشەوە ڕاکێشا، بەڵام هەر هێندەی پەیی بەوە برد کە خەریکی چ شتێکە، لەبەر خۆیەوە هەندێک جنێوی دا و داوای لە خزمەتکارەکە کرد بیبات بۆ لای ماریا سیسۆڤنا. بەڵام پێدەچوو ژنی خاوەنماڵ گوێی لە قسەکان بووبێت و زانیبێتی ڤێلچانینۆڤی لێیە، یەکسەر دەر پەڕییە دەرەوە.

ئەو ئافرەتێکی ڕووخۆش بوو؛ ئافرەتێک، خاوەن دڵێکی پڕ لە میهرەبانی، ئەمە بیروباوەڕی ڤێلچانینۆف بوو سەبارەت بە ماریا سیسۆڤنا لە کاتی گێڕانەوەی شتەکان بۆ کلاڤدیا پترۆڤنا، بەم شێوەیە باسی لەم ئافرەتە دەکرد.

دوای ئەوەی ماریا سیسۆڤنا بەکورتی پرسیاری گەشتەکەی ڕۆژی پێشووتری لەگەڵ منداڵەکەدا لە ڤێلچانینۆف کرد، یەکسەر کەوتە ژماردنی ڕەفتارە چەوتەکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچ. دەیوت، "ئەگەر لەبەر خاتری ئەو منداڵە نەبووایە، ئەوە زۆر

لەمێژ بوو لەو ماڵە وەدەری نابوو، ئەینارد بەلای ئیشی خۆیەوە. پێشتریش زۆر جار لەسەر ڕەفتارە ناشرینەکانی لە ئوتێلەکە وەدەر نرابوو. ئاخر مایەی شەرمەزاری نییە بۆ پیاوێک، قەحبەیەک لەگەڵ خۆیدا بهێنێتەوە بۆ ماڵەوە، لە کاتێکدا منداڵێکی لێیە کە تەمەنەکەی بەسە بۆ ئەوەی لە هەموو ئەو شتانە تێبگات؟ پڕ بەو ئوتێلە بەسەر ئەو منداڵە داماوەدا ئەینەڕاند و دەیوت، "ئەمە ئەبێت بە دایکت، ئەگەر من بمەوێت!" بڕوا ئەکەیت؟ ئەو قەحبەیە چیی کرد، تەنانەت ئەویش تفێکی کردە ناوچەوانی ئەو بەستەزمانە. هاواری دەکرد دەیوت، "تۆ کچی من نیت، تۆ زۆ..." ماریا سیسۆڤنا قسەکەی بۆ تەواو نەکرا و دای لە پرمەی گریان."

ڤێلچانینۆڤ، کە دڵی تەواو داخورپابوو، وتی، "ئەوە بەڕاستتە!"

"بەم گوێیانەی خۆم گوێم لێی بوو. ڕاستە ئەو کەسێکی سەرخۆش بوو و تا ڕادەیەکی زۆریش بێئاگابوو لە خۆی، بەلام هێشتاش هەر هەڵەیە لە بەردەم منداڵێکدا ئەم جۆرە قسانە بکرێت. ڕاستە ئەو منداڵە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەقڵی بەو شتانە دەشکێت، لە مێشکی خۆیدا مەراق لە هەموو شتێک دەخوات! منداڵەکە دەگریا. ئەمبینی چۆن خەفەتی دەخوارد. هەروەها ڕۆژێکی تر ڕووداوێکی زۆر تۆقێنەر لە بالاخانەکەماندا ڕووی دا: فەرمانبەرێک، بەو شێوەیەی خەڵک دەیانگێڕایەوە، شەوەکەی ژوورێکی لە ئوتێلەکە بەکرێ گرتبوو، کەچی بۆ بەیانییەکەی تەرمەکەیان لە ژوورەکەیدا بەلەسێدارەدروای بینیبوو. دەیانوت هەرچی پارەی هەبووە بەبای دابوو. خەڵکی خڕ ببوونەوە بۆ بینینی. پاڤێل پاڤلۆڤیچ

لە ماڵ نەبوو، لەبەر ئەوە، کەس لەوێ نەبوو تا چاودێریی منداڵەکە بکات، منداڵەکەش چووبووە دەرەوە؛ چاوم لێی بوو لەناو ڕارەوەکەدا، لەنێوان خەڵکەکەدا، لەپشت ئەوانەوە بەدزییەوە تەماشای تەرمەکەی دەکرد؛ بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە لاشە هەڵواسراوەکەی دەڕوانی. تا پێم کرا و لە توانامدا بوو، بەخێرایی لەو شوێنەم دوور خستەوە. بە بڕوای تۆ، ئەزانی چی ڕووی دا، تەواوی جەستەی وەک شەقشەقە کەوتە لەرزین، ڕوخساری بەتەواوی ڕەش داگەڕابوو، هەر هێندەی هێنامە ژوورەوە، کتوپڕ بووڕایەوە و کەوتە سەر عەردەکە، کێشمەکێشی بوو لەگەڵ ئازارەکانیدا، زۆرم هەوڵ دا تا بە هۆش خۆی بهێنمەوە. ئیتر لەدوای ئەو ساتەوە، ئەو کچە کلۆڵە هەمیشە نەخۆش بوو. کاتێکیش پاڤێل پاڤلۆڤیچ ئەوەی بیستبوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، شوێن نەما، لە جەستەی ئەو کیژە هەژارەدا، نقورچکی لێ نەگرێت - ئەو لێی نەدەدا، بەڵام لەبریی ئەوە نقورچکی لێ دەگرت، دوای ئەوەی هەندێکی خواردبۆوە و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کچەی کلۆڵی بەوە ترساند: منیش بە هەمان شێوە خۆم لەسێدارە دەدەم! دەیوت، تۆ وام لێ دەکەیت لە داخا خۆم لەسێدارە بدەم؛ بەو گوریسە ئەستوورەی لەوێدایە، لە کاتێکدا وای وت، لە بەرچاوی کچەی داماودا گوریسی لەسێدارەدانی ئامادە کرد و قوڵفی لە گوریسەکە دا. کچەی کلۆڵیش وەک شێتی لێ هاتبوو، دەیقیژاند و باڵە گچکەکانی وەر دابووە ئەو، دەگریا و دەیوت، ئیتر کاری وا ناکەم! هەرگیز دووبارەی ناکەمەوە، بەڕاستی مرۆڤ بەزەیی پێیدا دەهاتەوە."

هەرچەندە ڤێلچانینۆڤ چاوەڕوانی شتێکی نامۆتر بوو کە

بیبیستێ، بەڵام ئەم چیرۆکە لەڕادەبەدەر تووشی واقوڕمانی کردبوو، بە شێوەیەک، کە باوەڕی نەدەکرد. ماریا سیسۆڤنا بەردەوام بۆوە لە قسەکانی و ڕووداوێکی تریشی بۆ گێڕایەوە، بۆ نموونە، باسی ئەوەی کرد کە جارێکیان ئەگەر ئەو نەبووایە و فریا نەکەوتبایە، ئەوە لەوانە بوو لیزا خۆی لە پەنجەرەکەوە فڕێ بدایەتە خوارەوە.

ڤێلچانینۆڤ لە ئوتێلەکە هاتە دەرەوە، بە شێوەیەک لەتری دەدا، وەک ئەوەی خواردبێتیەوە.

ئەم بیرۆکەیە هاتبووە ناو مێشکیەوە و بۆ ماوەیەکی درێژ هەر لەبەر خۆیەوە دووبارەی دەکردەوە: "ئەبێت یەک دانە بماڵم بە سەریدا و وەک سەگ بیتۆپێنم!" گالیسکەیەکی گرت و بەرەو لای خێزانی پۆگۆریلستیڤ بەڕێ کەوت. لە ڕێگە گالیسکەکە ناچار بوو لە چوارڕێیانەکەدا ڕابوەستێت، نزیک پردەکە، لەسەر نۆکەندەکە، بەدرێژاییی ڕێگەکە کەژاوەیەکی دووردرێژی پرسەیەک بەو شوێنەدا ڕای دەبوورد. بۆیە لە هەردوو لای پردەکەوە گالیسکەگەلێکی زۆر لەناو شەقامەکەدا چاوەڕوان بوون؛ حەشامەتێکی زۆر لە خەڵکیش بە هەمان شێوە بەپێوە ڕاوەستابوون. پرسەیەکی زۆر شکۆدار بوو، کاروانی گالیسکەیەکی زۆریش بەهێواشی بەشوێن تەرمەکەوە ڕیزیان بەستبوو. ڕابوەستە و ببینە! لە ناکاو ڤێلچانینۆڤ بەڕێکەوت لە پەنجەرەکانی یەکێک لە گالیسکەکانەوە چاوی بۆ ماوەیەکی کورت کەوتە سەر تێپەڕبوونی ڕوخساری پاڤێل پاڤلۆڤیچ. لەوە نەدەچوو ڤێلچانینۆڤ باوەڕی بە چاوەکانی خۆی بکردایە، ئەگەر پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەری خۆی لە گالیسکەکە دەر نەهێنابا و بەزەردەخەنەوە سەرەلەقەی بۆ

نەکردایە. ئاشکرا بوو کە گەلێک دڵخۆش بووە لە ناسینەوەی ڤێلچانینۆڤدا، تەنانەت بە ئاماژە و سەرەلەقێکردن لەناو گالیسکەکەوە، دەستی کرد بە بانگکردنی ڤێلچانینۆڤ.

ڤێلچانینۆڤ لە گالیسکەکەی خۆیەوە بازی دا، سەرەڕای قەرەباڵغییە زۆرەکەش، سەرەڕای بوونی دارۆغەیەکی* زۆر، هەروەها سەرەڕای ئەو ڕاستییەی کە گالیسکەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ گەیشتبووە سەر پردەکە، بەخێرایی ڕای کرد و خۆی گەیاندە پەنجەرەی گالیسکەکە. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەتەنیا بوو.

ڤێلچانینۆڤ هاواری کرد، "چیت بەسەر هاتووە؟ بۆچی نەهاتیت؟ چۆنە وا لێرەیت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بزەیەکی بۆ کرد و دەموچاوی خۆی بەوپەڕی گاڵتەبازییەوە چرچولۆچ کرد و وتی، "تەنها قەردێکم لەسەرە و ئەیدەمەوە... هاوار مەکە، هاوار مەکە، تەنها قەردێکم لەسەرە و ئەیدەمەوە، شوێن تەرمی نەمری هاوڕێی بەوەفام، ستیپان میخایلۆڤیچ کەوتووم."

ڤێلچانینۆڤ بۆ ساتێک حەپەسا، پاشان لە جاری پێشووتر توندتر هاواری کرد، "ئەمانە هەمووی قسەی قۆڕن، سەرخۆشی بێئەقڵ، هەر ئێستا لە گالیسکەکەت وەرە دەرەوە و سواری گالیسکەکەی من ببە."

"ناتوانم، ئەمە ئەرکە..."

ڤێلچانینۆڤ شیڕاندی، "ئەگەر دانەبەزیت، بەزۆر ڕات دەکێشمە دەرەوە!"

---

* دارۆغە: پۆلیس

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەر وەک جاری پێشوو بزەیەکی گاڵتەجاڕانەی خستە سەر لێوەکانی و وەک ئەوەی بیەوێت گاڵتە بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، خۆی ترنجاندبووە دوورترین قوژبنی گالیسکەکە و وتی، "منیش هاوار دەکەم! هاوار دەکەم!"

دارۆغەیەک هاواری کرد، "وریا بە، وریا بە! دەپلیشێیتەوە!"

لە ڕاستیدا لە کۆتاییی دوورترین شوێنی پردەکە گالیسکەکە بەناو کاروانەکەدا گوزەری کرد و ئەمەش بووە هۆی نانەوەی پشێوییەکی زۆر لەناو ڕێڕەوی کاروانەکەدا. ڤێلچانینۆڤ ناچار بوو بازێک بدات بۆ دواوە، لێشاوی گالیسکەکان و پاڵەپەستۆی خەڵکەکە دەستبەجێ هێندەی تر ئەویان هەڵگرت و دووریان خستەوە. بەوپەڕی تووڕەیی و نەفرەتەوە تفێکی لە عەردەکە ڕۆ کرد و بەرەو گالیسکەکەی خۆی گەڕایەوە.

بیری دەکردەوە، شڵەژاوی و نیگەرانی تەنگی پێ هەڵچنیبوو، لە دڵی خۆیدا دەیوت، "کێشە نییە، ئەسڵەن بۆچی دەبێت ڕسوایەکی وەک ئەو بکەم بە هاوڕێگەی خۆم!"

کاتێک چیرۆکەکەی ماریا سیسۆڤنای بۆ کلاڤدیا پترۆڤنا گێڕایەوە و باسی لەو دیدارە سەیرە کرد کە لە کاروانی پرسەکەدا بەسەریدا هاتبوو، وای کرد کلاڤدیا زیاتر لە قووڵاییی بیرکردنەوە ڕۆ بچێت.

کلاڤدیا وتی، "هەست بە ترس ئەکەم بەرامبەرت، پێویستە لەسەرت هەرچی پەیوەندیت هەیە لەگەڵیدا، بیپچڕێنیت و هەرچی زووتر ئەو کارە بکەیت، باشتر."

ڤێلچانینۆڤ بەهەڵچوونەوە هاواری کرد، "ئەو لە

سەرخۆشێکی گەلحۆ زیاتر، چیی دی نیە! دوای ئەوە، خۆ من لێی ناترسم! ئینجا پێم نالێیت چۆن پەیوەندییەکانمی لەگەڵدا بپچڕێنم، لە کاتێکدا لیزا هەیە و پێویستە لەپێش هەرشتێکدا لیزا لە بەرچاو بگیرێت، تکایە بیر لە لیزا بکەرەوە!"

لەو کاتەدا لیزا نەخۆش بوو لەناو جێگەدا کەوتبوو؛ ئێوارەی پێشتر تووشی تایەکی قورس هاتبوو، ئەوانیش چاوەڕوانی هاتنی پزیشکێکی بەناوبانگ بوون، کە هەر ئەو ئێوارەیە تەتەرێکیان بەپەلە ناردبوو بۆ شارۆچکەکە، تا بتوانێت هەرچۆنێک بووە دەمەوبەیان لەگەڵ پزیشکەکەدا بگەڕێتەوە. ئەمە بەتەواوی ڤێلچانینۆڤی دڵتەنگ کردبوو.

کلاڤدیا پترۆڤنا قۆڵی ڤێلچانینۆڤی گرت و بردی بۆ لای نەخۆشەکە. لەپشت دەرگای ژوورەکەی لیزاوە بەپێوە وەستابوو، وتی، "دوێنێ زۆر بەوریاییەوە چاودێریم کرد. ئەو منداڵێکی لووتبەرز و شەرمنە، هەست بە شەرمەزاری دەکات کە لێرەیە و باوکیشی بەم شێوەیە دەستبەرداری بووە. بە بڕوای من، تەنها ئەمە هۆکاری هەموو نەخۆشییەکەشیەتی."

"چۆن دەستبەرداری بووە؟ بۆچی دەڵێیت ئەو دەستبەرداری بووە؟"

"هەر هێندە بەسە بۆ ئەوەی لەو ڕاستییە تێبگەین، کە ناردنی کچێک بۆ ئێرە و سپاردنی بە خەڵکێکی تەواو نامۆ و سپاردنی بە پیاوێک کە تا ڕادەیەکی زۆر بە هەمان شێوە ئەویش پێی نامۆیە، یاخود لە وەها هەلومەرجێکدا..."

"بەڵام ئەوە من بووم کە ئەوم هێنا، من بە زۆری زۆرداری هێنام، تێناگەم..."

"ئەی خوایە، تەنانەت لیزاش بەو منداڵییەی خۆی لەوە

تێدەگات! ئەمە بڕوای منە، زۆر بەسادەیی لیزا هەرگیز حەزی بەوە نەکردووە، کە بهێنرێت بۆ ئێرە."

لیزا بە هیچ شێوەیەک تووشی سەرسووڕمان نەبوو، کاتێک ڤێلچانینۆڤی بەتەنیا بینی، تەنها بە غەمبارییەکەوە بزەیەکی بۆ کرد و پاشان سەرە بچکۆلە تالێهاتووە داخەکەی وەر چەرخاند بەرەو دیوارەکە. لیزا وەڵامی هیچ یەکێک لە بڕوبیانووەکانی ڤێلچانینۆڤی نەدایەوە، کە سەرلەنوێ بەگەرمی بەڵێنی ئەوەی پێ دەدایەوە، کە ڕۆژی دواتر باوکی لەگەڵ خۆیدا بهێنێت و شکستیش نەهێنێت لە هێنانی بۆ لای. هەر هێندە لە ژوورەکەی لیزا چووە دەرەوە، کتوپڕ دای لە پرمەی گریان. دەمەوئێوارە بوو، کە پزیشکەکە گەیشتە جێ. دوای ئەوەی پشکنینی کرد بۆ نەخۆشەکە، هەر یەکسەر بە وشەکانی سەرەتای ترس و بیمی خستە ناو دڵی هەموویانەوە، پێی ڕاگەیاندن کە کارێکی خراپیان کردووە، کە زووتر نەیانناردووە بەشوێنیدا. سەرەڕای ئەوەی بۆ پزیشکەکەیان ڕوون کردەوە کە منداڵەکە تەنها ئێوارەی پێشووتر نەخۆش کەوتووە و یەکسەر کەسێکیان ناردووە بەشوێنیدا، سەرەتا پزیشکەکە گومانی لە قسەکانیان کرد، بەڵام لە کۆتاییدا وتی، "هەرچی ئومێدی مانەوە هەیە، تەنها گرێدراوە بە چۆنێتیی تێپەڕینی ئەمشەوەوە."

دوای ئەوەی چەندین ڕێنمایی جۆراوجۆری پێ دان، بەجێی هێشتن و پەیمانی پێ دان ڕۆژی دواتر تا پێی بکرێت زووتر بگەڕێتەوە بۆ لای. ڤێلچانینۆڤ سوور بوو لەسەر ئەوەی شەو لەلای لیزا بمێنێتەوە، بەڵام کلاڤدیا پترۆڤنا جارێکی تریش لێی پاڕایەوە، کە هەوڵ بدات هەرچۆنێک

بووه بڕوات و ئەو بەڵای خوایه لەگەڵ خۆی بهێنێت.

ڤێلچانینۆڤ، کە شێتانە ڕقی لێ دەباری، وەڵامی دایەوە، "جارێکی تریش هەوڵ دەدەمەوە، شەرت بێ چوارپەلی ببەستمەوە و بە دەستی خۆم پەلکێشی ئێرەی بکەم.

بیرۆکەی ئەوەی چوارپەلی پاڤێل پاڤلۆڤیچ ببەستێتەوە و بە دەستەکانی خۆی پەلکێشی ئەوێ بکات، مەیلێکی زۆر سەیری بۆ دروست کردبوو، کە هەرچی زووتره بڕوات و بەزۆر و بێ ئەوەی ئۆقره بگرێت، ئەم مەیلەی بەجێ بهێنێت. بە کلاڤدیای وت، "هیچ نەبێت، بە لایەنی کەمەوە ئێستا بەرامبەر بەو هەست بە گوناح ناکەم،" لە کاتی ماڵئاواییکردنیش لێی، بەوپەڕی تووڕەییەوە ئەمەشی خستە سەر قسەکانی، "لە هەموو ئەو قسە بەسۆزانە و لووشکەلووشکانەی دوێنێشم پاشگەز دەبمەوە، کە سەبارەت بەو خوێڕییە کردمن."

لیزا ڕاکشابوو، چاوەکانیشی لێک نابوون، وا دەر دەکەوت خەوتبێت، وا دەر دەکەوت کەمێک باشتر بێت. کاتێک ڤێلچانینۆڤ بەوریاییەوە خۆی چەماندەوه و ویستی، تەنانەت ئەگەر چمکێکی جلەکانیشی بووه، ماچی بکات و خوداحافیزیی لێ بکات، کتوپڕ چاوەکانی کردەوه و وەک ئەوەی چاوەڕێی ئەوەی کردبێت، بەهێواشی چرپاندی بۆ ڤێلچانینۆڤ، "لێره دوورم بخەرەوە!"

پاڕانەوەکەی زۆر لەسەرخۆ و جێی بەزەیی بوو. شوێنەواری هیچ تووڕەییەکی پێوه نەدەبینرا، وەک ئەوەی ڕۆژی پێشووتر، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خۆشی لەوه دڵنیا بوو، کە داواکەی جێبەجێ ناکرێت. ڤێلچانینۆڤ بەوپەڕی نائومێدییەوە هەوڵی دا قایلی بکات، کە ئەوەی داوای دەکات، ئەستەمە.

لـه بێدەنگیـدا لیـزا چاوەکانـی لێـک نـا و یـەک وشـەی تـر چییـە، لـە زاری دەر نەهـات، وەک ئـەوەی نـە گوێـی لـێ بێـت و نـە بشـیبینێت.

بە گەیشـتنەوەی نـاو پترسـبۆرگ، داوای لـە گالیسـکەوانەکە کـرد ڕاسـتەوخۆ بیبـات بـۆ ئوتێـل پۆکرۆفسـکی. کاتژمێر دە بوو، پاڤێل پاڤلۆڤیـچ لـە کوختەکـەی نەبـوو. ڤێلچانینـۆڤ نیوکاتژمێری تـەواوی لـە چاوەڕوانیـی ئـەودا بەسـەر بـرد، لـە ئەگەرونەگەری هاتنـەوە یـان نەهاتنـەوەی پاڤێـل پاڤلۆڤیچـدا، هـەر خەریکـی هاتوچـۆ و سـەر و خـوار بـوو لەنـاو ڕاڕەوەکـەدا. لـە کۆتاییـدا ماریـا سیسـۆڤنا دڵنیـای کـردەوە، کـە ناگەڕێتـەوە بـۆ ماڵـەوە تـا سـەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتـر. ڤێلچانینـۆڤ لەلایـەن خۆیـەوە بڕیاری دا: "کەواتـە منیـش سـەرلەبەیانیی زوو دەگەڕێمـەوە بـۆ ئێـرە." پاشـان بـەرەو مـاڵ ئۆغـری کـرد.

بـەڵام تووشـی چ واقوڕمانێـک بـوو، کاتێـک لـە بـەردەم دەرگای باڵاخەنەکیـدا ماڤـرا پێـی ڕاگەیانـد کـە ئـەو میوانـەی دوێنـێ سـەردانی کردبـوون لەوێیـە و تـا نزیکـی کاتژمێـر دە هـەر چاوەڕوانـی گەڕانـەوەی ئـەم بـووە. پاشـان ماڤرا ئەمەشـی خسـتە سـەر قسـەکانی، "گەلێـک دڵخـۆش بـوو بـەوەی لێـرە چاییەکـی خواردۆتـەوە و پاشـان سـەرلەنوێ ناردمیـەوە تـا بوتڵێـک عەرەقـی بـۆ بهێنـم، بـۆ ئەمـەش، دروایێکـی پێنجڕۆبڵیـی شـینی پـێ دام، کـە بـۆی بهێنـم."

# ٩

# تارماییەك

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەتەواوی ئاسوودەییی خۆی وەر گرتبوو. لەسەر هەمان کورسییەکەی ڕۆژی پێشووتر لێی دانیشتبوو. جگەرەی دەکێشا و هێندەش نەدەبوو کە پەرداخی چوارەم و کۆتاییی لەو عەرەقەی مابۆوە، کە لە بوتڵەکە بۆ خۆی تێکردبوو. قۆرییەک و پیاڵەیەک چایی تەواونەکراویش لە نزیکیەوە لەسەر مێزەکە بوو. ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوی ئاماژە بوو بۆ ئەوەی گەلێک دڵشاد و ئاسوودەیە بە دۆخەکە. تەنانەت پاڵتۆکەشی لەبەر خۆی داکەندبوو، هەر هێلەکەکەی لەبەردا مابوو، وەک ئەوەی گەرمای بێت. بەڵام هەرهێندەی چاوی بە ڤێلچانینۆڤ کەوت، گورج خۆی گەیاندە پاڵتۆکەی و لەبەری کرد و هاواری کرد، "خەجاڵەتم، هاوڕێی زۆر لەدڵاشیرین! بۆیە پاڵتۆکەم داکەندبوو تەنها بۆ چێژبینینی زیاتر لە کاتەکە..."

ڤێلچانینۆڤ بەهەڕەشەوە لێی نزیک بۆوە. "هێشتا بەتەواوی مەست نیت؟ ئایا ئەگەری ئەوە هەیە کە

هێشتاش بتوانرێت قسەت لەگەڵدا بکرێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەمێک پەشۆکا. "نەخێر، بەتەواوی نا... بە یادی ئەو کۆچکردووەوە خواردمەوە، بەڵام... بەتەواوی مەست نیم..."

"کەواتە لێشم تێدەگەیت؟"

"ئێ، هەر بۆیە هاتووم بۆ ئێرە، تا لێت تێبگەم."

ڤێلچانینۆڤ هاواری کرد، "کەواتە زۆر باشە؛ ئەمەوێت ڕاستەوخۆ و بێ پێچوپەنا لەوەوە دەست پێ بکەم و پێت بڵێم، کە جەنابت کەسێکی خوێڕی و ناکەسبەچەیت!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ ئاشکرا بوو کە هەترەشی چووە، نارەزاییی دەربڕی، وتی، "هاوار بە ماڵم، ئەگەر ئاوا دەست پێ بکەیت، ئەی ئەبێت چۆن کۆتاییی پێ بهێنیت؟"

"کچەکەت خەریکە دەمرێت، ئەو زۆر نەخۆشە، ئایا دەستبەرداری ئەو داماوە بوویت یان نا؟"

"هەر بەڕاست، ڕێی تێ دەچێت ئەو بمرێت؟"

"ئەو نەخۆشە، ئێجگار نەخۆشە، بە شێوەیەکی ترسناک نەخۆشە!"

"ڕەنگە هەر کۆکەیەکی سادە بێت..."

"قسەی قۆڕ مەکە! ئەو ئێ-ج-گا-ر، بە شێوەیەکی ترسناک نەخۆشە! ئەبێت هەر بچیت بۆ لای، ئەگەر تەنها بۆ ئەوەی..."

"بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری خۆمیان بۆ دەر ببڕم، سوپاسگوزاریان بم لەسەر میواندارییەکەیان! من بەتەواوی لەمە تێدەگەم ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەی هاوڕێ بەڕێز و بەویقارەکەم!"

وای وت و کتوپڕ بە هەردوو دەستی خۆی دەستی ڤێلچانینۆڤی گرت و بە هەستێکی ناسک و مەستانە، هێندەی نەمابوو کە لە پرمەی گریان بدات، وەک ئەوەی بپاڕێتەوە و داوای لێخۆشبوون بکات، بەردەوام بووە لە هاوارکردنەکەی، "هاوار مەکە بەسەرما ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ، هاوار مەکە! باشە هیچ دوور نەڕۆین، ئەگەر من بمرم یان بە سەرخۆشی بکەومە ناو نیڤاوە، پێم نالێیت چی لە ڕاستیی ناواخنی شتەکان دەگۆڕێت؟ ئیمە کاتێکی زۆرمان بەدەستەوەیە تا بچین بۆ لای خێزانی پۆگۆریلستیڤ..."

ڤێلچانینۆڤ خۆی کۆ کردەوە و کەمێک جڵەوی خۆی گرت و بەمۆنی وتی، "تۆ بەدمەستیت، هەر بۆیە تیناگەم لەوانەی دەتەوێت بیانڵێیت، من هەمیشە ئامادەم هەموو شتێکت لەگەڵدا باس بکەم، لە ڕاستیدا خۆشحاڵیش دەبم، هەرچی زووتر، باشتر... لە ڕاستیدا هەر بۆ ئەوەش هاتووم... بەڵام پێش هەموو شتێک، ئەمەوێت ئاگادارت بکەمەوە کە پێویستە لەسەرم چەند هەنگاوێکت بەرامبەر بگرمە بەر؛ پێویستە لەسەرت ئەمشەو لێرە بەسەر بەریت! سبەینێ بەیانی لەگەڵ خۆم دەتبەم و بە یەکەوە دەڕۆین."
دیسانەوە ڤێلچانینۆڤ هاواری کرد، "ڕێت پێ نادەم بڕۆیت، چوارپەلت دەبەستمەوە و بە دەستەکانی خۆم دەتبەم!..."
پاشان بەهەناسەبڕکێوە ئەمەشی وت، "حەزت لەو چەرپایە هەیە؟" ئاماژەی بۆ چەرپایەکی لووس و پان کرد، کە بەرامبەر دانەیەکی تر بە پێچەوانەوە ڕووبەدیوارەکەی تر دانرابوو، کە خۆی هەمیشە لەسەری دەخەوت.

"کێشەم نییە، لە هەرشوێنێکدا بێت، دەتوانم بخەوم..."

"هەرشوێنێک نا، ئا لەسەر ئەو چەرپایە! ها، بگرە، ئەوە چەرچەفەکانت، ئەوە لیفەکەت، ئەوەش بالیفەکەت." ڤێلچانینۆڤ هەموو ئەم شتانەی بەخێرایی لە کەنتۆرەکەی دەر هێنا و هەڵی دا بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە ملکەچانە دەستەکانی گرتبۆوە بۆ گرتنەوەی شتەکان. "دەی خێرا، جێگەکەت چاک بکە، خێرا چاکی بکە!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەک ئەوەی دوودڵ بێت، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بەپێوە ڕاوەستابوو، هەموو شتەکانیشی بەدەستەوە بوو، لەسەر ڕوخساریشیدا بەڕوونی زەردەخەنەیەکی مەستانە و ڕووناک دەبینرا. بەڵام کاتێک ڤێلچانینۆڤ بۆ جاری دووەم بەتوورەییەوە فەرمانەکەی دووبارە کردەوە، کتوپڕ بەخێرایی کەوتە خۆی بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکە؛ پاڵی نا بە مێزەکەوە بۆ دواوە و دەستی کرد بە ناڵین و هانکەهانک، بۆ کردنەوەی چەرچەفەکان و ڕاخستنی ڤێلچانینۆڤ لێی نزیک بۆوە و هاوکاریی کرد. ڤێلچانینۆڤ هەستی بە جۆرێک لە ئاسوودەیی دەکرد، کاتێک بینیی میوانەکەی بەباشی ملکەچی فەرمانەکانیەتی، پاشان فەرمانی پێ کردەوە، وەک ئەوەی نەتوانێت بەبێ فەرمانکردن هیچی پێ بڵێت، "پێکەکەت تەواو بکەو بچۆرە ناو جێگەکەتەوە. خۆت ناردبووت ئەو عەرەقەت بۆ بهێنن، وا نییە؟"

"بەڵێ... دەزانم چیی تر نانێریت بۆ ئەوەی بۆمان بهێنن، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ."

"باشتر کە ئەوە دەزانیت، بە هەمان شێوە شتێکی تریش هەیە، پێویستە بیزانیت. ئەمەوێت جارێکی تریش پێت

بڵێمـەوە، کـە مـن حسـاب و کتابـی خـۆمـم کـردووە، جارێکـی تـر ڕێگـە نـادەم هیـچ یەکێـک لـەو قۆڕییاتانـەی دوێنێـت دووبـارە بکەیتـەوە، جارێکـی تـر نایەڵـم بەسەرخۆشـی ماچـم بکەیتـەوە، وەک ئـەوەی دوێنـێ کـردت."

پاڤێل پاڤلۆڤیـچ بزەیـەک گرتـی و وتـی، "خـۆم بـاش لـەوە تێدەگـەم، ئەلێکسـی ئیڤانۆڤیـچ، کـە ئەمـە... ئەمـە تەنهـا لـە یـەک جـار زیاتـر ڕوو نـادات."

ڤێلچانینـۆڤ لـە ژوورەکـەدا هـەر سـەر و خـواری بـوو، کاتێـک گوێـی لـەو وەڵامـە بـوو، یەکسـەر لـە بـەردەم پاڤێـل پاڤلۆڤیچـدا ڕاوەسـتا و وتـی، "پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ، بەڕاشـکاوی قسـەم لەگـەڵ بکـە! تـۆ مرۆڤێکـی هۆشـیاریت، دووبـارە دان بەمـەدا دەنێمـەوە، بـەڵام مـن دڵنیـات دەکەمـەوە، کـە تـۆ لەسـەر ڕێگەیەکـی هەڵەیـت! ڕاشـکاوانەو بـێ پێچوپەنـا قسـە بکـە، بـێ پێچوپەنـا هەڵسـوکەوت بکـە، منیـش بـە شـەرەفی خـۆم پەیمانـت پـێ دەدەم، کـە وەڵامـی هـەر پرسـیارێکت بدەمـەوە، کـە خـۆت حـەزی پـێ بکەیـت."

سـەرلەنوێ پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ هەمـان بـزە تەوسـاوییە دووررودرێژەکـەی خسـتەوە سـەر لێوەکانـی، کـە بـەس بـوو بـۆ ئـەوەی جارێکـی تـر ڤێلچانینۆڤـی پـێ دەهـری بکاتـەوە.

ڤێلچانینـۆڤ سـەرلەنوێ هـاواری کـردەوە، "ڕابوەسـتە! جەفەنگبازی مەکـە، دەتوانـم ناخـت ببینم! دووبارەی دەکەمەوە، بە شـەرەفی خـۆم بەڵێنت پـێ دەدەم، کە ئامادەم وەڵامی هـەر شـتێکت بدەمـەوە، ئامـادەم هەرشـتێک، بکـەم ئەگـەر هۆکارێکـی بـاش بێـت بـۆ ئـەوەی تـۆی پـێ قایـل بکـەم. تەنانـەت شـتی مەحاڵیش! ئاخ، چەنـد حـەزم دەکـرد لێـم تێبگەیـت!..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە جۆرێک لە خۆپارێزییەوە بەرەوڕووی ڤێلچانینۆڤ هەنگاوی بۆ پێشەوە ناو وتی، "مادام ئاوا دڵت باش بووە - بەڕاستی لێت ناشارمەوە، ئەو قسەیەی دوێنێ شەوی ڕابردوو کردت سەبارەت بە جۆری شەڕخواز، زۆر لەسەر دڵم بووە بە مەراق!..."

ڤێلچانینۆڤ بەتووڕەیییەوە تفێکی لە عەردەکە کرد و خێراتر لە جاری پێشوو کەوتە هەنگاونان لە ژوورەکەدا.

"نا، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، تف لە عەردەکە مەکە، لەبەر ئەوەی زۆر مەراقمە، ڕاستییەکەی، هەر بە مەبەست هاتم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی دڵنیا ببمەوە... زمانم کەمێک دەیگرێت، بەڵام پێویستە بمبووریت. ئەزانی لە یەکێک لە گۆڤارەکان، لە ستوونی ڕەخنەییەکەی شتێکم لەسەر ئەو جۆری شەڕخواز و جۆری ئاشتیخوازە خوێندەوە... ئەم بەیانییە بیرم کەوتەوە... بەڵام تەنها لەبیرم چووبۆوە، ئەگەر ڕاستییەکەیت پێ بڵێم، لەو کاتەدا هیچ شتێک لەو بابەتە تێنەدەگەیشتم. ئەمە ئەو شتەیە، کە دەمویست بۆم ڕوون بکەیتەوە، ئایا ئەو کۆچکردووە، ستیپان میهایلۆڤیچ باگاوتۆڤ، لە کام جۆرەیانە، لە جۆری شەڕخوازەکەیە یان لە جۆری ئاشتی خوازەکەیە؟ بە بڕوای تۆ، ئەو سەر بە کام جۆرەیانە؟"

ڤێلچانینۆڤ هێشتا هەر بەبێدەنگی مابۆوە و لە سەروخوارکردنی خۆی بەناو ژوورەکەدا نەدەوەستا. پاش تاوێک وتی، "جۆری شەڕخواز کەسێکە، کە... "

پاشان کتوپڕ لە شوێنی خۆی ڕاوەستا و بە دەنگێکی پڕ لە تووڕەیی درێژەی دایەوە بە قسەکانی، "خۆی

بگەیاندایەتـە لای باگاوتـۆڤ بـە بۆنـەی شـەرەفی سـەرلەنوێ بەیەکترگەیشـتنەوە و لـە کاتـی خواردنـەوە بـە شـادیی یەکتـری، دوور نەبـوو ژەهـری لـە پەرداخـی شـەمپانیاکەی ڕۆ بکردایە، هـەر وەک چۆن دوێنێ لەگەڵ مندا خواردتـەوە، نەدەبوو ئـەو شـوێن تەرمەکـەی بکەوێت تـا گۆڕسـتان، هـەر وەک ئـەوەی ئەمـڕۆ جەنابـت کـردت، نازانـم، مەگـەر هـەر خـودی ئەهریمـەن خـۆی بزانێـت چ هۆکارێکـی نهێنـی و پەنهـان، هەوەسـێکی بۆگـەن و هەسـتێکی تێکدەرانـە لەژێـر سـەرتدا بووبێت، پێدەچێت تەنها بۆ ڕسـواکردنی خـۆت ئـەو کارەت کردبێـت! بەڵـێ، بـۆ ڕسـواکردنی خـۆت!“

پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ، وەک ئـەوەی قاییـل بووبێـت بـە قسـەکانی، وتـی، ”ئـەوە ڕاسـتە کـە پێویسـتی نەدەکـرد بچـم بـۆ گۆڕسـتان، بـەلام لـەوە تێناگـەم، کـە بۆچـی ئـاوا هێـرش دەکەیتـە سـەرم...“

ڤێلچانینـۆڤ، کـە وردەوردە دەهریتـر دەبـوو، بـێ ئـەوەی بایەخ بـە قسـەکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بدات، هـاواری کـرد، ”ئـەوە کـەی پیـاوە، ئـەوە کـەی پیـاوە کـە خـۆی بخاتـە بەرچـاوان و مەگـەر هـەر خـوا بۆخـۆی بزانێـت بۆچـی بەتووڕەیییـەوە هـەر خەریکـی ژماردنـی ڕاسـت و هەڵەکانیەتـی، بـەردەوام دێـت و دەچێـت و بـەردەوام سـکالاکانی وەک وانەیـەک دووبـارە دەکاتـەوە، تاوێـک ناسـرەوێت، مەیموونئاسـا، هەرچیـی جـۆری گاڵتەبازییـە، دەیـکات، یەخـەی خەڵـک دەگرێـت و دەسـت دەخاتـە گەردنیـان و دەشـێت زۆربـەی زۆری کاتەکانیشـی بـە هەمـان شـێوە، هـەر لـەوەدا بەفیـڕۆ بـدات! ئایـا ئـەوە ڕاسـتە کـە جەنابـی ناموبارەکـت هەوڵـت

داوە خۆت لەسێدارە بدەیت، ئەوە ڕاستە؟"

"نازانم، کاتێک مەست بووم، بە شێوەیەکی شێتانە قسەم کردووە، نایەتەوە خەیالم. بەڵام ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەوە کارێکی تەواو نەشیاوە کە ژەهر بکەمە ناو عەرەقەوە، ئەو جۆرە کارانە لە من بەدوورە، جگە لەو ڕاستییەشی کە من فەرمانبەرێکی شارستانیم و ناو و ناوبانگێکی باشیشم هەیە، خۆشت ئەوە دەزانیت، کە من خاوەن پارەی خۆمم، ئێ لەوە زیاتر چیم دەوێت، ڕەنگیشە بمەوێت دووبارە ژن بهێنمەوە."

"لەگەڵ ئەوەشدا، تۆ تووشی ناخۆشی دەبیتەوە."

"بەدڵنیاییەوە، ئەو بارودۆخە ناخۆشانەش ڕوو دەدات، لەگەڵ ئەوەی لەم ڕۆژانەی دواییدا دادگا یاساییەکانمان پڕ بوون لە زۆرێک لەو بەڵگە و هۆیانەی لە توندوتیژی و خراپەی تاوانێک و سزاکەی کەم دەکەنەوە. ئەمەوێت بەو بۆنەیەوە، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، سەرگوزەشتەی کوشتنێکی پێکەنیناویت بۆ بگێڕمەوە، کە ئەم بەیانییە لەناو گالیسکەکەدا بیرم کەوتەوە. ئەمویست ئەو کاتە بۆتان بگێڕمەوە. هەر ئێستا وتت، دەست دەخەیتە گەردنی ئەو خەڵکە. ڕەنگە تۆ سێمیۆن پترۆڤیچ لیڤستۆڤت لەبیر بێت، ئەو کاتەی تۆ هێشتا لە ت بوویت لەلامان، جاروبار ئەهات بۆ لامان و سەردانی دەکردین. بەڵێ، براکەی کە لە خۆی بچووکتر بوو، ئەویش بە هەمان شێوە لاوێکی پترسبۆرگی تەڕپۆش بوو، سەروکاری لەگەڵ پارێزگاری ڤ هەبوو، ئەویش بەهەمانشێوە، کۆمەڵێک تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆی هەبوو. جارێک لەگەڵ گلۆبینکۆی عەقیددا،

لە بەردەم کۆمەڵێک خاتوونی شۆخوشەنگدا، بووبووی بە دەمەقاڵێ، کە لەنێوان ئەو خاتوونانەدا، ئەو خاتوونەش لەوێ ئامادە ببوو، کە بەتەواوی دڵی داگیر کردبوو، لە کاتی دەمەقاڵێکەدا وا هەستی کردبوو کە سووکایەتیی پێ کراوە، بەڵام ئەو سووکایەتییەکەی لە ناخی خۆیدا خواردبۆوە و بێدەنگیشی بەرامبەر هەڵبژاردبوو، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکیش بەسەر ئەو بارگرژییەی ڕوویدا، گلۆبینکۆ ئەو خانمەشی کە شێت و شەیدایی ببوو، لێی دەبات و هاوسەرگیریی لەگەڵ دەکات و کڵاو بۆ ئەو بەدبەختە دەدوورێت. وا بیر دەکەیتەوە کە چی ڕووی دابێت؟ ئەو لیڤستۆڤە خۆی کرد بە هاوڕێی گیانیبەگیانیی گلۆبینکۆ، بەتەواوی لەگەڵیدا ئاشت ببووەوە، نەک هەر ئاشت ببووەوە لەگەڵیدا، بگرە پێداگریی ئەوەشی کردبوو، کە ببێت بەبرازاواشی*، تاجی هاوسەرگیرییەکەی بە دەستەوە گرتبوو، دوای ئەوەی مەراسیمی تاجلەسەرنانەکە کۆتایی هاتبوو، خۆی لە گلۆبینکۆ نزیک کردبۆوە بەحساب بۆ ئەوەی ئەملا و ئەولای ماچ بکات و پیرۆزباییی لێ بکات؛ بەڵێ، لەو کاتەدا بوو کە بە چاکەتە دووفلیقانەکەیەوە و بە قژی کاکۆڵییەوە، لە بەردەم پارێزگار و سەرجەم یاوەرە بەڕێزەکانی، بە هەموو هێزی خۆی کێردێک لە سکی زاوا ڕۆ دەکات،

هێندە نابات، گلۆبینکۆ لەناو خوێنی خۆیدا، لە عەردەکەدا

* برازاوا: یاریدەدەری زاوا لە کاتی بووکگوێزانەوەدا، پشتێنەی بووک ئەو دەیبەستێت.

دەگەوزێت! برازاوای خۆی! چ شوورەیییەکە! بەڵام دواتر چی، دوای ئەوەی کەتنەکەی نایەوە، دەستی کردبوو بە شینوشەپۆڕ: 'باوکەڕۆ! چیم کرد! ئەی ماڵوێران خۆم، ئەوە چی بوو کردم!' لەگەڵ ئەوەی سەرتاپای گیانی وەک شەقشەقە دەلەرزی، ڕۆندک بە چاوەکانیدا جۆگەلەی بەستبوو، خۆی هەڵدەدا بۆ ئەو خەڵکە و دەستی دەخستە گەردنیان، تەنانەت گەردنی ئافرەتەکانیش. هاواری دەکردو دەلالایەوە، بەردەوام دەیوت، 'ئەی هاوار، چیم بە خۆم کرد! ماڵوێران خۆم، چیم بە خۆم کرد!' ها-ها-ها! دیمەنەکە بە شێوەیەک بوو، پیاو لە پێکەنینا دەتەقی. ڕەنگە تاقە کەسێک کە جێگەی داخ بووبێت، گلۆبینکۆ بووبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، سەرباری هەموو شتێک، لیڤستۆڤ حەقی خۆی لێ کردەوە."

ڤێلچانینۆڤ برۆکانی خۆی هێنایەوە یەک و بەمۆنی وتی، "سەر لەوە دەر ناکەم، کە بۆچی ئەو چیرۆکەت بۆ گێڕامەوە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەهێواشی تریقایەوە، "بەڵێ، دەزانیت، هەر لەبەر ئەوەی کێردێکی لە سکی ئەو ڕۆ کرد، مانای ئەوە نییە ئەو کەسێکی بوێر و شەڕانی بووبێت، هەر وەک دەبینیت، ئەو کەسێکی گرینۆک و نووزەنووزکەرە، هەر لەوەوە بۆت دەر دەکەوێت، لەو کاتەوەی هەرچیی ڕەوشتی باشییەتی، لە ترسا لەبیری کردووە و لە بەرچاوی پارێزگاردا خۆی فڕێ داوەتە بەردەم ئەو خاتوونانەی ئەوێ و دەستی خستۆتە گەردنیان، بەڵام هەر وەک دەبینیت، ئەو دەستی خۆی وەشاند، بەوەش

حەقی خۆی کردەوە! ئەمەش هەموو ئەو شتە بوو کە مەبەستم بوو."

ڤێلچانینۆڤ کتوپڕ نەڕاندی، بە دەنگێک، کە لە دەنگی خۆی نەدەچوو، وەک ئەوەی شتێک لەناویدا کڵپەی کردبێت، "بڕۆ بۆ دۆزەخ! خۆت و دەروونە شاراوە و بۆگەنەکەت بچن بۆ دۆزەخ! تۆ هیچ نیت جگە لە مرۆڤێکی نامەرد و خوێڕی. پێت وایە بەم جۆرە چیرۆکانە دەتوانیت بمترسێنیت؟ هەی ناپیاو، تەنها ئازایت ئەشکەنجەی منداڵێکی داماو بدەیت."

هەناسەی سوار ببوو بەتوندی ئەیشیڕاند، "خوێڕیی ترسنۆک، خوێڕیی ترسنۆک!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە شوێنی خۆی هەستایەوە و پێدەچوو بەتەواوی سەرخۆشییەکەی بەری دابێت، لێوەکانی دەلەرزین، وتی، "ئەوە تۆیت، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ وام پێ دەڵێیت؟ ئەوە تۆییت پێم دەڵێیت خوێڕیی ترسنۆک؟"

دواتر ڤێلچانینۆڤ تێگەیشت قسەکانی هەڵە بووە بەرامبەر بەو، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک بە دڵتەنگانە بێدەنگ بوو، وەڵامی دایەوە، "ئامادەم داوای لێبووردنت لێ بکەم، بەڵام بەو مەرجەی ڕێک و ڕاست، چیتان هەیە بیڵێن و ڕاشکاوانەش هەڵسوکەوت بکەن."

"ئەگەر لە جێگەی تۆدا بام، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەوە بێ هیچ ئەگەر و مەرجێک داوای لێبووردنم دەکرد."

دوای بێدەنگییەکەی، ڤێلچانینۆڤ وتی، "زۆرباشە، چۆنت دەوێت با وا بێت، من داوای لێبووردنت لێدەکەم، بەڵام پێویستە خۆشت ئەوەت پەسەند بێت پاڤێل پاڤلۆڤیچ، دوای

هەموو ئەو شتانەی ڕووی دا، ئەوە بە هیچ کلۆجێک من خۆم بە قەرزار باری تۆ نازانم. بەم قسەیەشم، تەنها مەبەستم لەوە نییە کە لە ئایندەدا ڕوو دەدات، بەڵکوو مەبەستم لە هەموو ئەوەشە کە ڕووی داوە."

"زۆر باشە، ئەوە کەی کێشەیە، بۆچی ئەم شتانە لێک دەدەیتەوە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بزەیەکی کرد و چاوەکانی ڕوو بە عەردەکە نەوی کرد.

"ئێ کەواتە باشتر، زۆر باشتر! عەرەقەکەت تەواو بکە و بچۆرە ناو جێگەکەتەوە، لەبەر ئەوەی کە ڕێگەت پێ نادەم بڕۆیت، بە هەرحاڵ..."

"ئەها... عەرەقەکە..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وا دەر دەکەوت کەمێک تەریق بووبێتەوە. خۆی گەیاندەوە مێزەکە، هەرچۆنێک بێت، دواپێکی هەڵدا کە لەمێژ بوو تێی کردبوو و دای نابوو. گومانی تێدا نەبوو کە پێشتر زۆر زۆری خواردبۆوە، چونکە دەستی دەلەرزی و بەشێک لەو عەرەقەی لە پەرداخەکەدا مابوو، لە دەستی ڕژا و کەوتە سەر عەردەکە، کراسەکە و هێلەکەکەشی تەڕ کرد. هەرچۆنێک بێت، دواپێکیشی هەڵدا، وەک ئەوەی سوێندی خواردبێت دڵۆپی تێدا نەهێڵێت، دواتر بەوپەڕی ڕێزەوە پەرداخە بەتاڵەکەی کردەوە سەر مێزەکە و بەوپەڕی شەکەتییەوە چووە لای جێگەخەوەکەیەوە، بۆ ئەوەی خۆی بگۆڕێت.

لە کاتێکدا تاکێکی پۆتینەکانی لە قاچی دەر هێنابوو و بە دەستییەوە گرتبووی و نەدەزانرا بە چ هۆکارێک، لەپڕ

وتی، "باشە، باشتر نییە ئەمشەو لێرە بەسەر نەبەم؟"

ڤێلچانینۆڤ، کە هێشتا هەر خەریکی سەروخوار بوو لە ژوورەکەدا، بەبێ ئەوەی سەیری بکات، بەوپەڕی تووڕەیییەوە وەڵامی دایەوە، "نەخێر، باشتر نییە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ خۆی گۆڕی و چووە ناو جێگەکەیەوە. دوای چارەکێکیش، ڤێلچانینۆڤیش بە هەمان شێوە مۆمەکەی کوژاندەوە و چووە ناو جێگەکەیەوە.

هەرچەندی دەکرد، خەو نەدەچووە چاوەکانی. هەنووکە شتێکی نوێ و چاوەڕواننەکراو سەری هەڵدابوو، کە کۆی مەسەلەکەی زۆر زیاتر لە هەرکاتێکی دی ئاڵۆزتر کردبوو و گەلێک نیگەرانی کردبوو، لە هەمان کاتیشدا کە کەس نەیدەزانی بۆچی خەو نەدەچووە چاوەکانی، لە حاڵی خۆی تەریقی دەکردەوە.

خەریک بوو سەرخەوێکی دەشکاند، بەڵام یەکسەر بە هۆی دەنگی خشەخشێکەوە لە خەو ڕابوو. خێرا لە چواردەوری خۆی ڕوانی و یەکسەر تەماشای جێگە خەوەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچی کرد. ژوورەکە تاریک بوو، پەردەکان ڕاکیشرابوون، بەڵام ڤێلچانینۆڤ وا هاتە بەرچاوی، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ ڕانەکشابێت، بەڵکوو لەسەر جێگەکەی دانیشتووە.

ڤێلچانینۆڤ لێی پرسی، "کێشە چییە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، پاش تاوێک بێدەنگی، بە دەنگێکی نزم کە بەئەستەم دەبیسترا، وتی، "تارماییيەک..."

"مەبەستت چییە، چ جۆرە تارماییيەک؟"

"لەوێ، ئا لەو ژوورەدا، پێم وا بێت تارماییيەکم بینی

لـەلای دەرگاکـەوە تێپـەڕی."

دوای کەمێـک بێدەنگـی، سـەرلەنوێ ڤێلچانینـۆڤ لێـی پرسـییەوە، "تارماییـی کـێ؟"

"تارماییی ناتالیا ڤاسیلیڤنا."

ڤێلچانینـۆڤ پێیەکانـی خسـتە سـەر فەرشـەکە و هەسـتایە سـەر پـێ، چـاوی بڕییـە ئـەو ڕاڕەوەی ژوورەکـەی تـری لـێ بـوو، ئـەوەی هەمیشـە دەرگاکـەی لەسـەر پشـت بـوو. لەبریـی پـەردەی دووبـەر، تەنهـا پەردەیەکـی تەنکـی ئاسـایی لەسـەر ڕووی پەنجەرەکانـی ئـەو ژووره بـوو، هـەر بۆیـە ئـەو ژوورەیـان ڕووناکتـر بـوو.

"هیـچ شـتێک لـەو ژوورەدا نییـە و جەنابیشـت دیـارە مەسـتیت. بـڕۆرەوە نـاو جێگەکـەت و بخـەوە!"

ڤێلچانینۆڤ وای وت و چووەوە نـاو جێگەکـەی و لێفەکـەی لـە خـۆی ئالآنـد. پاڤێـل پاڤلۆڤیچیـش بـە هەمـان شـێوە، بـێ ئـەوەی وشـەیەک لـە زاری بێتـە دەرەوە، ڕۆشـتەوە نـاو جێگەکـەی.

دوای تێپەڕبوونـی دە خولەکێـک بەبێدەنگـی، لەنـاکاو ڤێلچانینـۆڤ پرسـیی، "ئایـا پێشـتریش ڕێـک کەوتـووە تارماییـی تـر ببینیـت؟"

پاڤێـل پاڤلۆڤیچیش بـە هەمـان شـێوە بـۆ سـاتێک بێدەنـگ بـوو، پاشـان بـە دەنگێکـی کزەوە وەڵامـی دایـەوە، "پێـم وا بێـت یـەک جـاری تریـش دانەیەکـی تـرم بینیـوە."

سەرلەنوێ بێدەنگییەکە باڵی کێشـایەوە بەسـەریاندا.

ڤێلچانینـۆڤ زۆر لـەوە دڵنیـا نەبـوو، کـە خـەوی لـێ کەوتبـوو یـان نـا، بـەڵام هەمـووی کاتژمێرێـک تێنەپەڕیبوو،

کە سەرلەنوێ لەناکاو بەئاگا هاتەوە، لەوە دڵنیا نەبوو کە ئایا دووبارە بە هۆی خشەخشەوە خەبەری بۆتەوە یان نا. بەڵام وا هەستی کرد لەو تاریکییەدا شتێکی سپی لەوبەریەوە وەستاوە، زۆر نزیک نەبوو لێی، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو. لەناو جێگەکەیدا ڕاست بۆوە و بۆ ماوەی خولەکێکی تەواو بەبێ چاوترووکاندن چاوی بڕیبووە ناو تاریکییەکە. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی، "ئەوە تۆیت، پاڤێل پاڤلۆڤیچ؟"

دەنگەکەی خۆی، کە لەو تاریکییە خامۆشەدا کتوپڕ دەنگی دایەوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان تووشی واقوڕمانی کرد.

هیچ وەڵامێکی بەرگوێ نەکەوت، بەڵام هیچ گومانێک لەوەدا نەبوو، کە کەسێک لەوێ بەپێوە وەستابوو.

دووبارە هاواری کردەوە، بەڵام ئەم جارە بە دەنگێکی زۆر بەرزتر، لە ڕاستیدا دەنگەکە هێندە بەرز بوو، ئەگەر پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەوپەڕی قووڵاییی خەویشدا بووایە، بەدڵنیاییەوە لە خەو ڕادەبوو، لە جێگەکەی ڕاست دەبۆوە و وەڵامی دەدایەوە.

"ئەوە تۆیت... پاڤێل پاڤلۆڤیچ؟"

بەڵام هەمدیسان هیچ وەڵامێکی بەرگوێ نەکەوتەوە، تەنانەت وا هاتە پێشچاوی، کە ئەو بیچمە سپییە، کە بەئەستەم دەبینرا، وردەوردە تا بهاتایە لێی نزیکتر دەبۆوە. پاشان شتێکی نامۆ لە دەروونیدا ڕووی دا، پێدەچوو شتێک لە ناوەوەیدا کڵپە بکات، ڕێک وەک هەمان ئەو هەستەی ئەو ئێوارەیەی تر هەیبوو، هەتا هێزی تێدا بوو، بەتوندی

هـاواری کـرد، بـە دەنگێکـی ئەوپـەڕی ڤێـزەون، ئەوپـەڕی شڵەژاو، کە هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو، لە کاتی دەربڕینی هەریەکێک لەو وشانەی دەیوتن: "ئەگەر تۆ... سەرخۆشی گەمژە... وا خەیاڵ دەکەیت و زاتی ئەوە دەکەیت... کە دەتوانیت... بمترسێنیت، ئەوە خەیاڵت خاوە، ڕوو دەکەمە دیوارەکە و لێفەکەم ئەدەم بەسەرما. تەواوی شەوەکە، یەک جاریش چییە ئاوڕت لێ نادەمەوە. بۆ ئەوەی پێت نیشان بدەم کە تۆ چەند بێبایەخیت لەلام... ئەگەر هەتا بەیانییش بەم شێوەیە بمێنیتەوە... وەک گەلحۆیەک... ئەوە تف لە ناوچەوانت دەکەم..."

پاشان بەوپەڕی تووڕەییەوە تفی کرد لەو ئاراستەیەی پێی وا بوو پاڤێل پاڤلۆڤیچی لێ ڕاوەستاوە. ڕووی خۆی وەر چەرخاند بەرەوڕووی دیوارەکە، هەر بەو شێوەیەی خۆی وتبووی، لێفەکەی یا بە سەری خۆیدا و بەم شێوەیە نقەی لە خۆی بڕی، بەتەواوی جووڵەی لە خۆی بڕیبوو. بێدەنگییەکی سامناک تەواوی ژوورەکەی داگرتبووەوە... ئاگاداری ئەوە نەبوو، کە ئایا تارماییەکە دەجووڵێت و لێی نزیک دەبێتەوە یاخود هەر وەک خۆی، لە شوێنی خۆی ماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دڵی لێی دەدا، لێیدەدا، زۆر بەتوندی لێی دەدا. پێنج خولەکی تەواو بەم شێوەیە تێپەڕی، لەناکاو، دوو هەنگاوێک لەولایەوە، گوێبیستی دەنگی لاواز و ملکەچانەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بوو.

"هەستام، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، بۆ گەڕان بەشوێن..."
کە وای وت، ئاماژەی بۆ شتێکی ناوماڵ کرد، کە دەستبەرداربوون لێی شتێکی ساناى نییە، "لەلای جێگە

خەوەکـەی خـۆم نەمتوانـی بیدۆزمـەوە... ویسـتم بەبێدەنگـی ژێـر جێگـە خەوەکـەی تـۆی بـۆ بگەڕێـم."

دوای نیوخولەکێـک بێدەنگـی، ڤێلچانینـۆڤ بـە دەنگێکـی لاڵەپەتییـەوە لێـی پرسـی، "ئـەی بۆچـی هیچـت نـەوت کاتێـک هـاوارم کـرد؟"

"ئاخـر هێنـدە تونـد هـاوارت کـرد، لـە ترسـا هەترەشـم چـوو... بەڕاسـتی ترسـابووم."

"لـەوێ، لـەو قوژبنـەدا لـەلای چـەپ، لەسـەر ئـەو دۆلابـە بچووکـە، مۆمێکـی لێیـە دای بگیرسـێنە."

"ئەتوانم بەبێ مۆمیش ئیشی خۆم بکەم."

پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ سەرشـۆڕانە، کـە بـەرەو قوژبنەکـە هەنـگاوی دەنـا، وتـی، "بمبـوورە ئەلێکسـی ئیڤانۆڤیـچ، بـۆ ئـەوەی ئـا بـەم شـێوەیە جاڕزم کـردن... بەتـەواوی سـەرم لـێ شـێوابوو..."

بـەڵام ڤێلچانینـۆڤ هیـچ وەڵامێکـی نەدایـەوە. هێشـتاش هـەر بـەو شـێوەیەی ڕووی کردبـووە دیوارەکـە، ڕاکشـابوو، تـەواوی شـەوەکەش هـەر بـەو شـێوەیە بەڕاکشـاوی مایـەوە. تەنانـەت بـۆ یـەک جاریـش چییـە، ئـاوڕی نەدایـەوە. ئایـا بـۆ ئـەوە بـەو شـێوەیە مابـووەوە، بـۆ ئـەوەی قسـەکەی خـۆی بباتـە سـەر یاخـود ئـەوە بـوو هـەر لـە ڕقـا وای دەکـرد، خۆشـی نەیدەزانـی هەسـت بەچـی دەکات؛ ئـەو نیگەرانـی و تووڕەبوونـەی بەسـەریدا هاتبوو، دواجـار بەتـەواوی تووشـی وڕێنـەی کردبـوو، بـۆ ماوەیەکـی زۆر خـەو نەدەچـووە چاوەکانـی و هـەر لەبـەر خۆیـەوە وڕێنـەی دەکـرد. بەیانـی کـە خەبـەری بۆوە، لەبەینی کاتژمێر نۆ و دە دا بـوو، لـە شـوێنی

خۆی ڕاست بۆوە و لەسەر جێگە خەوەکەی دانیشت، وەک ئەوەی یەکێک لەپڕ ڕای وەشاندبێت، بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەناو ژوورەکەدا نەبوو، جێگەکەی بەتاڵ و بەناڕێکوپێکی بەجێ هێڵدرابوو، دیار بوو لەگەڵ خۆرکەوتن بەخشکەیی بۆی دەر چووبوو.

ڤێلچانینۆڤ یەک دانەی کێشا بە ناوچەوانی خۆیداو هاواری کرد، "هەر زانیم ئا بەم شێوەیەی لێ دێت."

# ١٠

# لە گۆڕستان

ئـەوەی پزیشـکەکە لێـی ترسـابوو، هاتـە دی؛ کتوپڕ لیـزا تەندروسـتیی خراپتـر بـوو، خراپتـر لـەوەی ڤیلچانینـۆڤ و کلاڤدیا پترۆڤنا ئێوارەی پێشـووتر شیمانەیان کردبوو. کاتێک ڤیلچانینـۆڤ سـەرلەبەیانییەکەی گەیشـتە لای، نەخۆشـەکە، سەرەڕای ئـەوەی تاکـەی زۆر بـەرز بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشـتا بەتـەواوی هۆشـی لەبـەر نەبڕابـوو، دواتـر ڤیلچانینـۆڤ جەختـی لەسـەر ئـەوە کـردەوە، کـە لیـزا زەردەخەنـەی بـۆ کردووە و نەک هەر ئەوە، تەنانەت دەستە تادارە گچکەکانیشی بـۆ درێـژ کـردووە. نەدەزانـرا کـە ئایا بەڕاسـتی ئەمـە ڕووی دابـوو یـان تەنهـا دوور لـە ویسـتی خـۆی ئـەم شـتەی وێنا کردبوو بۆ دڵدانـەوەی خۆی، لـە دۆخێکی وەهـادا نەبوو، کە بیر لـەوە بکاتـەوە کە ئایا وا بووە یاخود نا. لەگـەڵ داهاتنی شـەودا، منداڵـە نەخۆشـەکە بەتـەواوی هۆشـی لەبـەر بڕا، ئیتر لـەم دۆخـەدا مایـەوە تا کۆتاسـاتەکانی ژیانی. دوای دە ڕۆژ لـە

هاتنی بۆ لای خێزانی پۆگۆریلستێڤ، لیزای بچکۆلە گیانی سپارد.

ئەمە خەماویترین سات بوو بۆ ڤێلچانینۆڤ، تەنانەت خێزانی پۆگۆریلستێڤ، کە زۆربەی ئەم ڕۆژە تاڵانەی دواتری لەگەڵدا بەسەر دەبردن، گەلێک نیگەرانی تەندروستیی ڤێلچانینۆڤ بوون. بەدرێژاییی ئەو چەند ڕۆژەی کۆتایی کە لیزا تێیدا نەخۆش بوو، لە قوژبنێکدا بەبێدەنگی دادەنیشت و تەواوی ساتەکانی بەم شێوەیە تێدەپەڕاند، پێدەچوو بیر لە هیچ شتێک نەکاتەوە، کلاڤدیا پترۆڤنا جاروبار بۆ ئەوەی لەو دۆخەی تێی کەوتبوو دەری بکات، هەوڵی ئەدا مێشکی بە بابەتێکی ترەوە سەرقاڵ بکات، بەڵام ڤێلچانینۆڤ کەمترین وەڵامدانەوەی دەبوو، نەک هەر ئەوەش، بگرە وا دەر دەکەوت کلاڤدیا نەک هەر باری سەرشانی سووک ناکات، بەڵکوو قورستریشی دەکات بە قسەکانی. کلاڤدیا پترۆڤنا هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو کە "ئەم بابەتە بەو شێوە قووڵە کاریگەریی لەسەر دڵ و دەروونی ڤێلچانینۆڤ دابنێت." منداڵەکان سەرکەوتووتر بوون لەوەی هەستی ببزووێنن؛ تەنانەت هەندێک جار کە لەگەڵ منداڵەکان دەبوو، لەگەڵیان یاریی دەکرد و پێدەکەنی. بەڵام سەری هەموو کاتژمێرێک لەسەر کورسییەکەی هەڵدەستا و بەبێدەنگی دەڕۆشتەوە بۆ لای نەخۆشەکە تا تەماشای بکات. هەندێک جار وا خەیاڵی دەکرد، کە نەخۆشەکە ناسیویەتیەوە. هیچ ئومێدێکی بەوە نەمابوو کە لیزا جارێکی تر چاک ببێتەوە، نەک هەر خۆی، بگرە هەمووان هیوابڕاو ببوون، لەگەڵ ئەوەشدا، هەرگیز لەو

ژوورە دوور نەدەکەوتەوە کە لیزا گیانی تێدا دەدا، بەزۆری لە ژوورەکەی تەنیشتی دادەنیشت.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەو ماوەیەی تێپەڕی، یەک-دوو جار گوڕی دایە بەر خۆی و بەپڕتاو بەرەو پترسبۆرگ چووبوو، بۆ گەڕان بە شوێن ناودارترین پزیشکەکاندا، تا بیانهێنێت و هەرچۆنێک بووە پشکنین بۆ نەخۆشەکە بکەن و چارەسەری بۆ بدۆزنەوە. بۆ جاری دووەم و کۆتاپشکنین، پزیشکێکی هێنا، ڕێک ئێوارەیەک پێش ئەوەی لیزای بچکۆلە گیان بسپێرێت. سێ ڕۆژ پێشتر کلاڤدیا پترۆڤنا پێداگریی ئەوەی لە ڤێلچانینۆڤ کردبوو، کە هەرچۆنێک بووە و بە هەرشێوەیەک بووە، بەپەلە بڕوات بەڕێز تروسۆتسکی بدۆزێتەوە و پەلکێشی ئەوێی بکات، ئاماژەی بەوە کردبوو، کە "ئەگەر بێت و منداڵەکە بمرێت پێش ئەوەی ئەو بگاتە ئێرە، ئەوە تەنانەت ناتوانن بەخاکیشی بسپێرن." ڤێلچانینۆڤ لە وەڵامدا منجاندبووی و پێی وتبوو نامەی بۆ دەنووسێت. لەو ڕووەوە پۆگۆریلستێڤ بەئاشکرا ئەوەی ڕاگەیاند، کە خۆی دەستبەکار دەبێت و لە ڕێگەی دارۆغەوە هەوڵی دۆزینەوەی دەدەن. لە کۆتاییدا ڤێلچانینۆڤ هەستا بە نووسینی یادداشتنامەیەک لە دوو دێڕدا و بردی بۆ ئوتێل پۆکرۆڤسکی. وەک خووی هەمیشەییی، هەمدیسان پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە ماڵ نەبوو. ناچار نامەکەی لەلای ماریا سیسۆڤنا بۆ بەجێ هێشت.

لە کۆتاییدا لیزا لە دەمەو ئێوارەیەکی هاویندا، لە کاتی خۆرئاوابووندا، گیانی پاکی سپارد. تەنها لەو کاتەدا بوو، پێدەچوو کە ڤێلچانینۆڤ تازە هۆش خۆی هاتبێتەوە. کاتێک

جلیان کردە بەری منداڵە مردووەکە، عەزییەکی سپی پاک و بێگەرد، هیی یەکێک لە کچەکانی کلاڤدیا پترۆڤنا بوو، کە بۆ جەژن بۆیان هەڵگرتبوو، تەرمەکەیان لەسەر مێزێک، لە ژووری میوان دانابوو لەگەڵ چەپکێک گوڵ لەناو دەستە بچکۆلە داخراوەکانیدا، ڤیلچانینۆڤ، کە چاوەکانی دەبریقانەوە، خۆی لە کلاڤدیا پترۆڤنا نزیک کردەوە و پێی ڕاگەیاند، کە دەستبەجێ دەڕوات و ئەو بکوژە لەگەڵ خۆی دەهێنێت. هەرچەند کلاڤدیا پترۆڤنا ئامۆژگاریی کرد، کە تەندروستیی باش نییە و باشترە سبەینێ بچێت، بەڵام گوێی بۆ ئامۆژگارییەکانی ڕانەگرت، یەکسەر بەرەو پترسبۆرگ بەڕێ کەوت.

دەیزانی لەکوێ پاڤێل پاڤلۆڤیچ بدۆزێتەوە؛ ڕاستییەکەی، ئەو کاتێک دەچوو بۆ پترسبۆرگ، تەنها لەبەر پزیشکهێنان نەبوو، هەندێک جار لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا بیری لەوە کردبۆوە، کە ئەگەر بێت و باوکی لیزا بهێنێت بۆ لای لیزا و هەروەها لیزاش گوێی لە دەنگی باوکی ببێت، ڕەنگە هۆشی بێتەوە بەبەردا و بێتەوە سەرخۆی، بەم شێوەیە، وەک دێوانەیەک بەشوێنیدا دەگەڕا. پاڤێل پاڤلۆڤیچ هێشتاش هەر لەو کوختەدا دەژیا، کە پێشتر تێیدا بوو، بەڵام بێسوود بوو کە لەوێ بەشوێنیدا بگەڕێیت.

ماریا سیسۆڤنا پێی ڕاگەیاندبوو، کە "ئەم سێ شەوەی ڕابردوو لەماڵەوە نەخەوتووە و بۆ ساتێکیش چییە نەگەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، ئەگەر گەڕابێتیشەوە، تەنها بەسەرخۆشی گەڕاوەتەوە و تەنها بۆ ماوەیەکی کورت

ماوەتـەوە و پاشـان سـەرلەنوێ ڕۆیشتۆتەوە دەرەوە... وا بڕوات خۆی لەناو دەبات." ئەو خزمەتکارەشی کە لە ئوتێل پۆکرۆڤسکی خزمەتی دەکرد لەنێوان ئەو شتانەی باس کرا بـە ڤێلچانینۆڤـی ڕاگەیانـد، کـە پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ ماوەیەکـە فێـر بووە هاموشۆی ئەو خانمە سۆزانییانە دەکات، کە بەردەوام لەسـەر شـەقامی ڤۆزینسنسـکی کەوتـوون. ڤێلچانینـۆڤ هـەر زوو خـۆی گەیانـد بـە سـۆزانییەکان. هـەر هێنـدەی کەمێـک پـارەی بەخشـییە ئـەم سـۆزانییانە، یەکسـەر سـەردانکەرە هەمیشـەیییەکەی خۆیـان بیـر کەوتـەوە، بەتایبـەت بـە هـۆی کڵاوەکەیـەوە، کـە شـریتێکی ڕەشـی پێـوە بـوو، دواتـر تێـر جنێویـان بـۆ ڕەوانـە کـرد، هـەر لەبـەر ئـەوەی ماوەیـەک بـوو سـەردانی نەکردبوون. یەکێک لـەو سـۆزانییانە، کە نـاوی کاتیا بـوو، پێـی وت، هەرکاتێک بیەوێت، دەتوانێت پاڤێل پاڤلۆڤیچـی بۆ بدۆزێتـەوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەم ڕۆژانـەی دوایـی بـەردەوام لـەلای ماشـکا پرۆسـتاکۆڤایە، پێدەچێـت ئـەم مـردوو مـراوە هێنـدە پـارەی زۆر بێـت، کـە کۆتاییـی پـێ نەیـەت. سـەبارەت بـەو ماشـکایە دەبـوو پێـی بووترایـە، ماشـکا پرۆخۆڤسـتۆڤ* لەبریـی ئـەوەی پێـی بوترێت ماشـکا پرۆسـتاکۆڤا، ئـەو ئێسـتا لـە نەخۆشـخانە کەوتـووە،" ئەگـەر ئـەو حـەزی بکردایـە، تەنهـا بـە یـەک قسـە ئەیتوانـی ئـەو قەحبەیـە ڕەوانـەی سـیبریا بکات، تەنهـا یـەک وشـە بـەس بـوو بـۆی تـا ئـەو کارە بـکات.

هەرچۆنێک بێت، ئـەو ڕۆژە کاتیا بەشـوێن پاڤێل پاڤلۆڤیچدا

* پرۆخۆڤسـتۆڤ: ئەمـە گەمەکردنـە بـە وشـەکان، نـاوی یەکەمیـان، وەک هـەر ناوێکـی تـر، ناوێکـی ئاسـاییە، بـەڵام نـاوی دووەم "پرۆخۆڤسـتۆڤ Prohvostov" بـە مانـای کەسـێکی نـزم و بێئەخـلاق دێـت.

نەگەڕا، بەڵام وەفادارانە بەڵێنی بە ڤیلچانینۆڤ دا، کە کاتێکی تر ئەم کارەی بۆ بکات. هەنووکە هەموو هیوایەکی ڤیلچانینۆڤ لەسەر کاتیا بوو بۆ دۆزینەوە پاڤێل پاڤلۆڤیچ.

هەر هێندەی کاتژمێر دە گەیشتە پترسبۆرگ، یەکسەر چوو بۆ ئەو شوێنەی کاتیا ئیشی لێ دەکرد، داوای کرد و بڕی ئەو پارەیەی دا بە دەڵاڵەکەی، لە کرێی ئەو ماوەیەی کە بۆ چوون و گەڕانەوەی کاتیا پێویست بوو بیدات. خۆشی نەیدەزانی دەیەوێت چی بکات کاتێک پاڤێل پاڤلۆڤیچی دۆزییەوە؛ ئایا دەیەوێت بیکوژێت یاخود بۆ ئەوە بەشوێنیدا دەگەڕێت، کە زۆر بەسادەیی باسی مردنی کچەکەی بۆ بکات و پێی ڕابگەیەنێت، کە بەبێ جەنابیان ناتوانرێت کچەکەی بەخاک بسپێردرێت. لە سەرەتادا سەرکەوتوو نەبوون لە دۆزینەوەی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا. بۆیان دەر کەوت دوو ڕۆژ پێشتر ماشکا بووە بە شەڕی لەگەڵ پاڤێل پاڤلۆڤیچدا، هەروەها دەغیلەچییەکە "بە ئەسکەملێک سەری پاڤێل پاڤلۆڤیچی شکاندبوو." لە ڕاستیدا گەڕانەکەیان بۆ ماوەیەکی درێژ بێسوود بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، تەنیا کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ بوو کاتێک ڤیلچانینۆڤ لە یەکێک لەو شوێنانە دەهاتە دەرەوە کە نێردرابوو بۆی، بەو هیوایەی لەوێ پاڤێل پاڤلۆڤیچ بدۆزێتەوە، دوور لە چاوەڕوانی، لە کاتی هاتنەدەرەوەدا لەو شوێنە، لووتی تەقی بە لووتی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هێندە مەست بوو، کە مرۆڤ بە بینینی لەشی دادەهێزرا، دوو ئافرەت بەرەو ئەو شوێنە چاوساغییان

دەکرد، یەکێک لەو ئافرەتانە قۆڵی گرتبوو و هاوکاریی دەکرد. پیاوێکی باڵابەرز و چوارشانەش بەشوێنیانەوە بوو، ئەو پیاوە بە هەرچیی هێزی خۆی هەبوو، دەینەڕاند و هەرچیی هەڕەشەی تۆقێنەرە، ئاڕاستەی پاڤێل پاڤلۆڤیچی دەکرد و بەو هەڕەشانە هەترەشی دەبرد، دەینەڕاند و دەیوت، "پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەکاری هێناوە و ژیانی ژەهراوی کردووە." پێدەچوو ناکۆکییەکە لەسەر بڕێک پارە بێت، ئافرەتەکان لەڕادەبەدەر ترسابوون و بەتەواوی سەریان لێ شێوابوو. هەر هێندەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ چاوی بە ڤێلچانینۆڤ کەوت، بەپەلە ڕای کرد بەرەو ڕووی و هەردوو دەستی کردەوە و بۆی درێژ کرد، بە شێوەیەک قیژاندی، یەکێ نەیزانیبا هەڵیانکوتاوەتە سەری تا بیکوژن، "بیکە بە خاتری خوا، فریام بکەوە براکەم!"

هەر هێندە کابرای سەرسەری چاوی بە جەستەی وەرزشی و پتەوی ڤێلچانینۆڤ کەوت، کەس نەیزانی چیی لێ هات، وەک ئەوەی زەوی قووتی دابێت؛ پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەستی کرد سەر کەوتووە بەسەر نەیارەکەیدا، هەر بۆیە ئاوڕی بۆ دواوە دایەوە و مشتی توند کردبوو و بەتوندی لە هەوادا ڕای دەوەشاند، هەروەها قووڵلەیەکی دوورودرێژی لە هەوادا کرد وەک نیشانەی سەرکەوتن، بەڵام لەو ساتەدا ڤێلچانینۆڤ دەستی خستە سەر شانەکانی و بەخێرایی ڕای وەشاند، بێ ئەوەی بزانێت بۆچی وای کرد، هێندە بەتوندی ڕای وەشاند، تا ددانەکانی خستە چەقەچەق. پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەستبەجێ دەستی لە قولەکێشان هەڵگرت و چاوی بڕییە ئازاردەرەکەی بە ڕوانینێکی تۆقیو و مەست و گەمژانە.

پێدەچوو ڤێلچانینۆڤ نەزانێت بۆ دواتر چی لەگەڵ ئەم کەودەنە بکات. بەڵام بە شێوەیەکی دڕندانە پاڤێل پاڤلۆڤیچی لوول کرد و لەسەر کەربستۆنی* شەقامەکە دای نیشاند.

پێی وت، "لیزا مرد!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هێشتاش چاوی لەسەر ڤێلچانینۆڤ نەدەترووکاند، بە هاوکاریی یەکێک لە ئافرەتەکان لەسەر کەربستۆنی شۆستەکە دانیشتبوو، لە کۆتاییدا تێگەیشت و ڕوخساریشی لەناکاو کرژ بوو. بە شێوەیەکی زۆر سەیر لەبەر خۆیەوە چرپاندی، "مرد..."

ڤێلچانینۆڤ نەیتوانی سەر لەوە دەر بکات، کە ئایا هاوڕێکەی بە شێوەیەکی قێزەون و سەرخۆشانە زەردەخەنە دەکات، یاخود بە هۆی هەستێکی تایبەتییەوە دەموچاوی شێواوە، بەڵام یەک خولەک دواتر، پاڤێل پاڤلۆڤیچ تەکانێکی دا و دەستی چەپی کە دەلەرزی، بەرزکردەوە تا نیشانەی خاچ بکێشێت، بەڵام نەیتوانی ئەم کارە تەواو بکات، دەستە لەرزۆکەکەی شل بوو، سەرلەنوێ کەوتەوە خوارەوە، دوای چەند ساتێکی کەم بەهێواشی لەسەر کەربستۆنەکە هەستا، خۆی دا بەسەر شانی ئافرەتەکەدا و خۆی خوار کردەوە، لاژەلاژ بە ڕێی خۆیدا کەوتە ڕۆشتن، وەک ئەوەی ئەسڵەن ڤێلچانینۆڤ هەر لەوێش نەبووبێت. بەڵام جارێکی تریش ڤێلچانینۆڤ پەری کردەوە بە شانەکانیدا و توند ڕای

---

* کەر بستۆن - :curbsto بریتییە لەو زنجیرەبەردەی بۆ قەراغی شۆستە بەکار دەهێنرێت.

وەشاندەوە و بەهەناسەبڕکێوە نەڕاندی بەسەریدا، وتی، "ئایا تۆ لەوە تێدەگەیت، هەی وڵاخی سەرخۆش، کە بەبێ جەنابت ئەو بەدبەختە تەنانەت ناتوانرێت بەخاکیش بسپێردرێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ ڕووی کردە ڤێلچانینۆڤ و بەتێکەڵوپێکەڵی پێی وت، "تۆپهاوێژەکە... ئەفسەرەکە... ئایا ئەوت بیر دێت؟"

ڤێلچانینۆڤ، کە دڵی لە خەفەتدا خەریک بوو پارچەپارچە دەبوو، شیڕاندی، "چ... چیییی!"

"ئەو باوکی ئەو بۆ تۆ! بیدۆزەرەوە، بۆ بابەتی بەخاکسپاردنەکە."

ڤێلچانینۆڤ، وەک کەسێک چۆن لە شڵەژاویدا ئاگای لە هیچ نەبێت، شیڕاندیەوە، "تۆ درۆ دەکەیت، تۆ بەس لەبەر ڕق و پیسیی دەروونی خۆت ئەوە دەڵێیت... ئەمزانی گۆبەندێکی ئاوام بۆ ساز دەکەیت."

هەر هێندەی وای وت، مستە تۆقێنەرەکەی خۆی بەرز کردەوە تا بیماڵێت بە پاڤێل پاڤلۆڤیچدا، خۆ ئەگەر لەو ساتەدا بهاتایە و ئەو مستەی بەرزی کردبۆوە بیماڵییایە بە سەری پاڤێل پاڤلۆڤیچدا، ئەوە بێ شک ڕۆحی دەر دەکرد. ئافرەتەکان لە ترسا بە هەرچیی هێزی خۆیان بوو، زریکاندیان و پاشەوپاش کشانە دواوە، بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە هیچ شێوەیەک خۆی شلوێ نەکرد. دەموچاوی لە توورەییدا تووک و نەفرەتی لێ دەباری. بە دەنگێکی زۆر سەنگین، وەک ئەوەی هەر مەستیش نەبێت، وتی، "دەزانیت، ئەو پەندە ڕوسییەمان دەزانیت...؟" ئەم پرسیارەی کرد و پاشان بە جنێودان قسەکانی بە شێوەیەک دەر بڕی، کە

نەدەزانرا بەدروستی چیی وت، "زۆر باشە، ئەم پەندەت بە دڵ بوو، کەواتە بیکە بە ئەڵقە و بیکەرە گوێت!"

پاشان بە شێوەیەکی توندوتیژانە خۆی ڕاپسکاند و خۆی لە دەستەکانی ڤێلچانینۆڤ قوتار کرد، سەرسمێکی دا و هێندەی نەمابوو بە دەما بکەوێت. ئافرەتەکان فریای کەوتن و گرتیانەوە و ئەم جارەیان تێیان تەقاند، لە کاتێکدا بەزریکەزریکەوە ڕایان دەکرد، پاڤێل پاڤلۆڤیچیشیان بەدوای خۆیاندا پەلکێش دەکرد. ڤێلچانینۆڤ شوێنیان نەکەوت.

پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، فەرمانبەرێکی میری تا ڕادەیەک هەڵکشاو لە تەمەندا، بە سەروسیمایەکی ڕێکوپێک و جلوبەرگی فەرمییەوە گەیشتە ڤێلاکەی خێزانی پۆگۆریلستێڤ و بەوپەڕی نەزاکەتەوە زەرفێکی نامەی دایە دەستی کلاڤدیا پترۆڤنا، کە ناو و ناونیشانی ئەوی لەسەر نووسرابوو لەلایەن پاڤێل پاڤلۆڤیچ تروسۆتسکییەوە ڕەوانە کرابوو. لەناو زەرفەکەدا جگە لەو بەڵگەنامە یاساییانەی بۆ مەراسیمی پرسە و بەخاکسپاردنەکە پێویست بوو، نامەیەک و بڕی سێ سەد ڕۆبڵیشی تێدا بوو. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە شێویەکی زۆر ڕێکوپێک زۆر پوخت و زۆر بەڕێزەوە نامەکەی نووسیبوو. زۆر بەگەرمی سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ کلاڤدیا پترۆڤنا دەر بڕیبوو لەبەرامبەر ئەو هەموو سۆز و بەزەییەی بەرامبەر کیژۆڵەیەکی بچووکی بێدایک پیشانی دابوو، مەگەر تەنها خودای دلۆڤان خۆی پاداشتی بەخێرییان بداتەوە، بە شێوەیەکی تەمومژاوی نووسیبووی، کە بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشییەکی زۆر خراپەوە، ناتوانێت لە مەراسیمی

بەخاکسپاردنی کچە خۆشەویست و خێرلەخۆنەدیوەکەیدا ئامادە بێت، هەموو هیوایەکی خۆی تەنها بە ڕۆحی چاکەکار و فریشتەئاسا و دڵی پڕ لە سۆزی خاتوونی بەڕێزیان هەیە. ئەو سێسەد ڕۆبڵە کە دواتر لە بەشێکی تری نامەکەیدا ئاماژەی پێ دابوو، بەشێکی بۆ تێچوونی مەراسیمی پرسە و بەخاکسپاردنەکەیە، بەشەکەی تریشی بۆ ئەو تێچوونانەیە، کە بە هۆی نەخۆشکەوتنی منداڵەکەوە خەرج کراوە. ئەگەر هات و هەرچییەک لەو بڕەپارەیە مایەوە، تکای لێ کردبوون بەوپەڕی ڕێز و شکۆوە، کە بیکەن بە خێر بۆ "ڕۆحی پاک و هەمیشەیی لیزای کۆچکردوو، تا ڕۆحی بۆ هەمیشە ئاسوودە ببێت." فەرمانبەرەکەی نامەکەی هێنابوو، هیچ شتێکی تری نەخستە سەر ڕوونکردنەوەکە؛ لە قسەکانیشییەوە وا دەر دەکەوت، کە بە خواستی خۆی ئامادە نەبووە ئەم نامەیە بهێنێت بۆ خاتوونی پایەبەرزیان، بەڵکوو بە زۆر و تکاو پاڕانەوەی زۆری پاڤێل پاڤلۆڤیچ هێناویەتی. پۆگۆریلستێڤ بەتەواوی ئیمانی لە کەللەدا نەما کاتێک گوێبیستی دەستەواژەی "بۆ ئەو تێچوونانەی بە هۆی نەخۆشکەوتنی منداڵەکەوە خەرج کراوە،" دوای ئەوەی بڕی پەنجا ڕۆبڵی خستە لاوە بۆ مەراسیمی بەخاکسپاردنەکە، چونکە بەپێی نەریت، نەدەکرا ڕێ لە باوکێک بگیرێت خۆی تێچوونی مەراسیمی بەخاکسپاردنی منداڵەکەی لە ئەستۆ نەگرێت، پێشنیاری کرد ئەو بڕی دووسەد و پەنجا ڕۆبڵەی ماوەتەوە، دەستبەجێ بنێردرێتەوە بۆ جەنابی تروسۆتسکی. دواجار کلاڤدیا پترۆڤنا بڕیاری ئەوەی دا، کە ئەو بڕی

دوو سەد و پەنجا ڕۆبڵە نەگێڕێتەوە، بەڵکوو ئەو بڕە بدات بە کەنیسە، تاکوو بۆ بەرزڕاگرتنی ڕۆحە پاک و بێگەردەکەی ئێلیزاڤێتای پاک داوێن بکرێت بە خێر، پسوولەیەکیش لە کەنیسە وەر بگیرێت و ئەو بڕەی تێدا تۆمار بکرێت و بنێردرێت بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ، بۆ ئەوەی بزانێت پارەکەی چیی لێ کراوە. دواتر ئەم پسوولەیە درا بە ڤێلچانینۆڤ، تاکوو بیگەیەنێتە دەستی پاڤێل پاڤلۆڤیچ. ڤێلچانینۆڤ پۆستی کرد بۆ شوێنی نیشتەجێبوونەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ. دوای مەراسیمی بەخاکسپاردنەکە، ڤێلچانینۆڤ ڤێللاکەی بەجێ هێشت. بۆ ماوەی دوو دانە حەوتووی ڕێک لەناو شارۆچکەکەدا بێ ئامانج و بەتەنیا، سەرلێشێواوانە دەسووڕایەوە. بە شێوەیەک لەناو بیرکردنەوەکانیدا ون ببوو، کە زۆر جار لەناو شەقامەکاندا دەڕۆیشت، ساتمەی دەدا و خۆی دەکێشا بە ڕێبواراندا. هەندێک جاری تریش لە ماڵەوە تەواوی ڕۆژەکەی بەڕاکشاوی لەسەر چەرپاکەی بەسەر دەبرد، تەنانەت هێندە بێئاگا دەبوو لە خۆی، ئەرکە بنەڕەتییەکانی ڕۆژانەی خۆشی لەبیر دەچووەوە.

چەندین جار خێزانی پۆگۆریلستێڤ داوایان لێ کردبوو سەردانیان بکات، بەڵێنی پێ دەدان بچێت بۆ لایان، بەڵام هەر زوو لەبیری دەچووەوە. تەنانەت ڕۆژێکیان کلاڤدیا پترۆڤنا خۆی هات تا بیبینێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ماڵ نەبوو، نەیتوانی چاوی پێی بکەوێت. هەمان شتیش بەسەر پارێزەرەکەیدا هات، ئەویش سەردانی ماڵەکەی کردبوو، لەوێ نەبووبوو، لە ڕاستیدا پارێزەرەکەی دەیویست شتێکی

گرنگی پێ بڵێت، پارێزەرەکەی توانیبووی بە لێهاتووییی خۆی هەنگاوێکی زۆر باش لە بابەتی دۆسیەکەیدا بباتە پێشەوە، وای کردبوو نەیارەکەی ڤێلچانینۆڤ قایل ببێت بەوەی لەگەڵ ڤێلچانینۆڤدا بگاتە ڕێکەوتن، قاییل ببێت بە بەشێکی زۆر کەم لەو بەشە میراتەی ماوەیەکی زۆر بوو مشتومڕیان بوو لەسەری. هەموو ئەمانە تەنیا لەسەر بڕیاری کۆتاییی ڤێلچانینۆڤ وەستابۆوە.

دواجار، کاتێک لەماڵەوە چاوی پێی کەوتبوو، پارێزەرەکە سەری لە خاوەن دۆسیەکەی سووڕ ما، ئەو کەسەی هێندەی پەلە بوو دۆسیەکەی بەلایەکدا بکەوێت، کەچی ئێستا زۆر بەخوێنساردییەوە، زۆر بەبێبایەخییەوە گوێی لە ڕوونکردنەوەکانی دەگرێت، هەر لە ڤێلچانینۆڤەکەی جارانی نەدەکرد.

گەرمترین ڕۆژەکانی مانگی حەوت هاتبوون، بەڵام ڤێلچانینۆڤ بەتەواوی بێئاگا بوو لە تێپەڕبوونی کات. پەژارەکەی هاوشێوەی دوومەڵێکی پڕ لە کێم لەسەر دڵی ئازاری دەدا. بەئاشکرا خەریک بوو بەتەواوی هۆشمەندیی خۆی لەدەست دەدا، ئازار چەشتنەکەشی هێندە بەسوێ بوو، کە وەک مۆتەکەیەک وا بوو، یەک ساتیش چییە لە کۆڵی نەدەبۆوە. بەتایبەت ئەو کاتانە زۆر ئازاری دەچەشت، کە بیری لەوە دەکردەوە، پێش ئەوەی لیزا دەرفەتی ئەوەی هەبێت ئەم بناسێت، گیانی سپاردبوو، پێش ئەوەی لەوە تێبگات ئەم چەند بە شێوەیەکی خەمناک خۆشی ویستووە! ئەو ئامانجەی لەناکاو هاتە ژیانیەوە و ژیانی ڕۆشن کردبۆوە و پڕی

کردبوو لە خۆشی و شادی، هەر لەناکاویش ترووسکاییی ئەم ئامانجە لەناو تاریکیی هەتاهەتاییدا خامۆش بوو.

ئەو ئامانجەی هەنووکە سات نەبوو بیری لێ نەکاتەوە – ئەوە بوو لیزا، هەموو ڕۆژێک و هەموو ساتێک و هەموو ژیانی هەست بەو خۆشەویستییە بێسنوورەی بکات، کە ئەم بۆی دەیبوو. هەندێک جار لەبەر خۆیەوە بە جۆشوخرۆشێکی لێڵەوە بیری دەکردەوە و لە دڵی خۆیدا دەیوت، "هیچ کەسێک ئامانجی لەمە مەزنتری نییە لە ژیاندا، ئەسڵەن هەر ڕێشی تێ ناچێت ئامانجی لەمە مەزنتری هەبێت، ئەگەر ئامانجگەلێکی تریش بوونی هەبێت، هیچیان بە هێندەی ئەم ئامانجە پیرۆز نییە!" بە خۆی دەوت، "بە خۆشەویستیم بۆ لیزا، لە تەواوی بەدڕەفتارییەکان و ژیانە پووچەکەی ڕابردووم پاک دەبوومەوە و بە هۆی ئازارچەشتنەوە لە گوناهەکانم پاک دەبوومەوە، دەمتوانی قەرەبووی ئەو ژیانە پووچ و بەفیڕۆچووەم بە خۆشەویستیم بۆ ئەو بوونەوەرە نازدار و وردیلەیە بکەمەوە، هەر لەبەر خاتری ئەو، هەمووان لێم خۆش دەبوون و ئەوکات خۆشم دەمتوانی لە خۆم خۆش ببم." تەواوی ئەو بیرۆکە و پەیپێبردنانەی هەمیشە بە هورووژم شاڵاویان بۆ مێشکی دەهێنا، هەمووی پەیوەندیی بە بیرکردنەوە بەردەوامەکانی بوو سەبارەت بەو بیرەوەرییە کەمانەی لەو منداڵە مردووە هەیبوو، ئەم بیرەوەرییانە گەلێک ڕوون بوون، بەردەوام بە مێشکیدا دەهات و دەچوو، ڕوخسارە گچکە و زەرد هەڵگەڕاوەکەی دەهێنایەوە پێشچاوی خۆی، تەواوی ئەو دەربڕینانەی لەسەر ڕوخساری بینیبووی، بیری

دەکەوتـەوە، بیـری لـێ دەکـردەوە کاتێـک لەنـاو تابووتەکەدایـە و نـاو تابووتەکـەش بـە گـوڵ ڕازێنراوەتـەوە، یـان ئـەو سـاتەی بیـر دەکەوتـەوە، کـە بێهـۆش بـە هـۆی تـاوە لەنـاو جێگەکەیـدا ڕاکشـابوو، بێئـاگا لـە دنیـا، چاوەکانـی زەق کردبوونـەوە. کتوپڕ بیری ئـەوەی کەوتبۆوە، کاتێک لیزایان لەسـەر مێزەکە دانابوو لـەو ماوەیـەی تێیـدا نەخـۆش بـوو، یەکێـک لـە پەنجەکانـی، کـە نەدەزانـرا بۆچـی سـەرنجی دابـوو، ڕەش بۆتـەوە، لـەو کاتـەدا ئەمـە زۆر زۆر کاری تـێ کـرد، دڵـی زۆر بـە حاڵـی ئـەو پەنجـە گچکـە داماوە سـووتا، لـەو کاتـەدا بـوو کـە بۆ یەکـەم جـار بیری لـەوە کـردەوە، کـە بـڕوات بەشـوێن پاڤێـل پاڤلۆڤیچـدا بگەڕێـت و دەسـتبەجێ بیکوژێـت، تـا ئـەو سـاتەش گەلێـک بێبـاک بـوو.

ئایـا زامـی لەژێرپێنانـی غـروری، ببـووە هـۆکاری ئـەوەی دڵـە گچکەکـەی ئەشـکەنجە بـدات و برینـداری بـکات، یاخـود ئـەو زامانـە تێکـی شـکاندبێت، کـە لـە مـاوەی ئـەو سـێ مانگـەدا بەدەسـت باوکـە نارەسـەنەکەیەوە چەشـتبووی، ئـەو باوکـەی خۆشەویسـتییەکەی لەنـاکاو دەگۆڕێـت بـۆ ڕقلێبوونـەوە و تووڕەیـی، ئـەو باوکـەی بـە واژەگەلێکـی ئابڕووبـەر هەسـتی برینـدار کردبـوو، بـە تۆقینەکانـی ئـەو بەسـتەزمانە پێکەنیبـوو، قاقـای لێدابـوو، دواجاریـش دەسـتبەرداری دەبێـت و دەیداتـە دەسـتی کۆمەڵێـک خەڵکـی بێگانـە؟

هەمـوو ئـەم بیرکردنەوانـە بـۆ یـەک سـاتیش چییـە لە مێشـکی ڤێلچانینـۆڤ دوور نەدەکەوتـەوە، هەمـوو ئـەو بیرکردنەوانـەی بـە هـەزاران شـێوە سـەرومڕ دەکـرد. لەناکاو ئـەو هاوارکردنـەی تروسـۆتسکی بەدەمەسـتی بیر کەوتەوە، "دەزانی لیزا بۆ من چی

دەگەیەنێت؟" وا هەستی کرد ئەم هاوارکردنە هاوارکردنێکی ڕاستگۆیانە بووە، بۆ خۆدەرخستن نەبووە، بەڵکوو لەناو ئەو هاوارکردنەدا، خۆشەویستییەک بوونی هەبووە. "چۆن ئەو دڕندەیە دڵی هاتووە بەو شێوە دڕندانەیە ئازاری منداڵێکی ئاوا بێدەسەڵات بدات، لە کاتێکدا ئا بەو شێوەیەش خۆشی ویستووە؟ ئایا ئەمە ڕێی تێ دەچێت؟" بەڵام هەموو جارێک کە ئەم پرسیارەی لە خۆی دەکرد، پەلەی ئەوەی دەکرد خێرا ئەم پرسیارە لە مێشکی خۆی دەر بکات و بایەخی پێ نەدات، وەک ئەوەی شتێکی تۆقێنەر خۆی لەناو ئەو پرسیارەدا حەشار دابێت، شتێک کە ئەو نەتوانێت بەرگەی بگرێت و نەتوانێت چارەسەری بکات.

ڕۆژێک، کە بەئەستەمیش چییە هۆشی لای خۆی نەبوو کە بەرەو کوێوە هەنگاو دەنێت، لە ڕێگە لەو گۆڕستانە لای دا، کە لیزای تێدا نێژرابوو و توانیی گۆڕە گچکەکەی بدۆزێتەوە. لەدوای کۆتاییهاتنی مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەیەوە، سەردانی گۆڕستانی نەکردبۆوە؛ هەمیشە وا بیری دەکردەوە، کە ئەگەر سەردانی گۆڕەکەی بکات، ئەوە تووشی پەژارەیەکی گەورە دەبێت، هەر لەبەر ئەوە دەترسا کە سەردانی گۆڕەکەی بکات.

بەڵام پێدەچێت کەمێک سەیر بێت ئەگەر بووترێت، کاتێک چووە سەر گۆڕە بچکۆلانەکەی، کێلی گۆڕەکەی ماچ کرد و سووکناییش بە دڵیدا هات. ئێوارەیەکی زۆر دڵگیر بوو، خۆر لە ئاوابووندا بوو، چواردەوری گۆڕەکان بە سەوزەگیایەکی تەڕوبڕ ڕازابۆیەوە، هەنگەکان لەو نزیکانەدا لەسەر گوڵە

کێویلەکان ویزەویزیان دەکرد، ئەو گوڵانە و تاجەگوڵینانەی منداڵەکانی کلاڤدیا پترۆڤنا لەسەر گۆڕەکەی لیزا بەجێیان هێشتبوو، هێشتا لە شوێنی خۆی مابۆوە و پەڕەی نیوەی هەڵوەریبوو.

دوای چەندین ڕۆژ، سەرلەنوێ ڤێلچانینۆڤ هەستی دەکرد وا جارێکی تر ترووسکەی هیوا وردەوردە خەریکە دڵ و دەروونی ڕۆشن دەکاتەوە. خامۆشیی ناو گۆڕستانەکە تەواو کاری تێ کردبوو و لە کاتێکدا سەری بەرز کردبۆوە و لە ئاسمانی پاک و بێگەردی دەڕوانی، بەهێمنی وتی، "چ پاک و بێگەردییەک!"

ئیمانێکی پاک و بێگەرد بەهێمنی هەموو ڕۆحی دەتەنییەوە. لەبەر خۆیەوە دەیوت، "ئەم ئارامییە لیزا بۆی ناردم، ئەوە ڕۆحی لیزایە لەگەڵما دەدوێت."

کاتێک گۆڕستانەکەی بەجێ هێشت و بەرەو ماڵ بووەوە، دنیا بەتەواوی تاریک داهاتبوو. لەقەراغ شەقامەکە، کە چەندان دوور نەبوو لە دەروازەی گۆڕستانەکە، بەلای کوختێکی گچکەی لەتەختەدروستکراودا گوزەری کرد، کە شێوەی کوختەکە لە میوانخانەیەکی گچکە یاخود لە خانێکی دەکرد؛ لە پەنجەرەکانەوە چاوی بە کەسانێک کەوت، کە لە چواردەوری مێزێک خڕ بوونەتەوە. کتوپڕ وا هەستی کرد یەکێک لەو کەسانەی نزیک بە پەنجەرەکە دانیشتووە، پاڤێل پاڤلۆڤیچە، بە هەمان شێوە ئەویش ئەمی بینیبوو و کونجکاوانە چاوی تێ بڕیبوو. ڤێلچانینۆڤ بەردەوامیی دا بە ڕێڕۆشتنەکەی، بەڵام هەر زوو گوێی لە تەپەی پێی یەکێک

بوو، کە بەشوێنیەوە بوو، لە ڕاستیدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ بوو بەشوێنیدا ڕای دەکرد، پێدەچوو ئەو دڵنیایی و هێمنییەی لە پەنجەرەکەوە لە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤدا خوێندبوویەوە، بە شێوەیەک سەرنجی ڕاکێشابێت، زاتی ئەوە بکات خۆی لە ڤێلچانینۆڤ نزیک بکاتەوە. کاتێک پێی گەیشتەوە، بە ترس و لەرزەوە زەردەخەنەیەکی بۆ ڤێلچانینۆڤ کرد، بەڵام زەردەخەنەکەی ئەم جارەی وەک ئەو زەردەخەنەیەی جارانی نەبوو، کە فێر بوو بەسەرخۆشی دەیکرد، ئەم جارە هەر بەڕاستی سەرخۆش نەبوو.

وتی، "ئێوارەت باش!"

ڤێلچانینۆڤ وەڵامی دایەوە، "ئێوارەت باش!"

# ١١

# پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەیەوێت ژن بهێنێت

هەر هێندەی بە "ئێوارە باش" وەڵامی پاڤێل پاڤلۆڤیچی دایەوە، زۆر سەری لە خۆی سوور ما. تووشی پەشۆکان بوو، زۆر بەلایەوە شتێکی سەیر بوو، کە هەنووکە چاوی بەم کەسە کەوتووە، بێ ئەوەی تۆزقاڵێکیش چییە هەست بە تووڕەیی بکات بەرامبەری، بە پێچەوانەوە، لەو ساتەدا بەرامبەر بە ئەو هەستی بە شتێکی تەواو جیاواز دەکرد، لە ڕاستیدا، جۆرە هەستێکی نوێ لە ناوەوەیدا سەری هەڵدەدا.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە چاوی بڕیبووە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤ، بە دەنگێکی هێمنەوە وتی، "چەند ئێوارەیەکی دڵگیرە."

"هێشتا ئێرەت بەجێ نەهێشتووە."

ڤێلچانینۆڤ وای وت و بەردەوام بوو لە ڕۆیشتنەکەی، ئەسڵەن وەک ئەوەی هەر پرسیاریشی نەکردبێت، بەڵکوو زۆر بەسادەیی، تەنها وەک ئەوە وا بوو کە بە دەنگی بەرز بیر بکاتەوە.

"ڕاستە شتەکان کەمێک درێژەیان کێشا، بەڵام ئەو

پۆستەی خۆم ئەمویست، دواجار لەگەڵ بەرزکردنەوەی مووچەکەم بەدەستم هێنا. بە دڵنیاییەوە سبەی نا دوو سبەی ئێرە بەجێ دەهێڵم."

ئەم جارەیان ڤێلچانینۆڤ پرسیاری کرد، "واتە ئەو پۆستەی کە ویستت، بەدەستت هێنا؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەمێک دەموچاوی دا بەیەکدا و وتی، "بۆ؟ نابێت؟"

"ئۆی، من تەنها پرسیارم کرد..."

ڤێلچانینۆڤ وای وت و دەستی لە پلارگرتن هەڵگرت، بە تیلەی چاو بە شێوەیەک کە دەموچاوی دابوو بەیەکدا، نارەزایانە و بەگومانەوە تەماشایەکی پاڤێل پاڤلۆڤیچی کرد. بەتەواوی تووشی سەرسووڕمان بوو، کاتێک جلوبەرگەکەی جەنابی ترۆسۆتسکی بینی و کڵاوەکەی، کە شریتە ڕەشەکەی پێوە کردبوو، هەروەها سیمای بە شێوەیەکی گشتی زۆر ماقوڵتر لە دوو هەفتەی پێشووتر دەر دەکەوت.

لە دڵی خۆیدا بەسەرسامییەوە لە خۆی پرسی، "ئەبێت بۆچی لەو بارە بچکۆلەیە لای دابێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەرلەنوێ کەوتەوە ئاخاوتن، وتی، "نیازم وایە، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، سەبارەت بە بابەتێک قسەت لەگەڵ بکەم، بابەتێکی دڵخۆشکەر."

"دڵخۆشکەر؟"

"بەتەمام ژن بهێنم."

"چی؟"

"لەدوای پەژارە، کامەرانی دێت، ژیان هەمیشە هەر بەم شێوەیە بووە؛ ئەبێت گەلێک شادمان بم، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ،

ئەگەر... بەڵام، نازانم، ڕەنگە ئێستا تۆ کەمێک پەلەت بێت، وا دێیتە بەرچاو کە..."

"بەڵێ، من پەلەمە... تەندروستیشم زۆر باش نییە."

کتوپڕ مەیلێکی هێندە بەهێزی تێ گەڕا، تا هەرچی زووترە خۆی لەدەست پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەرباز بکات. ئەو هەستە نوێیەی کەمێک لەمەوبەر بەرامبەری بۆی دروست ببوو، لەپڕ وەک برووسکەیەک لەناو چوو.

"زۆرم پێ خۆش دەبوو کە..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، ئەو شتەی ئارەزووی دەربڕینی دەکرد، تەواوی نەکرد، ڤێلچانینۆڤیش هەر بەبێدەنگی مابووەوە."

"کەواتە ئەگەر جارێکی تر چاومان بە یەکتر کەوتەوە، لەسەر ئەم بابەتە قسە دەکەینەوە..."

ڤێلچانینۆڤ بەبێ وەستان و بەبێ ئەوەی تەماشای بکات، بەخێرایی منجاندی، "بەڵێ، بەڵێ، ئەگەر جارێکی تر چاومان بە یەکتر کەوتەوە."

بۆ ساتێک هەردووکیان سەرلەنوێ لەناو بێدەنگیدا ڕۆ چوونەوە؛ پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەر بەتەنیشتیەوە لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو. دواجار پاڤێل پاڤلۆڤیچ پەتی بێدەنگیی پساند و وتی، "کەواتە ئێستا خودات لەگەڵ، تا ئەو کاتەی سەرلەنوێ یەکتر دەبینینەوە."

"خودات لەگەڵ، هیوادارم کە..."

ڤێلچانینۆڤ گەڕایەوە بۆماڵەوە، لەڕادەبەدەر جاڕزییەکەی بۆ جارێکی تر سەری هەڵدایەوە. پەیوەندیکردنەوە "بەو پیاوە،" لەڕاستیدا شتێکی زۆر تاقەتپڕووکێن بوو بۆی. هەر هێندەی خزایە ناو جێگەکەیەوە، سەرلەنوێ ئەم پرسیارەی

لە خۆی کردەوە، "ئەبێت بۆچی لای گۆڕستانەکەوە بووبێت؟"

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، بیروهۆشی خۆی کۆ کردەوە کە بچێت بۆ لای خێزانی پۆگۆریلستیڤ. هەرچەندە بڕیاری ئەوەشی دابوو بچێت، بەڵام دوودڵ بوو، بینینی ئەوەی کەسێک بەزەییی پێدا بێتەوە، ئێستا گەلێک پەستی دەکرد، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسانە خێزانەکەی پۆگۆریلستیڤیش بوونایە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان گەلێک نیگەرانی ئەم بوون، هەستی کرد بەتەواوی ناچارە سەردانیان بکات. کتوپڕ ئەوەی هات بە خەیاڵدا، کە بە شێوەیەکی زۆر خراپ هەست بە تەریقبوونەوە دەکات، کە سەرلەنوێ، دوای ئەو ماوەیە بۆ یەکەم جار چاوی پێیان بکەوێتەوە.

لە دڵی خۆیدا هەر دەیوت، "بڕۆم... نەڕۆم..." لە کاتێکدا پەلەی ئەوەی بوو ناشتاییەکەی تەواو بکات، چاوی بە پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەوت، کە خۆی کرد بە ژوورەوەدا، کاتێک ئەمەی بینی، بەتەواوی حەپەسا.

سەرەڕای ئەو چاوپێکەوتنەی ڕۆژی پێشتر، ڤێلچانینۆڤ هەرگیز بە خەیاڵیشیدا نەدەهات ئەو پیاوە جارێکی تر بێتەوە و چاوی پێی بکەوێتەوە، بە شێوەیەک حەپەسابوو، کە زەق زەق چاوی تێ بڕیبوو نەیدەزانی چیی پێ بڵێت. بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەبێ ئەوەی خۆی شلوێ بکات، بۆ هاوسەنگکردنی دۆخەکە، سڵاوی لە ڤێلچانینۆڤ کرد و ڕۆیشت لەسەر هەمان ئەو کورسییە دانیشتەوە، کە لە یەکەم سەردانکردنیدا لەسەری دانیشتبوو. کتوپڕ ڤێلچانینۆڤ، زۆر بەڕوونی، تەواوی یادەوەرییەکانی کە لەو سەردانەی یەکەمدا ڕووی دابوو بیری هاتەوە، بە جۆرێک لە ڕق و بێزارییەوە چاوی بڕییە سەردانکەرەکەی.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە هەستی ڤێلچانینۆڤی خوێندبۆوە، دەستی بە قسەکردن کرد، "ها، چییە، سەرت سووڕ ماوە؟"

وا دەر دەکەوت زۆر لە ڕۆژی پێشتر، بە شێوەیەکی گشتی، زیاتر هەست بە ئاسوودەیی و ئارامی بکات، لەبریی ئەوەی ئەو شەرم لە تۆ بکات، بە پێچەوانەوە، کاتێک لێت بڕوانیبا، تۆ هەستت بە شەرم دەکرد. ڕواڵەتی گەلێک سەیر بوو. جلەکانی جەنابی تروسۆتسکی نەک هەر گونجاو بوو، بەڵکوو زۆر شیکیش بوو. چاکەتێکی تەنکی هاوینە لەگەڵ پانتۆڵێکی تەسکی ڕەنگدار و هێلەکێکی تەنکیشی لەبەر کردبوو، هەروەها جووتێک دەستکێشیشی لەدەست کردبوو و چاویلکەیەکی یەکچاوی ئاڵتوونییشی خستبووە سەر یەک چاوی. کەس نەیدەزانی بۆچی ئاوا کتوپڕ ئەم گۆڕانکارییانەی بەسەر خۆیدا هێناوە، بەڕاستی جلوبەرگەکەی بە هیچ شێوەیەک جێگەی ڕەخنە نەبوو، تەنانەت بۆنیشی لە خۆی دابوو، لە سەروسیمایدا بەتەواوی شتێکی پێکەنیناوی بەدی دەکرا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە شێوەیەکی نامۆ و بە شێوەیەکی جاڕزکەر شتێکی سەیریشی تێدا دەخوێندرایەوە.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، لە کاتێکدا لەشی خۆی دەجوولاندەوە، وتی، "بەدڵنیاییەوە، ئەلیکسی ئیڤانۆڤیچ، هاتنم بۆ ئێرە تووشی سەرسووڕمانی کردوویت، ئەتوانم هەست بەوە بکەم. بەڵام هەمیشە وا خەیاڵ دەکەم کە دەبێت بەردەوام لەنێوان خەڵکیدا شتێکی بەرزتر بوونی هەبێت، کە بە بڕوای من ئەو شتە بەرزترە لە هەموو شتێکی تر، تۆش هەر وا بیر ناکەیتەوە؟ بەرزتر مەبەستم لەوەیە، شتێک لەسەروو هەموو بارودۆخەکان و تەنانەت هەموو ئەو ناخۆشییانەشی

کە ڕەنگە بێت و پاشان تێپەڕ ببێت... تۆش پێت وا نییە؟"

ڤێلچانینۆڤ، کە برۆکانی هێنابوونەوە یەک، وتی، "گوێ بگرە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، چیت هەیە خێرا بەبێ پێچوپەنا بیڵێ."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەخێرایی کەوتەوە قسەکردن، "زۆر باشە، زۆر بەکورتی، ئەوەی دەمەوێت پێت بڵێم، ئەوەیە کە من ژن دەهێنم و هەر ئێستاش دەچم بۆ لای ژنی داهاتووم، تا چاوم پێی بکەوێت. ئەوانیش بە هەمان شێوە لە ڤێللایەکی هاوینەدا دەژین. زۆرم پێ خۆش دەبێت و شەرەفێکی گەورەم پێ دەبەخشیت، ئەگەر هاوەڵیم بکەیت و تا لە نزیکیشەوە بە خێزانەکەیانت بناسێنم، بۆیە هاتووم بۆ ئێرە، تا بەوپەڕی ڕێزەوە،" پاڤێل پاڤلۆڤیچ کە وای وت، سەری زۆر بەنەزاکەتەوە بۆ ڤێلچانینۆڤ نەوی کرد، "داواتان لێ بکەم هاوەڵیم بکەن بۆ..."

ڤێلچانینۆڤ زەق زەق لە پاڤێل پاڤلۆڤیچی دەڕوانی، پاشان وتی، "هاوەڵیت بکەم بۆ کوێ؟"

"بۆ لای ئەوان، بۆ ئەو ڤێللایەی تێیدا نیشتەجێن. دەبێت بمبەخشن وا قسە دەکەم، ئەڵێی تام لێ هاتووە، هەر بۆیە ڕەنگە زۆر بەباشی نەمتوانیبێت بەڕوونی ئەوەی مەبەستمە بیگەیەنم، بەڵام زۆر لەوە دەترسم، کە داواکەم ڕەت بکەیتەوە."

وای وت و بە چاوێکی پڕ لە پاڕانەوەوە لە ڤێلچانینۆڤی ڕوانی.

ڤێلچانینۆڤ لە کاتێکدا بە وردی و سەرپێی لە پاڤێل پاڤلۆڤیچی دەڕوانی، نەیدەتوانی بەئاسانی باوەڕ بە چاو و گوێی خۆی بکات، دووبارەی کردەوە، " ئێستا دەتەوێت

لەگەڵ جەنابت بێم بۆ ئەوەی ژنی داهاتووت ببینم؟“

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە زۆر تەریق بووەوە، وتی، ”بەڵێ، بەڵام توورە مەبە، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ. ئەمە هیچ بێئابڕووییەکی تێدا نییە، من بەوپەڕی ڕێز و شکۆوە داوای ئەم چاکە مەزنەم لە ئێوە کردووە. وا خەیاڵم کردبوو کە ڕەنگە تۆ دەست نەنێیت بە ڕوومەوە و داواکەم ڕەت نەکەیتەوە...“

ڤێلچانینۆڤ، کە جامی توورەیی لێوڕێژ ببوو، وتی، ”ئەمە بەتەواوی مەحاڵە، هەر بیریشی لێ مەکەرەوە!“

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەردەوام بوو لە پاڕانەوەکەی، ”ئەم داوایە، جگە لە داوایەکی برایانە چیی دی نییە، لێت ناشارمەوە کە لەم کارەدا هۆکاری تایبەت بە خۆمم هەیە، بەڵام جارێ پێم باشە پەردەی لەسەر هەڵنەماڵم هەتا دواتر، بەڵام ئێستا، بە پێداگریی و زۆر بەسادەیی، داواکاریی ئەوەم هەیە...“

تەنانەت پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە شوێنی خۆی هەستا و نەزاکەتێکی زۆری لەبەرامبەر ڤێلچانینۆڤدا نیشان دا. ڤێلچانینۆڤیش بە هەمان شێوە لە شوێنی خۆی بەرز بۆوە، وتی، ”بەڵام هەرچۆنێک بێت، ئەمە بەتەواوی مەحاڵە. پێویستە تۆش ئەمەت پەسەند بێت...“

”بەڵام ئەمە بەتەواوی مەحاڵ نییە، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ. من بەنیاز بووم تۆ وەک هاوڕێیەک بەوان بناسێنم، بەدەر لەوەش، خودی خۆت پێشتر جۆرێک لە ناسیاویت لەگەڵیاندا هەیە، دەزانیت ئەوەی دەمەوێت بتبەم بۆ خزمەتیان، بۆ ڤێلاکەیان خێزانی زاخلیبینینە، ڕاوێژکارە شارستانییەکە، زاخلیبینین.“

ڤێلچانینۆڤ لە سەرسامیدا هاواری کرد، ”وتت چی؟“

زاخلیبینین هەمان ئەو ڕاوێژکارە شارستانییە بوو، کە ڤێلچانینۆڤ مانگێک لەمەوپێش بەشوێنیدا وێڵ بوو، هەرگیزیش نەیتوانیبوو لە ماڵەکەی خۆیدا چاوی پێی بکەوێت. دواتر بۆی دەر کەوتبوو، کە ئەم زاتە لە سوودی نەیارەکەی لە بابەتی میراتەکەدا قسەی کردووە.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە خۆشیدا زەردەخەنەی دەکرد، پێدەچوو سەرسووڕمانە لەڕادەبەدەرەکەی ڤێلچانینۆڤ بە شێوەیەکی باش دنەی دابێت. بۆیە خێرا وتی، "بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ، خۆیەتی، ئەو پیاوەیە، بیرت دێت؟ ڕۆژێکیان هەردووکتان بەتەنیشت یەکەوە بەڕێدا دەڕۆیشتن، بەیەکەوە گفتوگۆتان دەکرد، لە کاتێکدا من لەوبەرتانەوە وەستابووم و تەماشام دەکردن، ئەمویست دوای ئەوەی تۆ لە قسەکردن لەگەڵیدا تەواو دەبیت، منیش بچمە خزمەتیان. بیست ساڵ لەمەوپێش هەردووکمان لە یەک ئۆفیسدا کارمان دەکرد، بەڵام ئەو کاتەی نیازم بوو بچمە خزمەتیان، دوای ئەوەی تۆ تەواو دەبوویت، هەر بەڕاستی لەو کاتەدا هیچ جۆرە بیرۆکەیەک لە مێشکمدا نەبوو. ئەم بیرۆکەیەش تەنها یەک هەفتە بەر لە ئێستا و زۆر لەناکاو خزایە ناو مێشکمەوە."

ڤێلچانینۆڤ بە واقوڕمانێکی ساویلکانەوە وتی، "بەڵام لەو بڕوایەدا نیم ئەو خێزانە خێزانێکی تەواو شیاو بێت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، هەر بۆ سوعبەت کەمێک دەموچاوی خۆی گرژ کرد و وتی، "باشە، بەڵام ئەی ئەگەر شیاو بوون چی؟"

"نا، نا، بەدڵنیاییەوە مەبەستم لەوە نەبوو... بەڵام کاتێک سەردانی ماڵەکەیانم کربوو، من بەو شێوەیە تێبینیم کردبوو..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ خێرا قسەکانی پێ بڕی و سەرشار لە شادی وتی، "ئەوان لەبیریانە، سەردانەکەی تۆیان لەبیرە. بەڵام تۆ ئەو ڕۆژە نەتتوانیبوو خێزانەکەیان ببینیت، بەڵام زاخلیبینین تۆی لەبیر بوو و زۆر بەڕێزەوە باسی دەکردیت، هەموومان زۆر بەڕێزەوە لە تۆ دەدواین."

"بەڵام خۆ هەمووی سێ مانگێک نابێت تۆ بوویت بە بێوەپیاو؟"

"بەڵام هەر وەک دەزانن، ئاهەنگی گواستنەوەکە یەکسەر ڕوو نادات، گواستنەوەکە بۆ نۆ یان دە مانگی تر دەبێت، بەم شێوەیە یەک ساڵی ماتەمینییەکەش کۆتایی پێ دێت. دڵنیات دەکەمەوە، کە هەموو شتێک باش دەبێت. یەکەمەن فیدۆسی پیترۆڤیچ هەر لە منداڵییەوە دەمناسێت، خێزانە کۆچکردووەکەشمی دەناسی، ئاگاداری شێوازی ژیانکردنیشم بووە، دەشزانێت پلەوپایەی کۆمەڵایەتیم لەناو خەڵکیدا چۆنە، سەرباری هەموو ئەمانەش، من سەروەت و سامانێکی تایبەت بە خۆمم هەیە، هەروەها بەم زووانەش لەسەر پۆستە نوێیەکەم بە مووچەیەکی بەرزەوە دەستبەکار دەبم - ئێ وەک خۆشت دەزانیت، ئەمانە کۆمەڵێک تایبەتمەندیی گرنگن، کە ناکرێت لە بەرچاو نەگیرێن."

"واتە ئەوەی داخوازی دەکەیت، کچیەتی؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەمەرایيکردنەوە تەکانێکی بە خۆیدا و وتی، "هەموو شتێکت سەبارەت بەم مەسەلەیە بەوردی بۆ باس دەکەم. بەڵام سەرەتا ڕێم بدەن با جگەرەیەک دابگیرسێنم. بە هەمان شێوە ئەمڕۆ خۆشت کچەکە دەبینیت. سەرەتا با لەوەوە دەست پێ بکەم، کە پیاوانی

بەهەژمموونی هاوشێوەی فیدۆسی پیترۆڤیچ، ئەگەر لێی بزانن چۆن سەرنجی چواردەوریان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، ئەوە هەندێک جار زۆر بەباشی دەتوانن ببن بە خاوەنی ناو و ناوبانگێکی باش بۆ خۆیان لە پترسبۆرگدا. بەڵام دەزانیت، ئەو جگە لە مووچەکەی و زیادەی مووچەکەی و بەخششی ساڵانە، هەروەها بەرزبوونەوەی مووچەکەی و هەندێک دەرماڵەی نیشتەجێبوون، لەگەڵ ئەو پاداشتانەی بە هۆی جەژن و بۆنەکانی ترەوە پێی دەدرێت، هیچی دیکەیان نیە - واتە هیچ دەرامەتێکی وەهای نییە، کە پێی بوترێت سەرمایە. هەرچۆنێک بێت، ئەوان بەم شێوەیەش تا ڕادەیەک بەئاسوودەیی دەژیین، بەڵام زۆر ئەستەمە خاوەنی وەها خێزانێک بیت و بشتوانی لەبەرەوە پاشەکەوت بکەیت. تەنها ئەوە بهێنەرە پێشچاوی خۆت، کە کەسێکی وەک فیدۆسی پیترۆڤیچ، خاوەنی هەشت کچ و تاقە کوڕێکە، کە ئەویش هێشتا منداڵە. وای دابنێ سبەینێ ئەو پیاوە دەمرێت، ئەزانی لە خانەنشینییەکی کەم، هیچی تری لەپاش بەجێ نامێنێت. تەنها بیهێنەرە پێشچاوی خۆت، هەشت دانە کچ! تەنها ئەوە بهێنرە پێشچاوی خۆت، ئەگەر بێت و تەنها یەکی جووتێک پاپووچیان بۆ بکڕیت! ئەم هەشت کچە پێنجیان پێگەیشتوون، گەورەکەیان کە دەڵێی مانگی تابانە، لە جوانیدا ڕوخساری دەدرەوشێتەوە و دواتر خۆشت دەیبینیت! تەمەنی تەنها بیستوچوار ساڵە. کچی شەشەمیان، کە هێشتا قۆناغی دواناوەندیی تەواو نەکردووە، تەمەنی تەنها پانزە ساڵە. بەدڵنیاییەوە دەبێت هاوسەر بۆ هەر پێنج کچە پێگەیشتووەکە بدۆزرێتەوە، دەشبێت هەرچی زووترە،

مشووری ئەم کارە بخورێت، ئێ هەر لەبەر ئەمە پێویستە باوکیان هەریەکەیان ڕەوانەی ماڵوحاڵی خۆی بکات. ئایا پێت وا نییە کە بەشوودانی پێنج کچ، تێچوونێکی باشی دەوێت؟ ئێ منیش ئەوەتا، قۆڵم لێ هەڵماڵیوە و وەک یەکەم خوازبێنیکەر ڕوو لە ماڵەکەی ئەو دەکەم. هەر لەبەر ئەوەی کە پێشتر بەباشی منیان ناسیوە، زۆر بەباشییش دەزانن خاوەنی سەرمایەیەکی بەرچاوم. مەبەستم ئەمە بوو، ئەمە هەموو شتێک بوو."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە کاتی ڕوونکردنەوەی ئەم شتانەدا تەواو خرۆشابوو.

"کەواتە تۆ کچە گەورەکەت دیاری کردووە؟"

"نا، نا، من... نەخێر، کچە گەورەکەی نا، بەڵکوو داخوازی کچی شەشەمم کردووە، ئەو دانەیەیان کە هێشتا لە دواناوەندی دەخوێنێت."

ڤێلچانینۆڤ دوور لە ویستی خۆی زەردەخەنەیەک کەوتە سەر ڕوخساری، وتی، "چی؟ بەڵام خۆ تۆ وتت ئەوەیان تەمەنی تەنها پانزە ساڵە!"

"ڕاستە کە ئەو ئێستا تەنها پانزە ساڵە، بەڵام لە ماوەی نۆ مانگی تردا دەبێت بە شانزە ساڵ، دەبێت بە شانزە ساڵ و سێ مانگ، ئێ ئیتر ئەمە چ کێشەیەکی تێدایە؟ لەبەر ئەوەی ئێستا دۆخەکە گونجاو نییە، بۆیە پەیوەندییەکەمان بەشاراوەیی هێشتۆتەوە و لای کەس ئاشکرامان نەکردووە، بۆ ئەمەش، بەتەواوی لەگەڵ دایک و باوکیدا ڕێک کەوتووین. دڵنیاشت دەکەمەوە، کە هەموو شتێک باش دەبێت!"

"کەواتە هێشتا نەگەیشتوونەتە ڕێکەوتنی کۆتایی؟"

"بێگومان گەیشتووینەتە ڕێکەوتنی کۆتایی، هەموو شتێک بڕیاری لەسەر دراوە، دڵنیات دەکەمەوە، هەموو شتێک بەو شێوەیەیە کە دەبوو ببێت."

"ئەی کچەکە خۆی ئەمە دەزانێت؟"

"ڕاستییەکەی، بەڕووکەش وا دەر دەکەوێت لەبەر نەریتی کۆمەڵایەتی، جارێ پێیان نەوتبێت، بەڵام گومانی تێدا نییە کە هەموو شتێک دەزانێت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کە وای وت، برۆیەکی هەڵتەکاند و بەتەریقییەوە درێژەی دایەوە بە قسەکانی، "کەواتە پێم بڵێ، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئایا پیرۆزباییم لێ ناکەیت؟"

"بەڵام تێم ناگەیەنیت بۆچی دەبێت من بێم بۆ ئەوێ؟" بەخێرایی ئەمەشی خستە سەر قسەکانی، "لە کاتێکدا کە بە هیچ کلۆجێک من بەتەما نیم بێم، بۆیە تکایە خۆت ماندوو مەکە بە دۆزینەوەی بیانووگەلێک، کە هەوڵی قاییلکردنی منی پێ بدەیت."

"ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ..."

"بە هەموو ئەقڵێکتەوە چاوەڕوانی ئەوە لە من دەکەیت، کە لەتەنیشت جەنابتا لەناو گالیسکەیەکدا دابنیشم و لەگەڵت بێم بۆ ئەوێ؟ بۆ تۆزێک بیر ناکەیتەوە!"

هەموو ئەو هەستی بێزاری و ڕقلێبوونەوەیەی ڤێلچانینۆڤ، کە کەمێک بەر لە ئاخاوتنە زۆرەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەبارەت بە ژنی داهاتووی هەیبوو بوو و لەبیری چووبۆوە، کتوپڕ جارێکی تر گەڕایەوە بۆ مێشکی، لەو کاتەدا خەریک بوو لە تووڕەییدا بەتوپزی پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە ماڵەکەی بکاتە دەرەوە، تەنانەت بەبێ ئەوەی خۆشی بزانێت

بۆچی، لە خودی خۆشی تووڕە بوو."

"لەتەنیشتمەوە دابنیشە، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، وا بکە، دڵنیا بە پەژێوان نابیتەوە!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێکی زۆر کەساسەوە وای وت. پاشان کە بێئۆقرەیی و جێبەخۆنەگرتنی ڤێلچانینۆڤی بینی، خێرا دەستەکانی ڕاوەشاند و وتی، "نا، نا، نا! ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، تاوێک ڕابوەستە، پێش ئەوەی بەپەلە بڕیار بدەی! وا هەست ئەکەم بەهەڵە لیم تێگەیشتبێت. من ئەوە باش دەزانم کە خۆت لەئاستی مندا نابینیتەوە، بە هەمان شێوە، منیش خۆم لەئاستی بەڕێزتاندا نابینم... ئەزانم ئێمە هاوشانی یەکتر نین، هێندە گەمژە نیم کە نەتوانم لەمە تێبگەم. ئەو چاکەیەشی من لە ئێوەی دەخوازم، لە ئاییندەدا بە هیچ پەیمانێکەوە ناتانبەستێتەوە. لە ڕاستییشدا سبەینێ، نا دوو سبەی، بەدڵنیاییەوە ئێرە بەجێ دەهێڵم، وەک ئەوەی ئەسڵەن هەر هیچیش ڕووی نەدابێت. کەواتە ڕێ بدە با ئەم ڕۆژە ببێت بە ڕۆژێکی تاقانە و نموونەیی. کاتێک هاتم بۆ لات، هیوایەکی زۆرم بە بەخشندەیی و ئەو هەستە تایبەتەی ناو دڵتان هەبوو، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەو هەستانەی بەم دواییە لەناو دڵ و دەروونتا سەری هەڵداوە... وابزانم بەڕوونی قسە دەکەم، وا نییە؟"

وروژاوییەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ گەیشتبووە دواترۆپک. ڤێلچانینۆڤ بەحەپەساوی تەماشای دەکرد. بە سڵڵێکردنەوە لێی پرسی، "تۆ داوای ئەوەم لێ دەکەیت، کە چاکەت لەگەڵ بکەم؟ کەچی زۆر پێداگرییشی لەسەر دەکەیت! ئەمە وام لێ دەکات گومان بکەم، پێویستە زیاتر لەسەر ئەمە بزانم."

"تەنیا چاکەیەک کە لە تۆم دەوێت، ئەوەیە تۆ لەگەڵمدا بێیت. دواتر کە گەڕاینەوە، هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، هەر وەک چۆن لە بەردەم قەشەیەکدا دان بە هەموو شتێکدا دەنرێت، منیش هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم. تکایە ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، متمانەم پێ بکە!"

بەڵام ڤێلچانینۆڤ هەر سوور بوو لەسەر ڕەتکردنەوەکەی، زیاتر و زیاتریش کەللەڕەقیی دەنواند، لەبەر ئەوەی نیگەرانی ئەوە بوو، کە شتێکی ناهەموار و نارەوا ئەنجام بدات. ئەم دنەدانە شەیتانییە لەو کاتەوەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ باسی لە ژنی داهاتووی کردبوو، بەتەواوی جاڕزی کردبوو، نەیدەزانی ئەوەی دەیویست حەزی زانین بوو، یاخود مەیلێکی شاراوە بوو، کە هێشتا ڕوون نییە. شتێک لە ناخیدا پاڵی پێوە دەنا قایل ببێت، بەڵام هەتا زیاتر هەستی بە دوودڵی بکردایە، زیاتر و زیاتر بەرگریی دەکرد. دەستێکی خستبووە سەر ئانیشکی و دانیشتبوو، بیری دەکردەوە. پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بەردەوام بوو لە پشیپشیکردن و هەوڵدان بۆ قاییلکردنی.

ڤێلچانینۆڤ، کە جاڕزبوونەکەی پێوە دیار بوو، تا ڕادەیەکیش دوودڵیی پێوە دیار بوو، لەسەر کورسییەکەی هەستا و کتوپڕ قاییلبوونی خۆی دەر بڕی، "زۆر باشە، دێم!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە خۆشیدا خەنی بوو. دەستی کرد بە مەراییکردن و هەر دەوروخولی ڤێلچانینۆڤی دەدا لە خۆشیدا.

"بەڵام ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، پێویستە هەر ئێستا جلەکانت بگۆڕیت و باشترین قاتی خۆت بپۆشیت."

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "باشە دەبێت بۆچی ئەم گەمژەیە خۆی لە مەسەلەیەکی ئاواوە تێوە بگلێنێت؟"

"ئەمە تەنها چاکەیەک نییە کە لە تۆ چاوەڕوانی دەکەم، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، مادام هێندە دڵت باش بوو و قاییل بوویت بێیت لەگەڵمدا، تکات لێ دەکەم بشبە بە چاوساغ و ئامۆژگاریکەرم."

"بۆ نموونە، لە چ شتێکدا؟"

"پرسیارێکی زۆر بەجێیە، بۆ نموونە، سەبارەت بەم شریتە ڕەشە. ئایا چۆنچۆنی گونجاوترە، ئایا شریتە ڕەشەکە لا ببەم یاخود لێی بگەڕێم وەک خۆی بێت؟"

"هەرچۆنێک خۆت مەیلت لێیە."

"نا، ئەمەوێت تۆ بڕیاری لەسەر بدەیت، ئەگەر تۆ لە شوێنی من بوویتایە، چیت دەکرد، ئەگەر شریتێکی ڕەش بە کڵاوەکەتەوە بووایە؟ بڕوای خۆم وایە، کە وازی لێ بهێنم وەک خۆی بێت و لای نەدەم، چونکە ئەمە ئاماژە بە بەردەوامبوونم لە هەستی خۆشەویستی و وەفاداریم دەکات، هەروەها ئەمەش بە سوودی خۆم دەشکێتەوە و ڕەنگە ڕێزێکی ترم پێ ببەخشێت."

"بەدڵنیاییەوە لێی بکەرەوە."

"هەر بەڕاستی پێت وایە ئەمە دەبێتە کێشە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وای وت و کەمێک لە بیرکردنەوەدا ڕۆ چوو، پاشان وتی، "نا، پێم وا بێت دەستکاریی نەکەم باشترە..."

"هەرچۆنێک خۆت پێت خۆشە."

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "ئەو متمانەم پێ ناکات، ئەمە شتێکی زۆر باشە."

هەردووکیان بەجووتە لە ماڵ دەر چوون، پاڤێل پاڤلۆڤیچ

چاوی ڕەزامەندیی بڕیبووە سەروسیما کەشخەکەی ڤێلچانینۆڤ و زۆر بەوە دڵخۆش بوو، سەروسیمای خۆشی، خانەدانی و شکۆمەندییەکی لەڕادەبەدەر بەرزیی دەنواند، ئەمە ببووە مایەی سەرسووڕمانی ڤێلچانینۆڤ کاتێک لێی ڕوانی و لەوەش زیاتر سەری لە خۆی سووڕ مابوو. گالیسکەیەکی زۆر ڕازاوە و جوان لە بەردەم دەروازەکە وەستابوو، چاوەڕوانی دەکردن.

"کەواتە پێشتر گالیسکەشت ئامادە کردبوو؟ کەواتە هێندە دڵنیا بوویت لەوەی لەگەڵت دێم؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێک، کە لە دەنگی پیاوێکی دڵخۆشی دەکرد، وەڵامی دایەوە، "لە ڕاستیدا من گالیسکەکەم تەنها بۆ خۆم بەکریێ گرتبوو، بەڵام تا ڕادەیەکیش باوەڕم بەوە هەبوو، کە تۆ قاییل دەبیت بەوەی هاوەڵیم بکەیت."

ڤێلچانینۆڤ کە خرۆشابوو، لە کاتێکدا لەناو گالیسکەکەدا دانیشتبوون و گالیسکەکە کەوتبووە جووڵە، بەپێکەنینەوە وتی، "پەکوو، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، هەست ناکەیت زیادلەپێویست متمانەت بە منە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێک، کە پڕ بوو لە خرۆشان، وەڵامی دایەوە، "بەڕاستی ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، لە تۆ ناوەشێتەوە شتی وا بە من بڵێیت، نا، هەرگیز لە تۆ ناوەشێتەوە من بە مرۆڤێکی گەمژە بزانیت لەسەر ئەمە."

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "ئەی لیزا؟" بەڵام هەر زوو ئەم بیرۆکەیەی لە مێشکی خۆی دەر کرد، چونکە لەوە دەترسا، ئەگەر بێت و باسی ئەو کچە بکات، وەک ئەوە وایە سووکایەتی بە ڕۆحی پیرۆزی کردبێت. کتوپڕ لەو

ساتەدا خۆی زۆر بە گوناح و زۆر بچکۆلە هاتە پێشچاو، پێی وا بوو ئەو بیرۆکەیەی ئارەزووی دەجووڵێنێت، لە بیرۆکەیەکی پووچ و بێبایەخ زیاتر، چیی دی نییە، کە بیری لێ دەکردەوە، هەستی بە ئازار دەکرد... سەرلەنوێ هەستێکی بەهێز لە ناخیدا سەری هەڵدایەوە، ئەویش ئەوە بوو، کە بە هەرنرخێک بووە، واز لە هەموو شتێک بهێنێت و دەستبەجێ لە گالیسکەکە دابەزێت، تەنانەت ئەگەر ناچار بوو بێت بۆ ئەم کارە زۆریی بازووش لە دژی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەکار بهێنێت.

بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ دووبارە دەستی کردەوە بە ئاخاوتن، ئەو بیرۆکانەی ئارەزووی ڤێلچانینۆڤی دەجوڵاند، سەرلەنوێ لە ناخیدا زیندووی کردەوە.

"ئەرێ بەڕاست، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، تۆ هیچ شارەزاییت لە بابەتی خشڵ و ئەو شتانەدا هەیە؟"

"چ جۆرێکی خشڵ؟"

"ئەڵماس."

"بەڵێ."

"حەز دەکەم دیارییەکی گچکەیان بۆ ببەم. ڕێنماییم بکە، بیبەم یان نەیبەم؟"

"بە بڕوای من، پێویست ناکات."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وتی، "بەڵام هەست ئەکەم ئەم کارە بکەم باشترە، تەنها نازانم کە دەبێت چی بکڕم؟ نازانم تاقمێکی تەواو بکڕم کە پێک دێت لە گەردنبەند، جووتێک گوارە، بازن، یاخود هەر یەک پارچەی سادە؟"

"دەتەوێت تا چەندی پێ بدەیت؟"

"نزیکی چوار سەد بۆ پێنج سەد ڕۆبڵ؟"

"بۆچی چییە!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دوودڵییەکەوە پرسی، "پێت وایە زۆرە یان چی؟"

"یەک بازنی سەدڕۆبڵی بکڕە."

پێدەچوو پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەمێک نارەحەت بووبێت، چونکە زۆری حەز دەکرد پارەی زیاتر خەرج بکات و تاقمێکی تەواو بکڕێت. وڕکی گرتبوو. خۆیان کرد بە دوکانێکی خشڵفرۆشتندا. هەرچۆنێک بێت، هەر بازنەکەی کڕی، ئەو بازنەیەش نا کە خۆی حەزی لێی بوو، بەڵکوو ئەو بازنەیەی کڕی کە ڤێلچانینۆڤ دەستی خستە سەری. پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەیویست هەردوو بازنەکە هەڵبگرێت. کاتێک خشڵفرۆشەکە بۆ داواکردنی نرخی بازنەکە داوای سەدو حەفتاوپێنج ڕۆبڵی کرد، دوای مامەڵەکردن بە سەدوپەنجا ڕۆبڵ قاییل بوو کە بیانداتێ. بەڕوونی دیار بوو پاڤێل پاڤلۆڤیچ جاڕز ببوو، تەنانەت ئامادە بوو بەبێ مامەڵە دوو سەد ڕۆبڵ بدات، ئەگەر کابرای خشڵفرۆش داوای ئەو بڕەی بکردایە، حەزی دەکرد پارەی زیاتر خەرج بکات.

کاتێک سواری گالیسکەکە بوونەوە و کەوتنەوە ڕێ، پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە وتی، "کێشە نییە، ئایا بەڕاست پێویست دەکات هەر لە ئێستاوە پەلەی پیشکەشکردنی دیاریی گرانبەهام بێت؟ ئەوانە خەڵکێکی چەندان زەنگین نین، بەڵکوو خەڵکێکی گەلێک سادەوساکارن."

پاشان زەردەخەنەیەکی بلح و گەمژانەی کرد و بەردەوام بووەوە لە تەواوکردنی قسەکانی، "ئەو بوونەوەرە وردیلەیە

شەیدای دیاریی بچکۆلانەیە، کەمیک بەر لە ئێستا، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، کاتێک گوێبیستی ئەوە بوویت کە تەمەنی پانزە ساڵە، بزەت هات، ئەزانی ئەمە ڕێک ئەو شتەیە، کە منیشی تووشی واقوڕمان کردووە، کە دەبینم جانتایەکی پڕ لە پەرتووک و پەڕاو و پێنووسی کردۆتە شانی و هێشتا هاموشۆی خوێندنگە دەکات، ها، ها، ها! ئەو جانتایەی بەتەواوی حەیرانی کردووم! ئەزانیت ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەوەی کە من زۆر حەزم پێیەتی، بریتییە لە داوێنپاکی، بە ڕای من، داوێنپاکی لە جوانیی ڕوخسار گرنگترە. خوایە گیان چەند دڵڕفێن بوو کاتێک لە سووچێکا لەگەڵ هاوڕێکانی خوێندنگەی لەژێر لێوەوە پێدەکەنی، چەند نازدار بوو کاتێک پێدەکەنی! پێکەنینەکەی لەسەر چی بوو؟ تەنها لەبەر ئەوەی بێچووە پشیلەیەک لەسەر چەکمەجەی دۆڵابەکەوە خۆی هەڵدابووە ناو جێگە خەوەکەیەوە و وەک تۆپێکی بچکۆلە خۆی گرمۆڵە کردبوو... بۆنی زەردەخەنەکەی وەک بۆنی سێوێکی تازە بوو! باشتر نییە ئەم شریتە ڕەشە لێبکەمەوە؟"

"هەرچۆنێک خۆت مەیلت لێیەتی."

"کەواتە لای دەبەم."

کڵاوەکەی لە سەری داکەند و شریتە ڕەشەکەی لێکردەوە و فڕێی دایە سەر ڕێگەکە. کاتێک کڵاوەکەی کردەوە سەر سەرە ڕووتاوەکەی، ڤێلچانینۆڤ چاوی بە ڕوخساری کەوت، کە تیشکی هیوا ڕوخساری دەدرەوشاندەوە.

ڤێلچانینۆڤ، کە بەڕاستی هەستی بە تووڕەیی دەکرد، لە دڵی خۆیدا دەیوت، "باشە دەکرێت هەر بەڕاستی ئەمە هەر هەمان ئەو کەسە بێت؟ تۆ بڵێی هیچ فڕوفێڵێکی لەژێر

سـەردا نەبێت لـەم بانگهێشـتکردنەی منـدا؟ تـۆ بلێـی هـەر بەڕاستی پشتی بە بەخشندەییی من بەستبێت؟" بـەم شێوەیە بـەردەوام بـوو لـە گومانبردنەکانـی، ئـەم گومانـەی کۆتایـی، بەتـەواوی پەسـتی کـرد.

"باشـە ئـەم مرۆڤـە چییـە؟ گاڵتەجـارە، گەمژەیـە، یاخـود مێردێکـی هەمیشـەیییە؟ بـەڵام ئەمـە مەحاڵـە!"

# ١٢

# لەلای خێزانی زاخلیبینین

هەر بەو شێوەیەی ڤیلچانینۆڤ پێشتر باسی لێوە کردبوون، "خێزانی زاخلیبینین خێزانێکی گەلێک بەڕێز بوون،" جەنابی زاخلیبینین مەکانەتێکی باڵای هەبوو لە دەوڵەتدا و دەستیشی باش دەڕۆیشت و ناو و ناوبانگێکی باشیشی هەبوو. هەموو ئەو شتانەشی کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەبارەت بە داهاتی ئەم خێزانە وتبووی، هەمووی بێ کەم و زیاد ڕاست بوون. "زۆر بەئاسوودەیی دەژیان، بەڵام ئەگەر بەخێوکەری خێزانەکە بمردایە، ئەوە هیچ شتێکیان بۆ بەجێ نەدەما."

زاخلیبینینی ئیختیار بەوپەڕی نەزاکەتەوە بەخێرهاتنێکی گەرموگوڕی ڤیلچانینۆڤی کرد، نەیاری دوێنێی، ئەمڕۆ تەواو وەک هاوڕێیەک دەر دەکەوت. لە یەکەم دەسپێکی قسەکردنیدا، بە ڕوویەکی خۆش و گرنگیپێدانەوە وتی، "بەگەرمی پیرۆزباییتان لێ دەکەم، بەم شێوەیە زۆر باشتر بوو، خودی بەندەش زۆر سوور بووم لەسەر ئەوەی بە شێوەیەکی دۆستانە بگەنە ڕێککەوتن و ئەم دۆسیەیە لە دادگا کۆتاییی پێ

بهێنرێت. بەڕاستی پیوتەر کارلۆڤیچ، پارێزەرەکەی ڤیلچانینۆڤ، لەم جۆرە دۆسیەیانەدا ڕکابەری نییە. ئەوەتا شەست هەزار ڕۆبڵ چنگ دەخەیت بەبێ هیچ ماندووبوونێک، بەبێ دواخستن و بەبێ هیچ کێشمەکێشێک! لە کاتێکدا پێدەچوو دۆسیەکە ماوەی سێ دانە ساڵی ڕێک درێژەی بکێشایە."

دەستبەجێ ڤیلچانینۆڤ بە خاتوو زاخلبینین ناسێنرا، خاتوونێکی بەساڵاچووبوو، جەستەیەکی تێکسمڕاو، ڕوخسارێکی زۆر ساکار و ماندووی هەبوو. هەر دوای ئەوەی ئەو خاتوونە، کچە لاوەکانیش یەک لەدوای یەک، بەلەنجەولار، بە هەمان شێوە یەک-یەک و دوو-دوو خۆیان ناساند. بەڵام ژمارەیەکی زۆر لەو خاتوونە لاوانەی خۆیان لە بەردەم ڤیلچانینۆڤدا دەر خست، نزیکەی دە بۆ دوانزە دانەیەک دەبوون، ڤیلچانینۆڤ ژمارەیانی لێ تێک چوو، دەستەیەک دەهاتنە ژوورەوە و دەستەیەک دەچوونە دەرەوە. بەڵام دیار بوو هەندێکیان کچە هاوڕێکانی دراوسێ ڤیلاکانیان بوو. ڤیلاکەی خێزانی زاخلیبینین، ڤیلایەکی زەبەلاحی لەداردرووستکراو بوو، بە شێوەیەکی زۆر ئەنتیکە و سەرسووڕهێنەر دروست کرابوو و چەند بەشێکی تریشی درابوو بەدەمەوە، کە بۆ چەند سەردەمێکی جیاواز دەگەڕایەوە، هەروەها باخێکی زۆر گەورەشی لەسەر بوو، بەڵام سێ بۆ چوار ڤیللای تریش لە چەند لایەکی جیاوازەوە دەیانڕوانی بەسەر ئەو باخەدا، هەر بۆیە باخەکە موڵکێکی هاوبەش بوو، ئەم هاوبەشییەش بە شێوەیەکی سروشتی وای کردبوو، کە پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لەنێوان هەموو ئەو کچانەدا دروست بکات، کە هەریەکەیان سەر بە خێزان وماڵێکی جیاواز بوون. هەر لە سەرەتای

دەسپێکردنی یەکەم وشەی گفتوگۆکەوە، ڤێلچانینۆڤ پەیی بەوە برد کە دیارە پێشتر چاوەڕوانی هاتنی بووبێتن! دیداری یەکێک لە هاورێکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە مەیلێکی زۆری هەبوو بۆ نزیکبوونەوە لەو خێزانە، زۆر بەگەرموگوڕی بەخێرهاتن دەکرێت، دیارە شتێکی شاراوە لەم بەینەدا هەیە. بەڵام ڤێلچانینۆڤ بە هۆی تیژبینیی خۆی و شارەزاییی لەم جۆرە دیدارانەدا، یەکسەر هەستی کرد ئەم ماستە بێ موو نییە؛ لە لایەکەوە هەر لەوەی بە ڕووخۆشی و گەرموگوڕییەوە بەخێرهاتن کرابوو لەلایەن دایک و باوکەکەوە، هەروەها خۆئامادەکردن و خۆجوانکردنی ئەو خاتوونە گەنجانەش، "هەرچەندە لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژە جەژنێکی ئایینییش بوو،" لە لایەکی ترەوە، لە هەموو ئەو شتانەی بەخێرایی لە بەرچاویدا ڕوویان دا، پەیی بەوە برد کە ئەگەری زۆرە پێشتر پاڤێل پاڤلۆڤیچ نەخشەی بۆ ئەم کارە دارشتبێت و بەدڵنیاییەوە هەر بە چەند وشەیەکی کەم، کاری کردۆتە سەر ئەو خێزانە و بە شێوەیەک باسی لە ئەو واتا ڤێلچانینۆڤ و لە سەروەتەکەی کردووە و هەروەها تێی گەیاندوون سەر بە چینێکی بەرزی کۆمەڵایەتییە و لە ژیانی زگوردێتی جاڕزبووە و بەدەستیەوە ئازار دەچێژێت، زۆر دووریش نییە کە سەرلەنوێ بیری خۆی کۆ بکاتەوە و "بارودۆخی ئێستای بگۆڕێت و کۆتایی بە ژیانی زگوردێتی بهێنێت." بەتایبەتی کە هێندە نابێت سامانێکی باشی دەست کەوتووە!

کچە گەورەکەی زاخلیبینین، کاترینا فیدۆسێڤنا، کە تەمەنی تەنها بیستوچوار ساڵ بوو و پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە هەر بە جوانییە بێوێنەکەیدا هەڵی دەدا و هەڵسوکەوت و خۆدەرخستنەکانی

خودی ئەم خاتوونەش لە بەردەم ڤیلچانینۆڤدا، ڤیلچانینۆڤ یەکسەر ئەقڵی بۆ ئەوە چوو، کە ئەم کچەیان بۆ ئەو دانا بێت.

کاترینا بە هۆی جیاوازیی جۆری پۆشاکەکەی و ئەو شێوازە ڕازاوەیەی قژی پێ شانە کردبوو، لە خوشکەکانی تری جیا دەکرایەوە. خوشکەکانی و کچەکانی تر، هەموویان بە نیگاکانیاندا وا دەر دەکەوتن وەک ئەوەی بزانن ڤیلچانینۆڤ بۆیە هاتووە، بۆ ئەوێ تا لەسەر حسابی کاتیا خزمایەتیان لەگەڵدا پێک بهێنێت، بۆیە هاتووە، تا لە نزیکەوە تەماشای بکات. نیگاکانیان و تەنانەت هەندێک لە وشەکانیشیان، کە لەو ڕۆژەدا بەبێ ویستی خۆیان لە زاریان دەر دەچوو، هەموو ئەو گومانانەی ڤیلچانینۆڤی پشتڕاست دەکردەوە، کە لە زەینی خۆیدا دروستی کردبوون.

کاترینا فیدۆسیڤنا کچێکی باڵابەرزی قژزەردی جەستەپتەو بوو، هەروەها خاوەنی ڕوخسارێکی گەلێک شیرین و لەبەردڵان بوو، زۆریش سەنگین و سەلار بوو.

ڤیلچانینۆڤ، کە بەوپەڕی چێژەوە لێی دەڕوانی، دوور لە ویستی خۆی لە دڵی خۆیدا وتی، "بەڕاستی زۆر سەیرە کچێکی ئاوا شۆخوشەنگ لەسەر ماڵ بێت، ڕاستە ئەو جیازیی* نییە و بەمزووانەش ئەگەر ئاوا بمێنێتەوە، لەڕادەبەدەر قەڵەو دەبێت، بەڵام هەنووکە بەم شێوەیەی ئێستا گەلێک پیاو شەیدای جوانیی خۆی دەکات..."

تەواوی خوشکەکانی تریشی بە هەمان شێوە زۆر لەبەردڵان بوون، هەروەها لەنێوان هاوڕێ کچەکانیشیاندا، کە لەوێ ئامادەبوون، کیژگەلێکی زۆر شۆخوشەنگ و ڕوخسارنازداری

---

* جیازی: ئەو سامانەی بووک لەگەڵ خۆی دەیهێنێت بۆ زاوا.

تێدا بوو. ئەم مەسەلەیە وردەوردە خەریک بوو مێشکی سەرقاڵ دەکرد، هەر لەگەڵ هاتنی بۆ ئەوێ، بیرۆکەیەکی تایبەتی وای لە مێشکدا نەبوو.

نادیژدا فیدۆسیڤنا، کچی شەشەم، ئەو کچەی هێشتاش هاتوچۆی خوێندنگەی دەکرد، ئەو کچەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ نیازی بوو بیکات بە خێزانی داهاتووی خۆی، تا ئەو ساتەش خۆی دەر نەخستبوو. ڤێلچانینۆڤ بێئارامانە چاوەڕوانی دەرکەوتنی بوو، حەزی دەکرد هەرچی زووترە، بیبینێت، تەنانەت سەری لەم مەیلەی خۆی سوور ما و لە ناخەوە بە خۆی پێدەکەنی.

دواجار، بەبێ ئەوەی خۆی شلوێ بکات، نادیا هاوڕێ لەگەڵ کچێکی گورجوگۆڵ، زۆرزان و تێگەیشتوو، گەنمڕەنگ و خاوەن ڕوخسارێکی کۆمیدی، کە ناوی ماری نیکیتیشنا بوو، کەسێک بوو کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەر بەبینینی زەندەقی لێی چووبوو، جێی بە خۆی نەدەگرت، خۆی کرد بە ژوورەوەدا. ئەم ماری نیکیتیشنایە، کچێکی تەمەن بیستوسێ ساڵان بوو، هەروەها خاوەنی زمانێکی پێکەنیناوی بوو، بەڕاستییش کچێکی زیرەک بوو، دایەن بوو لە ماڵی یەکێک لە هاوڕێکانی خێزانەکەی زاخلیبینین. زۆر لەمێژ بوو خێزانی زاخلیبینین ئەویان وەک ئەندامێکی خێزانەکەی خۆیان پەسەند کردبوو و کچەکانیش ئەویان گەلێک خۆش دەویست و بەبێ ئەو هەڵیان نەدەکرد. پێدەچوو نادیا بە هیچ کلۆجێک نەتوانێت لە کاتێکی وەک ئێستادا دەستبەرداری ماری ببێت. ڤێلچانینۆڤ یەکسەر هەستی کرد کە هەموو خوشکەکان بە چاوێکی ناحەز و دزێوەوە لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەڕوانن، تەنانەت هاوڕێکانیشیان. هەر دوای تێپەڕبوونی دوو خولەک بەسەر هاتنەژوورەوەکەی

نادیادا، ڤێلچانینۆڤ بەهەمان شێوە تێبینیی ئەوەشی کرد، کە تەنانەت خودی نادیاش حەز بە چارەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ ناکات.

هەروەها سەرنجی ئەوەشی دا، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ پەیی بەم شتە نەبردووە، یاخود پەیی پێ بردووە، بەڵام خۆی لە گێلی دەدات و نایەوێت ڕاستی قبوڵ بکات.

نادیا بەبێ هیچ گومانێک لە سەرجەم خوشکەکانی تری جوانتر بوو، کچێکی وردیلەی گەنمڕەنگ بوو، لە ڕوخساریدا سەرکێشی و سرکێتی دەبینرا، هەروەها چاونەترس و بێپەروا دەر دەکەوت؛ لە منداڵێکی کەتنباز دەچوو، چاوەکانی دەبریسکانەوە، زەردەخەنەکەی گەلێک شیرین و دڵڕفێن بوو، بەڵام زۆربەی جار زەردەخەنەکانی گەلێک ناحەز بوون، هەروەها خاوەنی جووتێک لێو و ڕیزێک ددانی سەرسووڕهێنەر بوو، باریکەلە و سووکەڵە بوو، ڕوخساری، کە هێشتا بە ڕوخساری منداڵی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی نوێ لە ڕواڵەتیدا دەدرەوشایەوە. هەر هەنگاوێک کە هەڵی دەهێنایەوە و هەر وتەیەک کە لە زاری دەهاتە دەر، نیشانەیەکی ڕوونی ئەو تەمەنەی بوو، کە دەینواند. دواتر دەر کەوت جاری پێشووتر پاڤێل پاڤلۆڤیچ ئەوی بە جانتایەکی چەرمی ئەمەریکی، کە کردبوویە شانی، چاو پێ کەوتبوو، بەڵام ئەم جارەیان هیچ جانتایەکی لەشان نەکردبوو. مەسەلەی پێشکەشکردنی بازنەکە بەتەواوی شکستی هێنا و لە ڕاستیدا دۆخێکی زۆر ناخۆشیشی دروست کرد. هەر هێندەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ چاوی کەوت بە "ژنی داهاتووی،" خۆی کرد بە ژوورەوەدا، یەکسەر بەزەردەخەنەوە خۆی پێ

گەیاند و دیارییەکەی پێشکەش کرد، ئەمەش پشتئەسوور بەو "شادمانییە مەزنەی جاری پێشوو هەستی پێ کردبوو کاتێک نادیژدا فیدۆسیڤنا سترانێکی دڵڕفێنی بە پیانۆوە چڕیبوو." زمانی لاڵ ببوو، نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات، دەستەپاچە لە شوێنی خۆی وشک هەڵهاتبوو، دەستی نادیای گرتبوو، ئەیویست سندوقچەکە بکاتە ناو دەستی، نادیاش، کە لە شەرم و تووڕەییدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو، نەیدەویست دیارییەکە وەر بگرێت، دەستی خۆی ڕاکێشایە دواوە و کەرترپنانە ئاوڕی بۆ دایکی دایەوە، کە ڕوخساری لە تەریقیدا تک تک ئارەقەی لێ دەچۆڕا، بە دەنگی بەرز وتی، "دایە، نامەوێت وەری بگرم!

باوکی بە مۆنی، کە بە هەمان شێوە دیار بوو ئەویش قارس ببوو لەم دۆخەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ دروستی کردبوو، وتی، "کچی خۆم، وەری بگرە و سوپاسیشی بکە."

پاشان بەسەرکۆنەکردنەوە چرپاندی بە گوێی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا و وتی، "پێویستی نەدەکرد، هەرگیز پێویستی نەدەکرد!"

نادیا بینیی چاری ناچارە و تازە دەبێت سندوقچەکە وەر بگرێت، بۆیە وەری گرت و چاوەکانی نەوی کرد و وەک نیشانەی سوپاسکردن و ڕێزگرتن، کتوپڕ وەک منداڵ ئیکلامی کرد، بەڵام بەخێرایی ئەم کارەی ئەنجام دا و یەکسەر هەستایەوە. یەکێک لە خوشکەکانی چوو بۆ لای نادیا تا تەماشای دیارییەکە بکات، نادیاش بەبێ ئەوەی سەری سندوقچەکە هەڵبداتەوە، دایە دەستی، هەڵبەت ئەمەش بۆ ئەوەی لەلایەن خۆیەوە نیشانی بدات، کە ئەسڵەن هەر بەلاشیەوە گرنگ نییە تا تەماشای بکات. بازنەکە لە سندوقچەکە دەر هێنرا و بەبێدەنگی دەستاودەستی

پێ کرا و تەنانەت هەندێکیان کە سەیرییان دەکرد، وەک ئەوەی سەیری شتێکی توورەهات بکەن، بزە دەیگرتن. تەنها دایکیان نەبێت، بەخوتەوبۆڵەوە، ئەویش لەژێر لێوەوە ئاماژەی بەوە کرد، کە بازنەکە بازنێکی زۆر جوانە. پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەو کاتەدا حەزی دەکرد زەوی دەم بکاتەوە و قووتی بدات.

بەڵام باش بوو لەو کاتەدا ڤێلچانینۆڤ لەو دۆخە ڕزگاری کرد.

بە دەنگی بەرز و بەپەرۆشی کەوتە ئاخاوتن، لە دەستپێکدا هەرچییەک لەو کاتەدا لەبیری بوو، وتنی، هەمووی پێنج خولەکێکی نەخایاند، کە سەرنجی هەموانی لە ژووری میوانەکەدا بەلای خۆیدا ڕاکێشا. ڤێلچانینۆڤ دەستێکی باڵای هەبوو لە کورتەگێڕانەوەدا، بەتایبەت لەم جۆرە کۆڕانەدا. هونەرەکەی ئەوە بوو، کە بەبێ ئەوەی لە ڕوو دابمێنێت، بە کامی دڵی خۆی قسەی دەکرد و لە هەمان کاتیشدا بە شێوەیەک بایەخی دەدا بە گوێگرەکانی، کە وای لێ دەکردن ئەوانیش بێ سڵەمینەوە و لەڕوودامان بە کامی دڵی خۆیان وەک خۆی قسە بکەن. هەرکات پێویستی بکردایە، دەیزانی چۆن بە شێوەیەکی تەواو سروشتی ڕۆڵی دڵخۆشترین و خۆشبەختترین مرۆڤ بگێڕێت. زۆر زیرەک بوو لەوەی لە چ کاتێکی شیاودا بەگاڵتەوە قسەیەکی نەستەق یان لاقرتێیەک یان نوکتەیەک بکات، وەک ئەوەی بەڕێکەوت و بەبێ ئەوەی خۆی بۆ وتنی ئەو قسانە ئامادە کردبێت، یاخود مەبەستی بووبێت، ئیلهامی ئەو قسانەی بۆ هاتووە، سەرباری ئەوەی ئەو قسە نەستەقانە و ئەو لاقرتێیانە و ئەو نوکتە بەپێزانە تەنانەت سەرجەمی ئاخاوتنەکانیشی، ڕەنگە هەر هەمووشی زۆر پێشتر ئامادە کرابێت و هەمووی لەبەر کرابێت، ڕەنگە

تەنانەت زیاد لە چەندین جاریش لێرەولەوێ، لە چەندین بۆنەی تردا ئەم شتانە وترابێتن و دووبارە و چەندبارەش کرابێتنەوە، بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی ئەو جەوەی هەیەتی، هونەرەکەی فریای کەوتووە و یارمەتیی دەدات، بە شێوەیەک هەستی بە خرۆشان دەکرد، وای هەست دەکرد شتێک دنەی دەدات تا بەو شێوەیە قسە بکات. بڕوای تەواوی بە خۆی هەبوو و لێی یەقین بوو کە پاش چەند خولەکێکی کەم، هەموو ئەو چاوانە سەرنجیان دەچێتە سەر ئەم، هەموو ئەو خەڵکەی لەوێ دانیشتوون، تەنها گوێ بۆ قسەکانی ئەم دەگرن و قسە لەگەڵ کەس ناکەن جگە لە ئەم، هەروەها تەنها بەو شتانەش پێدەکەنن، کە ئەم دەیانڵێت. لە ڕاستیدا هەر بەو شێوەیەش دەر چوو، کە خۆی بیری لێ کردبۆوە، هێندەی نەبرد دەنگی قاقای پێکەنینی لابەلا لێرەولەوێ بەرز بۆوە، ئەوانی تریش وردەوردە بەشداریی گفتوگۆکەیان کرد، هەر بەڕاستی ڤێلچانینۆڤ ئێجگار زیر بوو، دەیزانی چۆن ئەوانی تریش بە قسە بهێنێت. بەم شێوەیە گوێبیستی سێ یان چوار دەنگی جیاواز دەبوویت، کە لە یەک کاتدا بەیەکەوە قسەیان دەکرد، تەنانەت ئەو دەموچاوە ترشاو و بێزارەی خاتوو زاخلیبینینیش لە خۆشیدا دەستی کردبوو بە درەوشانەوە؛ هەمان شتیش هەر بەو شێوەیە بوو بۆ کاترینا فیدۆسێڤنا، کە بەوردی گوێی گرتبوو و چاوی لەسەر ڤێلچانینۆڤ نەدەتروکاند، وەک ئەوەی جادووی لێ کرابێت. نادیا لە ژێرەوە زۆر بەوریاییەوە چاودێریی ڤێلچانینۆڤی دەکرد، زۆر ڕوون بوو کە کەوتۆتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەمەش ڤێلچانینۆڤی زیاتر دنە دەدا. ماری نیکیتیشنا، ئەو کچە سەربەگۆبەنە، لەناو گفتوگۆکەدا دەرفەتی قۆستەوە و

قسەیەکی تویکلداری لە دژی پاڤێل پاڤلۆڤیچ فڕێ دایە ناو گفتوگۆکەوە: بەوپەڕی چاونەترسییەوە درۆیەکی شاخداری بەدەم پاڤێل پاڤلۆڤیچەوە کرد و وتی، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ دوێنێ باسی ئەوەی بۆ کردوون، کە بەحساب ڤێلچانینۆڤ هاوەڵی سەردەمی منداڵییەتی، بەم قسەیەشی زۆر بەڕوونی و پێداگرییەوە حەوت ساڵی تری زیاد کرد بۆ تەمەنی پاڤێل پاڤلۆڤیچ، بەڵام ڤێلچانینۆڤ کارێکی وای کرد، کە تەنانەت ئەو ماری نیکیتیشنا بەدخوازەش خۆشی بوێت و سەرنجی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەتەواوی چووبووەوە ناو قاوغەکەی خۆی. بێگومان ئاگاداری ئەوە بوو، کە هاوڕێکەی خاوەنی هەندێک بیرۆکە و هەندێک توانای باشە، تەنانەت لە سەرەتادا زۆر دڵخۆشیش بوو بە سەرکەوتنەکەی، پێشتر لە شوێنی خۆیەوە جاروبار پێدەکەنی و بەشداریی گفتوگۆکەشی دەکرد، بەڵام هێندەی نەبرد، کە وا دەر دەکەوت وردەوردە کەوتبێتە گێژاوی قووڵی بیرکردنەوەوە، دواجار لەناو غەمگینییەکی ئاشکرادا نغرۆ بوو، ئەمەش زۆر بەڕوونی لە ڕوخساری شێواویدا بەدی دەکرا.

زاخلیبینینی پیر بەڕووخۆشییەوە، لە کاتێکدا هەستابووە سەر پێ تا بچێت بۆ ژوورەکەی خۆی لە نهۆمی سەرەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەو ڕۆژە پشووش بوو، بەڵام هەندێک پەڕەی بازرگانیی لەلا بوو، کە دەبوو پێداچوونەوەیان بۆ بکات، وتی، "بەڕاستی ئێوە میوانێکن، کە پێویستتان بە خولقکردن و شتی وا نییە! پێم وا بوو بەڕێزتان ڕووگرژترین و غەمبارترین لاو بن، چەند هەڵەیە پیاو هەر لەخۆیەوە پێشوەختە بڕیار لەسەر کەسایەتیی کەسێکی تر بدات!"

لە ژووری میوانەکە پیانۆیەکی لێ بوو، ڤیلچانینۆڤ پرسیی، کە کێ ئەزانێت پیانۆکە لێبدات، پاشان لەناکاو ڕووی کردە نادیا و پرسی، "پێم وا بێت تۆ ستران بچڕیت؟"

نادیا بە شێوەیەکی ناشرین خێرا وەڵامی دایەوە، "کێ پێی وتوویت من ستران دەچڕم؟"

"هەر ئێستا پاڤێل پاڤلۆڤیچ پێی وتم."

"بەڵام ئەوە ڕاست نییە، من تەنها بۆ خۆشی ستران دەچڕم، دەنگم خۆش نییە."

"ئێ خۆ منیش دەنگم هێندە خۆش نییە، بەڵام سترانیش دەچڕم."

"کەواتە تۆ سترانمان بۆ دەچڕیت؟ زۆر باشە، کەواتە منیش ستران بۆ تۆ دەچڕم."

نادیا وای وت و چاوەکانی دەدرەوشانەوە، پاشان ئەمەشی خستە سەر قسەکانی، "بەڵام ئێستا نا، ڕەنگە دوای نانی شێوان. بێزار بووم لە میوزیک. بێزار بووم لە پیانۆ؛ ئەمانە هەموویان بەیانی تا ئێوارە لێرە ستران دەچڕن و پیانۆ لێدەدەن - تەنها کەسێک کە شایانی ئەوە بێت گوێی بۆ ڕابگیرێت، کاتیایە."

ڤیلچانینۆڤ یەکسەر ئەم دەرفەتەی قۆستەوە، چونکە کاتێک زانیی کاترینا فیدۆسیێڤنا تەنها کەسە لەوماڵەدا کە بەجوانی و بەبایەخەوە پیانۆ لێبدات، بێ دواکەوتن تکای لێ کرد کە پارچەیەکیان بۆ لێبدات.

لەوە دەچوو هەمووان بە ناوهێنانی کاتیا لەلایەن ڤیلچانینۆڤەوە دڵخۆش بووبن، تەنانەت دایەش لە دڵخۆشیدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕا بوو، کاترینا فیدۆسیێڤنا بەزەردەخەنەوە لە شوێنی خۆی هەستایە سەر پێ و بەرەو لای پیانۆکە هەنگاوی نا، بەڵام

لەناكاو، شتێک کە بووە مایەی واقوڕمانی خودی خۆشی، ئەو بەو گەورەییەی خۆی، بەو چاونەترسییەی خۆی، ئەوێک کە هەنووکە تەمەنی بیستوچوار ساڵە، ئێستا وەک کچێکی بچکۆلە ڕەنگی سوور هەڵگەڕاوە و لەم سوورهەڵگەڕانەشی، زۆر لە حاڵی خۆی تەریق بۆوە. لەو کاتەدا کە دانیشت بۆ ئەوەی پیانۆکە لێبدات، هەموو ئەو هەستانە لە ڕوخساریدا دەخوێندرایەوە. لەگەڵ ئەوەی شەرمیشی دەکرد، بەڵام پارچەیەکی هایدن* لێدا، هەرچەندە کە موزیکەکە هیچ دەربڕین و هەستێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو، بەڵام زۆر بەوریاییەوە پارچەکەی لێدا. هەر هێندەی لە لێدانەکەی تەواو بوو، ڤێلچانینۆڤ بەگەرمی کەوتە پیاهەڵدانی، هەڵبەت پیاهەڵدانی بۆ لێدانەکەی کاتیا نا، بەڵکوو پیاهەڵدانی هایدن و بەتایبەتی بۆ ئەو پارچە بچووکەی ئەم لێی دا. ئاشکرا بوو کە کاتیا گەلێک خۆشحاڵ بوو، و زۆر بەدڵخۆشی و بەبایەخەوە گوێی بۆ پیاهەڵدانەکانی ڤێلچانینۆڤ گرتبوو، دڵخۆشییەکەی ئەمیش بۆ خۆی نەبوو، بەڵکوو بۆ ئەو پیاهەڵدانانە بوو، کە بەسەر هایدندا هەڵی دەدا، ڤێلچانینۆڤ چیی تر نەیدەتوانی بە چاوێکی هاوڕێیانەوە لەو کچە بڕوانێت، بەڵکوو بە شێوازێکی تر لێی دەڕوانی و لە دڵی خۆیدا دەیوت، "ئاهـ چەند کچێکی شیرینیت!" ئەم هەستە بەڕوونی لە چاوەکانی ڤێلچانینۆڤدا دەدرەوشایەوە - هەموویان زۆر بەئاشکرا ئەم هەستەیان لە چاوەکانی ڤێلچانینۆڤدا بەدی کرد، بەتایبەتی خودی کاتریناڤیدۆسیڤنا.

* هایدن: جۆزێف هایدن، ئاوازدانەری میوزیکی نەمساییە لە ساڵی ١٧٣٢ لە شاری ڕۆژاو لە نەمسا لەدایک بووە، لە ساڵی ١٨٠٩ کۆچی دوایی کردووە.

ڤێلچانینۆڤ لە کاتێکدا ڕووی کردبووە شووشەی ئەو دەرگایەی دەچووەوە سەر باڵکۆنییەکە و بەسەر دەرەوەیدا دەڕوانی، کتوپڕ وتی، "چ باخێکی دڵفڕێن و جوانتان هەیە، پێتان چۆنە هەموومان بەیەکەوە بچینە ناو باخەکەوە؟"

"با بڕۆین، با بڕۆین!"

هەموویان بەوپەڕی شادییەوە دەستیان کرد بە قریشکوهوڕ، وەک ئەوەی ڤێلچانینۆڤ پەیی بە هەست و خواستیان بردبێت. تا دەوروبەری نانی شێوان، هەموویان لەناو باخەکەدا پیاسەیان کرد. خاتوو زاخلیبینین، هەرچەندە لەمێژ بوو دەیویست بڕوات و پشوویەک بدات، بەڵام نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و لەگەڵ ئەوان، ئەویش چووە دەرەوە، بەڵام ئاقڵانە چوو لەناو باڵکۆنییەکەدا دانیشت بۆ ئەوەی پشوو بدات، بەڵام یەکسەر کەوتە وەنەوزدان. لەناو باخەکەدا پەیوەندییە هاوڕێیانەکەی نێوان ڤێلچانینۆڤ و کچەکان ئاراستەیەکی ئاڵۆزتری وەر گرت، ڤێلچانینۆڤ سەرنجی دا چەند کوڕە لاوێکی سەر بە ڤێلاکانی تریش خۆیان گەیاند بە ئەمان و تێکەڵیان بوون؛ یەکێکیان دیار بوو خوێندکاری زانکۆ بوو و ئەوەی تریشیان دیار بوو کە خوێندکاری دواناوەندی بوو. هەر خێرا ئەم لاوانە هەریەکەیان بەرەو لای دنکەکەی خۆی کشا، شتێکی ڕوون بوو کە لەبەر خاتری ئەوان هاتبوون، سێیەمینیان، گەنجێکی قژبژ و زۆر عەبوس بوو، تەمەنی دەوروبەری بیست ساڵێک دەبوو، چاویلکەیەکی شینی قەبەشی لەچاو کردبوو، بەمرومۆچییەوە بەخێرایی کەوتە چرپەچرپ لەگەڵ ماری نیکیتیشنا و نادیادا. بە تووک و نەفرەتەوە لە ڤێلچانینۆڤی دەڕوانی، وەک ئەوەی

بە ئەرکی سەرشانی خۆی بزانێت، کە بەوپەڕی کینەوە لە ڤێلچانینۆڤ بڕوانێت. هەندێک لە کچەکان پێشنیاریان کرد، کە باشترە یارییەک بکەن. ڤێلچانینۆڤیش لێی پرسین، کە خۆیان زیاتر چ جۆرە یارییەک دەکەن، ئەوانیش تێکڕا بەیەکەوە وتیان، کە چەند جۆرە یارییەک دەکەن، هەروەها یاریی پێشکەوتنیش، بەڵام لە ئێواراندا یاریی پەندبازی دەکەن، یاسای ئەم یارییەش ئەوەیە، کە هەمووان دەبێت دابنیشن و تەنها یەک دانە نەبێت، کە لەسەریەتی پەندەکە هەڵبهێنێت، دەبێت بۆ ساتێک لە کۆمەڵەکە دوور بکەوێتەوە، پاشان ئەوانی تر پەندێک هەڵدەبژێرن - بۆ نموونە، "بۆ ڕیشی چوو، سمێڵیشی نایە بانی." کاتێک ئەوەی دوور خرابووەوە، سەرلەنوێ بانگ دەکرێتەوە، هەریەکێک بە سەرەی خۆی دەبێت ڕستەیەک بۆ ئەو کەسە بڵێت، کە دیاری کراوە بۆ ئەوەی پەندەکە هەڵبهێنێت. بۆ نموونە، یەکێک لەو کەسانەی دانیشتووە ڕستەیەک دەڵێت، کە پێشتر ئامادەی کردووە و وشەی "ڕیش"ی تێدایە، بە هەمان شێوە کەسی دووەمیش ڕستەیەک دەڵێت، کە وشەی "سمێڵ"ی تێدا بێت، ئیتر بەم شێوەیە پرۆسەکە بەردەوام دەبێت، ئیتر دەبێت ئەو کەسە بە هۆی وشەی ناو ڕستەکانەوە پەندەکە بدۆزێتەوە و هەڵی بهێنێت.

ڤێلچانینۆڤ وتی، "پێدەچێت یارییەکی زۆر خۆش بێت."

دوو یان سێ دەنگ دەستبەجێ لە شوێنی خۆیانەوە هاواریان لێ بەرز بۆوە و وتیان، "کورە نەوەڵڵا، قۆڕترین یارییە!"

کتوپڕ نادیا ڕووی کردە ڤێلچانینۆڤ، وتی، "هەندێک جار یاریی شانۆییش دەکەین. ئەو درەختە ئەستوورە دەبینیت،

ئەوەی کە چەند کورسییەکی لە چواردەوەر دانراوە؟ لەپشت ئەو درەختەوە تەختەی شانۆییی لێیە و ئەکتەرەکان لەوێدا دادەنیشن و هەریەکە بە دڵی خۆی یەکێک لەم ڕۆڵانە دەبینێت، پاشا شاژن، شازادە، پاڵەوانی لاو، هەریەکێک کە کارەکتەرەکەی خۆی هەڵبژارد، دێتە سەر تەختی شانۆکەو هەرچی بێت بە مێشکیا، بە دڵی خۆی دەیڵێت، ئەمە يارييەکەیە."

ڤێلچانینۆڤ دیسانەوە وتیەوە، "بەڵام پێدەچێت ئەمەیان زۆر خۆش بێت."

"کورە نەوەڵڵا، بەس خۆش نییە، يارييەکی وشک و تاقەتپڕووکێنە! هەڵبەت لە سەرەتادا زۆر خۆش دەست پێ دەکات، بەڵام لە کۆتاییدا هەمیشە شتێکی پڕوپووچ و بێمانای لێ دەر دەچێت، چونکە کەس نازانێت چۆن کۆتاییی پێ بهێنێت؛ ڕەنگە ئەگەر تۆ بەشداریی تێدا بکەیت، گەلێک چێژبەخشتر بێت. هەرچەندە کە ئێمە پێمان وا بوو تۆ تەنها هاوڕێی پاڤێل پاڤلۆڤیچیت و ڕەنگە هەر وەکوو ئەو بیت، بەڵام تۆ بەتەواوی جیاوازیت، چونکە ئەو هەر خەریکی فشەکردنە. بەراستی من گەلێک خۆشحاڵم کە تۆ هاتیت... ئەویش تەنها لەبەر یەک شت..."

ئەمەی وت و بە چاوێکی ماناداروەوە لە ڤێلچانینۆڤی ڕوانی، لەو ڕوانینانەی کار لە دڵ و بیری پیاو دەکەن، پاشان یەکسەر خۆی گەیاندە لای ماری نیکیتیشنا.

یەکێک لە هاوڕێی کچەکان، کە ڤێلچانینۆڤ پێشتر زۆر بەدەگمەنیش بەرچاوی نەکەوتبوو، کچێک کە تاقە وشەیەکیش چییە لەگەڵیدا نەوتبوو، وتی، "ئەم ئێوارەیە یاریی پەندبازی دەکەین."

پاشان هەر ئەو کچە بەهێواشی چرپاندی بە گوێی ڤێلچانینۆڤدا، وتی، "ئەوان هەموویان بەتەمان پاڤێل پاڤلۆڤیچ بکەن بە گاڵتەجاڕ، بە هەمان شێوە تۆش دەبێت بەدڵنیاییەوە بەشدار ببیت لەو بەزمەدا."

یەکێکی تر لە کیژەکان، کە کیژێکی پرچخورمایی بوو، ڕوخساری بە هۆی ڕاکەڕاکی زۆری لەبەر تیشکی خۆر شڵ* ببوو، خوا خۆی نەبێت، کەس نازانێت چۆن لەپڕ خۆی فڕێ دایە ناو قسەکانەوە، تا ئەو ساتەش، ڤێلچانینۆڤ چاوی پێی نەکەوتبوو، بە دەنگێکی هاوڕێیانەوە وتی، "بەڕاستی زۆر باش بوو کە ئێوە هاتن، هەموومان زۆر جاڕز ببووین."

بێئۆقرەییەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ، سات لە دوای سات زیاتر و زیاتر دەبوو. لەناو باخەکەدا ڤێلچانینۆڤ هاوڕێیەتییەکەی لەگەڵ نادیادا پتەوتر کردبوو، نادیاش چیی تر لە ژێرەوە تەماشای ڤێلچانینۆڤی نەدەکرد، هەر وەک لە پێشتردا وای دەکرد. پێدەچوو چیی تر بە چاوێکی لۆمەکەرانەوە لە ڤێلچانینۆڤ نەڕوانێت، بەڵکوو بە ڕوویدا پێدەکەنی و لە خۆشیدا بە قونەقون دەڕۆیی، دەیزریکاند، تەنانەت دوو دانە جاریش بەتوندی دەستەکانی ڤێلچانینۆڤی گرت، لەڕادەبەدەر دڵخۆش بوو، نادیا بەردەوام بوو لەوەی چیی تر کەمترین سەرنجێکی بێبایەخیش چییە، بە پاڤێل پاڤلۆڤیچی نەدات، وا هەڵسوکەوتی دەکرد، کە ئەسڵەن ئاگای لەوە نییە کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەو شوێنەدا بوونی هەیە یاخود نا. ڤێلچانینۆڤ یەکسەر هەستی کرد کە بێ هیچ گومانێک پیلانێک لە دژی پاڤێل پاڤلۆڤیچ دانراوە.

---

* شڵ: سووری کاڵی پنۆک پنۆک؛ بەڵەکی سووروسپی.

نادیا و دەستەیەک لە کچەکانی تر ڤێلچانینۆڤیان بردە لایەکەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە دەستەیەکی تر لە کچەکانی تر پاڤێل پاڤلۆڤیچیان بە پاساوی جۆراوجۆر هەڵفریواند و بەرەو ئاراستەیەکی جیاوازتریان برد، بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەرچۆنێک بێت، خۆی لەدەستیان قوتار کرد و بە هەرچیی خێراییی خۆی هەیە، ڕای کرد بۆ لای ئەوان - بۆ لای ڤێلچانینۆڤ و نادیا، کتوپڕ سەرە ڕووتاوەکەی خستە نێوانیانەوە و بە کونجکاوییەکی تەواوەوە گوێی بۆ قسەکانیان شل کرد، تا بزانێت چی دەڵێن. چیی تر نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ ببێت، ساویلکەییەکەی و هەڵسوکەوتەکانی گەیشتبووە ئاستێک، کە هەندێک جار بەتەواوی جێگەی سەرنج بوو. پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەرچەند زیاد لە جارێک تەقەلالای ئەوەی دا یەک جاری تریش سەرنجی ڤێلچانینۆڤ بەلای کاترینا فیدۆسیڤنا ڕابکێشێت، بەڵام بێسوود بوو. هەنووکە کاتریناش پەیی بەوە بردبوو، کە ڤێلچانینۆڤ لەبەر خاتری ئەو نەهاتووە، بەڵکوو زیاتر دڵی بە نادیا دەکرێتەوە، بەڵام هەستەکانی، هەر وەک هەموو کاتەکانی تر، پڕ بوو لە جوانی، سەرشار بوو لە شادی. پێدەچوو زۆر بەسادەیی تەنها دڵی بە ئەوە خۆش بێت، کە شانبەشان لەنێوانیاندا ڕێ دەکات، هەروەها گوێ لەو قسانە دەگرێت، کە میوانە نوێیەکەیان دەیانڵێت، ئەو داماوە هێندە کەسێکی قسەزانیش نەبوو بتوانێت بە زیرەکیی خۆی بەشداریی گفتوگۆکەشیان بکات.

ڤێلچانینۆڤ بە دەنگێکی نزم بە نادیای وت، "کاترینای خوشکت چەند کچێکی خوێنشیرین و لەبەردڵانە!"

نادیا بە جۆشوخرۆشەوە وەڵامی دایەوە، "کاتیا! هیچ کەسێک هێندەی ئەو میهرەبان نییە. ئەو وێنەی فریشتەیە بۆ هەموومان. لە خۆشەویستیدا دەیپەرستم."

دواجار لە کاتژمێر پێنجدا خوانی شێوان دانرا، ئاشکرا بوو کە خوانەکە سادە و ئاسایی نەبوو، بەڵکوو لەبەر خاتری میوانەکان پارەیەکی باشیان بۆ خوانەکە بەخەرج دابوو. لەسەر مێزەکە جگە لەو خۆراکە ئاساییەی بە شێوەیەکی باو ڕۆژانە دەخورێت، دوو-سێ جۆر خۆراکی تریش دانرابوو، یەکێک لەو جۆرە خواردنانە هێندە سەیر بوو، کە کەسیان تەنانەت نەیدەتوانی ناوێکی بۆ بدۆزێتەوە. جگە لەو مەییە ئاساییەی ڕۆژانە دەیانخواردەوە، بوتڵێک شەرابی تۆکەییش* لەسەر مێزەکە دانرابوو، شتێکی ئاشکرا بوو کە لەبەر دڵی میوانەکان کرِدرابوو لە کۆتاییی خوانەکەشدا، کە نەدەزانرا بە چ هۆکارێک، شەمپانیاشیان هێنا. زاخلیبینیی پیر پەرداخێکی زۆر گەورەی هەڵگرتوو، بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی سەرمەست ببوو، ئامادە بوو بە هەرشتێک کە لە زاری ڤێلچانینۆڤ بێتە دەرێ، بە کامی دڵی خۆی پێبکەنێت.

لە کۆتاییدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ جڵەوی خۆی لەدەست دا. هەستی چاولێکەری لەناکاو وای لێ کرد ئەمیش بە هەمان شێوە دەست بکات بە نوکتەکردن، لەوسەری مێزەکەوە، لەو شوێنەدا کە لەتەنیشت خاتوو زاخلیبینییەوە دانیشتبوو، لەناکاو قاقای پێکەنینێکی بەرز لەلایەن کچە خوێنشیرینەکانەوە بەرز بۆوە.

---

* تۆکەی: جۆرە ترێیەکی شیرینی دەنکزلە دەکرێت بە شەراب، لە ناوچەی تۆکەی لە هەنگاریا دەڕوێت شەرابەکەشی شەرابێکی شیرینە و هەر لەم جۆرە ترێیە دروست دەکرێت.

چوار بۆ پێنج کچ لە کچەکانی زاخلیبینین بەیەکەوە هاواریان کرد، "بابە، بابە، پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان شێوە نوکتەیەکی کرد! ئەو دەڵێت کە ئێمە خاتوونگەلێکین دڵی هەمووان خاپوور دەکەین..."

زاخلیبینینی پیر بەهێمنییەوە، لە کاتێکدا بەزەردەخەنەوە ڕووی کردبووە پاڤێل پاڤلۆڤیچ وەک ئەوەی پشتگیریی بکات و خۆی ئامادە بکات بۆ نوکتەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەڵامی دایەوە، "ئێ، ئێ! کەواتە ئەویش بە هەمان شێوە دەزانێت نوکتە بکات! پێم بڵێن بزانم نوکتەکەی چی بوو؟"

"ئەو وتی کە "ئێمە خاتوونگەلێکین، دڵی هەمووان خاپوور دەکەین."

"بە-بەڵێ، زۆر باشە، ئەی دواتر؟"

پیرەپیاو لە هیچ تێنەگەیشت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، زیاتر زەردەخەنەی دەکرد و هەر چاوەڕوانیش بوو.

"ئۆۆی بابە لەدەست تۆ، چەند مرۆڤێکی ماندووکەریت! بۆچی تێناگەیت، یەکەم خاتوون پاشان خاپوور؛ ئێ خاتوون لەسەر کێشی خاپوور، خاتوونەکان، ئەوانەن کە هەمووان خاپوور دەکەن..."

پیرە پیاو بەسەرسامی و بە دەنگێکی لەسەرخۆ وتی، "ئە-ها! ئمممم، بەڵێ، هیوادارم جاری داهاتوو نوکتەیەکی بەهێزتر بکات!"

پاشان پیرەپیاو کە وای وت، دای لە قاقای پێکەنین.

ماری نیکیتیشنا بەتەوسەوە و بەدەنگێکی بەرز وتی، "پاڤێل پاڤلۆڤیچ، ناکرێت لە یەک کاتدا هەرچی بەهرەیە تێتدا بێت."

پاشان ماری نیکیتیشنا قیژاندی و لەسەر کورسییەکەی

بازی دا، "کورە ئەی هاوار، فریای بکەون! وا بزانم درک پەڕییە قورگی."

یەکسەر بوو بە هەراوهوریا، ئەمە ڕێک ئەو شتە بوو، کە ماری نیکیتیشنا خوازیاری بوو. لە ڕاستیدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ تەنها پەرداخێکی پڕ لە عەرەقی بەپەلە خواردبووەوە، ئەمەش تەنها بۆ ئەوەی تەریقبوونەوەکەی بشارێتەوە، بەڵام ماری نیکیتیشنا کەوتبووە سوێندخواردن و جاڕدان، کە ئەوەی ئەو بە هەردوو چاوی خۆی بینیبووی، درکی ماسی بووە، زۆر جاریش خەڵکی بە هۆی ئەوەوە گیان لەدەست دەدەن.

یەکێک قیژاندی، "بکێشن بە پشتیدا!"

پیرەپیاویش جەختی لەو قسەیە کردەوە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد، "ڕاست دەکات، ئەمە باشترین چارەسەرە!"

خۆبەخشەکان بەپەرۆشەوە خۆیان ئامادە کرد بۆ هەستان بەم کارە؛ ماری نیکیتیشنا و کچە قژخورماییەکە "کە ئەویش بانگهێشت کرابوو بۆ خواردنی نانی شێوان،" دواجار خودی دایەش، کە بە شێوەیەکی سامناک زەندەقی چووبوو، هەمووان دەیانویست بکێشن بە پشتی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەپەلە خۆی لە مێزەکە دوور خستەوە، هەوڵی دا خۆی لەدەستیان قوتار بکات بۆ ماوەی یەک خولەکی تەواو هەوڵی ئەوەی لەگەڵدا دان، تا تێیان بگەیەنێت کە هۆکاری کۆکەکەی بە هۆی ئەوەوە بووە، کە زۆر بەپەلە عەرەقەکەی خواردۆتەوە و ئەمەش بۆتە هۆکاری کۆکەکەی و بەم زووانەش ئەگەر وازی لێ بهێنن، کۆکەکەی خۆبەخۆ کۆتایی دێت، ئیتر هەمووان بۆیان دەر کەوت، کە هەموو ئەمانە فێڵ و مەکربازیی ماری نیکیتیشنا بووە.

"بەڕاستی کچێکی مەکربازیت...!"

خاتوو زاخلیبینین ویستی ئەم قسەیە بە شێوەیەکی سەرزەنشتکەرانە بە ماری نیکیتیشنا بڵێت، بەڵام نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات، لەپڕ بە شێوەیەکی شێتانە دای لە قاقای پێکەنین، کە زۆر بەدەگمەنیش نەبووایە، هەرگیز بەو شێوەیە پێنەدەکەنی، ئەم پێکەنینە، بە جۆرێک لە جۆرەکان، بەتەواوی هەستی وروژاندبوو.

دوای نانی شێوان، هەموویان بۆ قاوەخواردنەوە چوونە باڵکۆنییەکە. زاخلیبینینی پیر لە کاتێکدا بەوپەڕی دڵخۆشییەوە لەناو باخەکەی دەڕوانی بەهێمنی دڵی چووبوو بە جوانیی سروشتدا، بەهێمنی وتی، "ئەم ڕۆژانەی کە هەمانە، چەند جوان و دڵگیرن، تەنها ئەگەر کەمێک بارانیش بباریبایە، ئەوا زۆر دڵگیرتر دەبوو."

لە کاتێکدا هەستا و دەیویست بچێتە دەرەوە، بە شێوەیەکی هاوڕێیانە بەهێواشی دەستێکی کێشا بە شانی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا و ئەمەشی خستە سەر قسەکانی، "جەوی خۆتان وەر بگرن و شادی بکەن، هیوای کاتێکی خۆشتان بۆ دەخوازم، لەپەنای خودادا بن! هەروەها تۆش، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، بە هەمان شێوە، ئارەزووی کاتێکی خۆشت بۆ دەخوازم."

کاتێک سەرلەنوێ هەمووان جارێکی تر چوونەوە دەرەوە بۆ ناو باخەکە، کتوپڕ پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەهەڵەداوان بەرەو لای ڤێلچانینۆڤ غاری دا و قۆڵی گرت و بێئارامانە بەهێواشی چرپاندی، "دەقەیەک ڕابوەستە!"

پاشان هەردووکیان چوونە پەنایەکی چۆڵەوە و پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەلالەپەتیوە، بەوپەڕی تووڕەییەوە، لە کاتێکدا قۆڵی

ڤیلچانینۆڤی بەتوندی گرتبوو، چرپاندی، "نەخێر، ئەم جارەیان دەبێت بمبووریت، نەخێر، ئەم جارەیان هەرگیز کۆڵ نادەم..."

ڤیلچانینۆڤ، کە لە سەرسامیدا چاوەکانی ئەبڵەق ببوون، پرسیی، "چی؟ چی؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بێ ئەوەی بتوانێت هیچ قسەیەک بکات، چاوی بڕیبووە ڤیلچانینۆڤ، لێوەکانی دەلەرزین، بەتووڕەییەوە زەردەخەنەی دەکرد.

لە دوورەوە دەنگی هاوارکردنی بێئۆقرانەی کچەکانیان هاتە بەرگوێ، کە هاواریان دەکرد، "بۆ کوێ ڕۆشتن؟ لەکوێن؟ هەموو شتێک ئامادەیە!"

ڤیلچانینۆڤ شانەکانی هەڵتەکاند و گەڕایەوە بۆ لای دەستەکە. پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان شێوە بەدوای ڤیلچانینۆڤدا ڕای کرد.

ماری نیکیتیشنا بە ڤیلچانینۆڤی وت، "گرێو دەکەم داوای دەسەسڕی لێ کردوویت، جارەکەی تریش لەبیری چووبوو دەسەسڕ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت."

کچی پێنجەمی زاخلیبینین خۆی فڕێ دایە ناو مەسەلەکەوە و وتی، "هەمیشە لەبیری دەچێت لەگەڵ خۆیدا هەڵی بگرێت!"

هەندێک دەنگ هاوارییان لێ بەرزبۆوە، "دەسەسڕەکەی لەبیر چووە، پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەسەسڕەکەی لەبیر چووە، دایە، پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەسەسڕە گیرفانییەکەی لەبیرچووە، دایە، پاڤێل پاڤلۆڤیچ دیسانەوە تووشی هەڵامەت بۆتەوە!"

خاتوو زاخلیبینین بە دەنگێکی هێواش و میوزیکی وتی، "ئەی باشە بۆچی زووتر قسەی نەکرد! چییە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، ئەڵێی شەرم دەکەیت! هیچ شتێک وەک سەرمابوون ترسناک

نییە، ناکرێت پشتگوێ بخرێت، بەڵام خەمت نەبێت هەر ئێستا دەسەسڕێکت بۆ ئەنێرم."

کاتێک ویستی بڕوات و دەسەسڕەکە بهێنێت، گەلێک خۆشحاڵ بوو بەوەی بیانوویەکی دەست کەوتووە تا بگەڕێتەوە بۆماڵەوە، بەدەم ڕێگەوە ئەمەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد، "باشە مەسەلە چییە هەمیشە تووشی هەلامەت دەبێت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هاواری کرد بەشوێن خاتوو زاخلیبینیندا، "دوو دانە دەسەسڕم پێیە، هەروەها هەلامەتیشم نییە!"

بەڵام پێدەچوو خاتوون گوێی لێ نەبووبێت، دوای تۆزێک، لە کاتێکدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەهێواشی خۆی گەیاندەوە بە ئەوانی تر، هەوڵی ئەدا خۆی لە ڤێلچانینۆڤ و نادیا زیاتر نزیک بکاتەوە، خزمەتکارێکی ئافرەتیش بە هەڵەداوان و هەناسەبڕکێ خۆی گەیاندنێ و لەگەڵ خۆشیدا دەسەسڕەکەی بۆ هێنابوو.

کچەکان لە هەموو لایەکەوە هاواریان کرد، "پەندبازی، گەمەی پەندبازی!"

وەک ئەوەی چاوەڕوانی ڕوودانی شتێکی سەرسووڕهێنەر بن لە گەمەی پەندبازی.

جێگەیەکی گونجاویان دۆزییەوە و لەسەر کورسییەکانیان لێی دانیشتن، یەکەم کەس ماری نیکیتیشنا دەستنیشان کرا بۆ ئەوەی پەندەکان هەڵبهێنێت، بۆیە داوایان لێ کرد تا پێی بکرێت، لە دەستەکە دوور بکەوێتەوە و گوێش نەگرێت، لە ئامادەنەبوونی ماریدا پەندێکیان هەڵبژارد و هەروەها وشەکانیشیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد.

ماری نیکیتیشنا گەڕایەوە و یەکسەر پەندەکەشی هەڵهێنا. پەندەکەش ئەمە بوو، "کاری نیوەناچڵ، نەکردنی باشترە."

لەدوای ماری نیکیتیشنا، نۆرەی ئەو لاوە قژبژە بوو کە چاویلکەیەکی قەبەی شینی لەچاودا بوو، لەگەڵ ئەمدا خۆپاریزیی زیاتریان بەکار هێنا - داوایان لەم کرد بچێتە ژێر کەپرەکە و ڕووش بکاتە پەرژینی باخەکە. کوڕەی لاو بەوپەڕی پەستییەوە، کە وا هەستی دەکرد سووک کراوە، هەموو ئەو فەرمانانەی جێبەجێ کرد کە لێیان داوا کردبوو، وا دەر دەکەوەت هەست بکات لە ڕووی ئەخلاقییەوە ئەتکی نامووسیان کردبێت. کاتێک بانگیان کردەوە، نەیتوانی هیچ هەڵبهێنێت، بەوردی چاوی بڕیبووە یاریزانەکان، زیاتر لە دوو جار گوێی لەو شتانە گرت، کە ئەوان پێیان وت، کاتێکی زۆری بە بیرکردنەوەوە تێپەڕاند، زۆر پەست بوو، چونکە هیچی نەزانی. ئەوانیش تەریقیان کردەوە.

پەندەکە ئەمە بوو، "نوێژکردن بۆ خودا و خزمەتکردنی تزار هیچیان بێ پاداشت نابێت."

کوڕی لاو لە کاتێکدا دەگەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، گەلێک تووڕە بوو، بە ڕق و تووڕەییییەوە قیڕاندی، "بەڕاستی پەندێکی هیچوپووچ بوو!"

هەندێک دەنگ هاواریان کرد، "ئاهـ ئەمە چەند بێزارکەرە!"

ڤێلچانینۆڤیش نۆرەی هات و دوور کەوتەوە، تەنانەت ئەم زۆر زیاتریش دوور کەوتەوە، بەڵام ئەویش هەر بە هەمان شێوە، سەرکەوتوو نەبوو لە پێدانی وەڵامی دروست."

دەنگێکی زیاتر بەرز بۆوە، "ئاهـ ئەمە چەند بێزار کەرە!"

نادیا وتی، "زۆر باشە، ئێستا نۆرەی منە، من دەچمە دەرەوە."

هەموویان زۆر خرۆشابوون، بە جارێک هاواریان کرد،

"نەخێر، نەخێر، ڕێ بدە با پاڤێل پاڤلۆڤیچ بچێتە دەرەوە، نۆرەی پاڤێل پاڤلۆڤیچە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچیان بەرەو لای دوورترین سووچی پەرژینی باخەکە ڕێبەری کرد، دەبوو بە پێوە ڕووبەڕووی پەرژینەکە ڕابوەستێت، لەبەر ئەوەی تەماشای چواردەوری نەکات، کچە قژخورماییەکەیان لەگەڵدا ناردبوو، تا چاودێریی بکات. پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەرلەنوێ متمانەبەخۆبوونەوەکەی بۆ گەڕابۆوە، تا ڕادەیەکیش شادمانییەکەشی گەڕابۆوە، سووریش بوو لەسەر ئەوەی ئەرکەکەی بەخێرایی و بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە ئەنجام بدات، چاوی بڕیبووە پەرژینەکە و زاتی ئەوەی نەدەکرد ئاوڕ بداتەوە. کچە قژخورماییەکە لە دووریی بیست هەنگاوێک لەپشت پاڤێل پاڤلۆڤیچەوە ڕاوەستابوو، پاسەوانیی لێ دەکرد، بەڵام زیاتر لە یاریزانەکانی ترەوە نزیکتر بوو، کە لەژێر ساباتەکەدا بوون، بە جۆرێک لە خۆشحاڵییەوە ئاماژەی لەگەڵدا دەگۆڕینەوە، شتێکی ڕوون بوو کە هەموویان بەوپەڕی شەیداییەوە چاوەڕوانی ڕوودانی شتێک بوون، شتێک کە هەموان چاوەڕوانی ڕوودانی بوون. لەناکاو کچە قژخورماییەکە .دەستەکانی وەک ئاماژە بەرەو یاریزانەکانی ژێر ساباتەکە جووڵاند، دەستبەجێ هەمووان لە شوێنی خۆیان ڕاست بوونەوە و هێندە بەخێرایی ڕایان کرد، خەریک بوو ملی خۆیان بشکێنن.

نزیکی دوانزە دانە لە کچەکان لە ترسی ڕانەکردنەکەی ڤێلچانینۆڤ بەسرتوخورتەوە چرپاندیان، "ڕابکە، ڕابکە، دەی تۆش ڕابکە!"

ڤێلچانینۆڤ، کە بەخێرایی شوێنیان کەوتبوو، لێی پرسین،

"چی بووە؟ چی ڕووی داوە؟"

"شششششش، هاوار مەکە! لێ بگەڕێ با ئەو بۆخۆی بەپێوە لەوێ بمێنێتەوە و بەدیار پەرژینەکەوە ئەبڵەق ببێت، ئێمەش هەموومان تێی دەتەقێنین. ببینە، ئەها، تەنانەت ناستیاش ڕادەکات."

کچە قژخورماییەکە، ناستیا، بە تالووکە غاری دەدا، بە شێوەیەک دەستەکانی ڕادەوەشاند، وەک ئەوەی شتێکی لەڕادەبەدەر نائاسایی ڕووی دابێت. دواجار هەموویان گەیشتنە لاکەی تری باخەکە، گەیشتنە ئەو شوێنەی ئەستێلەکەی لێ بوو و کەوتبووە کۆتاییی باخەکە.

کاتێک ڤێلچانینۆڤ گەیشتە ئەوێ، بینیی کاترینا فیدۆسیێڤنا بەتوندی خەریکی مشتومڕە لەگەڵ ئەوانی تردا، بەتایبەتی لەگەڵ نادیا و ماری نیکیتیشنا.

نادیا لە کاتێکدا ماچی کاترینای دەکرد، وتی، "کاتیا گیان، ئازیزەکەم، تکایە تووڕە مەبە!"

"زۆر باشە، هیچ بە دایک نالێم، بەڵام من دەڕۆم، لەبەر ئەوەی ئەمە کارێکی زۆر ناشایستەیە لەگەڵ ئەو پیاوەی دەکەن. ئەبێت ئێستا ئەو پیاوە داماوە لەلای پەرژینەکە هەست بە چی بکات!"

کاتێک وای وت، لێیان جیا بۆوە و ڕۆیشت، هەر بەڕاستی کاتیا بەزەییی پێدا دەهاتەوە، بەڵام ئەوانی تر هەر وەک پێشتر چۆن بوون، هەر بەو شێوەیە مانەوە، بێبەزەیی و دڵڕەق، پاشان هەموویان بە پێداگری و ڕووگرژییەوە داوایان لە ڤێلچانینۆڤ کرد، کە کاتێک پاڤێل پاڤلۆڤیچ گەڕایەوە، هیچ سەرنجی نەدات و وا خۆی دەر بخات، وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت.

کچە قژخورماییەکە بەشاگەشکەییەوە هاواری کرد، "وەرن با هەموومان یاریی پێشبڕکێ بکەین!"

نزیکەی چارەکەکاتژمێرێکی پێ چوو، تا پاڤێل پاڤلۆڤیچ جارێکی تر خۆی گەیاندەوە بە کۆمەڵەکە. گومانی تێدا نەبوو، کە دوو لەسەر سێی ئەو کاتە ڕووبەڕووی پەرژینەکە بەپێوە، وەک بت وەستابوو. یارییەکە لەوپەڕی جموجووڵدا بوو، هەموو شتێک بەباشی تێدەپەڕی. هەمووان بەوپەڕی کەیفخۆشییەوە دەیانقیژاند.

پاڤێل پاڤلۆڤیچی لە تووڕەییدا ئاگری لێ دەباری، هەر کە گەیشتە جێ، دەستبەجێ خۆی گەیاندە لای ڤێلچانینۆڤ و سەرلەنوێ قۆڵی ڕاکێشا، وتی، "نیودەقە بە یارمەتیت!"

"ئەی هاوار... دیسانەوە بەم نیودەقانە چیت لە گیانی من دەوێت!"

جارێکی تریش لەپشتیەوە هاواریان کرد، "دیسانەوە داوای دەسەسڕ دەکات!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە لە تووڕەییدا دانەجیرەی پێ کەوتبوو، وتی، "هەبێت و نەبێت، ئەمەی ئەمجارە ئیشی جەنابت بووە، هەموو ئەمانە لەژێر سەری تۆدایە..."

ڤێلچانینۆڤ خێرا پەڕییە ناو قسەکانیەوە و زۆر بەهێمنی ئامۆژگاریی کرد و داوای لێ کرد ئاسایی هەڵسوکەوت بکات و تووڕە نەبێت، ئەگینا ئەوان زیاتر سەر دەخەنە سەری. "ئەوان بۆیە سەر دەخەنە سەرت، لەبەر ئەوەی لە کاتێکدا ئەوان هەموویان جەوی خۆیان وەر گرتووە و شادی دەکەن، کەچی جەنابیشت دەموچاوت ترشاندووە بەسەر یەکدا!" ئەوەی بووە مایەی سەرسامیی ڤێلچانینۆڤ، ئەوە بوو کە ئامۆژگارییەکانی

بە شێوەیەکی زۆر کاریگەر کاری لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ کرد، یەکسەر تووڕەبوونەکەی دامرکایەوە، لە ڕاستیدا بە هەستێکی تۆبەکارانە و پەشیمانانەوە، وەک ئەوەی هەست بە خەتا بکات، سەرلەنوێ خۆی لەگەڵ کۆمەڵەکەدا یەک خستەوە و ملکەچانە بەشداریی یارییەکەی کرد. دوای ئەوەی ماوەیەک بەتەنیا بەجێیان هێشتبوو، بۆ ئەوەی حەقی بۆ بکەنەوە، کچەکان بەنەرمونیانی لەگەڵیدا جووڵانەوە، بە شێوەیەک یارییان لەگەڵدا دەکرد، هەر وەک ئەوانی دیکە، بەبێ جیاوازی، پێش ئەوەی نیوکاتژمێرێک تێپەڕ ببێت، سەرلەنوێ ڕۆحێکی نوێی هاتەوە بەبەردا و شادیی بۆ گەڕایەوە. لە تەواوی یارییەکەدا ئەگەر بیویستایە یەکێک هەڵببژێرێت و بیکات بە هاوبەشی خۆی، ئەوە هەمیشە کچە قژخورماییە غەیانەکەی هەڵدەبژارد، یاخود یەکێک لە کچەکانی زاخلیبینینی هەڵدەبژارد. بەڵام ئەوەی کە هێشتاش لە هەموو شتێک زیاتر ڤێلچانینۆڤی حەپەساندبوو، تێبینیی ئەوەی کرد، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ زاتی ئەوەی نەدەکرد قسە لەگەڵ نادیادا بکات، لەگەڵ ئەوەی بەردەوام بە دەوروخولیشیدادەهات و دەچوو. هەرچۆنێک بێت، پێدەچوو پاڤێل پاڤلۆڤیچ خۆی ئەوەی قبوڵ بووبێت، کە ئاوا لەلایەن نادیاوە پشتگوێ خراوە و بە چاوێکی سووکیش لێی دەڕوانێت، ئەمیش وا ڕەفتاری دەکرد، وەک ئەوەی شتەکە زۆر سروشتییە و ئەسڵەن کێشەش نییە! بەڵام لە کۆتاییی یارییەکەدا، بەزمێکی تریشیان بەسەریدا هێنا.

یارییەکە یاری چاوشارکێ بوو. بەڵام هەرچۆنێک بێت، ئەو کەسەی خۆی حەشار دەدا، ڕێگەپێدراو بوو شوێنەکەی خۆی بگۆڕێت و لە هەرشوێنێکی باخەکە پێی خۆش بووایە،

دەیتوانی خۆی تێدا حەشار بدات. لە کاتێکدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەناو بیشەڵانێکی چڕدا بەباشی خۆی شاردبۆوە، کەچی لەپڕ بیرۆکەی ئەوە هات بە خەیاڵیدا، کە لەو بیشەڵانە بێتە دەرەوە و بەرەو ناو خانووەکە تێی بتەقێنێت. دەنگی ئەوە بەرز بۆوە، کە بینراوە، بەڵام بەدزییەوە و بەخێرایی بە پلیکانەکاندا سەر کەوتە سەرەوە بۆ نهۆمی یەکەم، شوێنێکی لەتەنیشت بۆفییەکەوە پێ دەزانی، کە دەیتوانی لەوێدا خۆی حەشار بدات. بەڵام کچە قژخورماییەکە شوێنی کەوتبوو، بەدزییەوە لەسەر نووکی پەنجە چووە بەردەم دەرگاکە و بەهێواشی دەرگاکەی لەسەر کلیل دا. دەستبەجێ هەموویان دەستیان لە یاریکردن هەڵگرت، هەر وەک پێشتریش وایان کرد، پاشان هەموویان ڕایان کرد بۆ ئەو لایەی تری باخەکە، کە ئەستێڵەکەی لێ بوو و دەکەوتە ئەوسەری باخەکەوە. دە خولەک دواتر، پاڤێل پاڤلۆڤیچ بۆی دەر کەوت کە هیچکەس بە شوێنیدا ناگەڕێت. بەدزییەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشایەکی دەرەوەی کرد، بەڵام چاوی بە کەس نەکەوت. نەیشیدەوێرا بانگ لە کەس بکات، چونکە لەوە دەترسا دایک و باوک لە خەو ڕابن؛ خزمەتکارەکانیش بەتوندی لێیان قەدەغە کرابوو کە بە هیچ شێوەیەک وەڵامی بانگکردنەکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بدەنەوە، یاخود بچن بۆ لای. ئەگەر کاترینا فیدۆسیڤنای لێ بوایە، پێدەچوو دەرگاکەی لێ بکردایەتەوە، بەڵام ئەو کاتەی گەڕابووەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و لەسەر جێگەکەی ڕاکشابوو تا سەرخەوێک بشکێنێت، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی لە قووڵاییی خەودا ڕۆ چووبوو. بەم شێوەیە بۆ ماوەی یەک دانە کاتژمێری ڕێک لەوێدا حەپس بوو.

پاشان وردەوردە کچەکان دوو-دوو و سێ-سێ دەر دەکەوتن و وەک ئەوەی بەرێکەوت بەو شوێنەدا تێپەڕ بووبێتن، دەیانوت، "پاڤێل پاڤلۆڤیچ بۆچی نایەیتە دەرەوە بۆ لامان؟ ئۆیبی، وەرە جەوێکی زۆر خۆشمان دەبێت! بەتەماین شانۆ بکەین. ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ بەتەمایە ڕۆڵی پاڵەوانی لاو ببینێت."

هەندێکی تر کە لەوێوە تێپەڕ دەبوون، دەیانوت، "پاڤێل پاڤلۆڤیچ، بۆچی نایەیت بەشداریمان لەگەڵ بکەیت، تۆ تەنها کەسیت هەمیشە لەپڕ خۆت ون دەکەیت!"

"دیسانەوە کێیە کە هەمیشە لەپڕ خۆی ون دەکات؟"

کتوپڕ گوێیان لەم قسەیەی خاتوو زاخلیبینین بوو، هێندە نەدەبوو لە خەو هەستابوو، دەیویست بچێتە ناو باخەکە بۆ ئەوەی خەو بەری بدات و تەماشای یاریکردنی منداڵەکان بکات، هەتا چاییەکە دەم دەکێشێت و ئامادە دەبێت.

"تەماشای ئێرە بکەن، پاڤێل پاڤلۆڤیچ لێرەیە!"

کچەکان وایان بە خاتوو زاخلیبینین وت، پەنجەیان ئاڕاستەی پەنجەرەکە کردبوو، کە ڕوخساری زەردهەڵگەڕاو و تووڕەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەبینرا، کە بە زەردەخەنەیەکی خواروخێچەوە لە دەرەوەی دەڕوانی.

دایە لە کاتێکدا لە سەرساميدا سەری ڕادەوەشاند، وتی، "باشە پێم ناڵێیت چ خۆشییەک لەوەدایە، کە لەوێدا بۆخۆت بەتەنیا دانیشیت، لە کاتێکدا هەمووان خەریکی شادیکردن و ڕابواردنن!"

لەو ماوەیەی تێپەڕی، ڤێلچانینۆڤ شەرەفمەند بوو بە بەدەستهێنانی متمانەی نادیا، نادیاش دەرفەتی ئەوەی بۆ

ڕەخسا، تا ڤێلچانینۆڤ لەوە تێبگەیەنێت کە مەبەستی لەوە چی بووە کە وتبووی "لەبەر شتێک خۆشحاڵ بووە، کە هاتووە بۆ لایان." گفتوگۆکەیان لە ڕێگەیەکی چەپەک، لەناو باخەکەدا ئەنجام دا. ماری نیکیتیشنا هەر بەئەنقەست ڤێلچانینۆڤی بانگ کردبوو بۆ لای نادیا، کاتێک بینیبووی خەریکە لە یاریکردن بەتەواوی جاڕز دەبێت، هەر بۆیە لەو ڕێگە چەپەکە لەگەڵ نادیادا بەتەنیا جێی هێشتبوون.

نادیا بەوپەڕی بوێری و زمانلووسییەوە، بەخێرایی وتی، "زۆر بەتەواوی لەوە دڵنیا بووم، کە تۆ هێندە هاوڕێیەکی گیانیبەگیانیی پاڤێل پاڤلۆڤیچ نیت، بەو شێوەیە نەبوو کە ئەو خۆی پێوە فش دەکردەوە. من لەو بڕوایەدام کە ئێوە تەنها کەس بن، کە بتوانم پشتی پێ ببەستم و داوای خزمەتێکی مەزنتان لێ بکەم، کە بتوانن بۆم بەجێ بهێنن." سندوقچەکەی لە گیرفانی دەر هێنا. "من بەوپەڕی سوپاسگوزاری و ڕێزەوە داواتان لێ دەکەم ڕاستەوخۆ ئەمە بگەڕێننەوە بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ، چونکە هەتا لە ژیاندا بم، ڕەنگە جارێکی تر قسەی لەگەڵدا نەکەمەوە. ئەتوانیت لە زمانی منەوە پێی ڕابگەیەنیت، کە هەرگیز جارێکی تر بوێریی ئەوە نەداتە بەر خۆی دیاری و شتم بۆ بهێنێت. ئەوەی تریش کە دەمێنێتەوە، هەوڵ ئەدەم لە ڕێگەی کەسانی ترەوە پێی بگەیەنم. ئایا ئەتوانن گەورەیی بنوێنن و ئەو داوایەی لێم خواستن بۆم جێبەجێ بکەن؟"

ڤێلچانینۆڤ خەریک بوو هاوار بکات، دەستەکانی دوور خستەوە، وتی، "بیکە بە خاتری خوا، داوای شتی وام لێ مەکە!"

"چی؟ داوات لێ نەکەم؟"

نادیا بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر تووشی سەرسووڕمان

بوو لە ڕەتکردنەوەکەی ڤیلچانینۆڤ و چاوەکانی زەق زەق بڕیبووە ناو چاوانی بە شێوەیەک دڵی پڕ ببوو، کە قسەکەی کرد، دەنگی لەرزەی تێ کەوتبوو، لەوەدا بوو بدات لە پرمەی گریان.

ڤیلچانینۆڤ دەستی کرد بە پێکەنین، پاشان وتی، "مەبەستم ئەوە نییە... پێویستە زۆریش خۆشحاڵ بم... بەڵام ڕاستییەکەی، خۆشم هەندێک حساب و کتابم لەگەڵیدا هەیە، دەبێت لەگەڵیدا یەکلاییی بکەمەوە..."

نادیا خێرا پەڕییە ناو قسەکانیەوە و بەبەسۆزی وتی، "دەمزانی ئێوە هاوڕێی ئەو نین و ئەویش درۆی دەکرد! با پێت بڵێم، هەرگیز شووی پێ ناکەم، هەرگیز! بەڵام لەوە تێناگەم چۆن توانیویەتی پرکێشیی ئەوە بکات... تەنها پێویستە لەسەرت ئەو دیارییە ڤیزەونەی بۆ بگێڕیتەوە، خۆ ئەگەر وا نەکەیت، ئیتر نازانم دەبێت چی بکەم؟ من زۆر مەبەستمە، زۆر مەبەستمە بەتایبەتی هەر ئەمڕۆ ئەو دیارییەی بۆ بگێڕمەوە، ڕێک لە هەمان ئەو ڕۆژەی بەناچاری لێم وەر گرتووە، هەر لە هەمان ڕۆژدا بۆی بگێڕمەوە. ڕەنگە بەم شێوەیە هەرچیی هیوایەک لەسەر من بنیاتی ناوە، هەمووی خاپوور ببێت، ئەگەر پرکێشیی ئەوەشی کرد لەلای بابم سکاڵام لەدەست بکات، ئەوە ئەو کاتە دەزانێت چیی بەسەر دێنم."

کتوپڕ لەو کاتەدا لەپشت بیشەڵانەکانەوە ئەو کوڕە لاوە سەری دەر هێنا، کە چاویلکە قەبە شینەکەی لەچاودا بوو. بەکینەوە چاوی بڕییە ناو چاوی ڤیلچانینۆڤ و کەرتڕنانە وتی، "ئەوە ئەرکی جەنابتە، کە بازنەکەی بۆ بگێڕیتەوە. ئەگەر تەنها لەبەر ڕێزگرتن لە مافەکانی ئافرەتیش بووە، دەبێت ئەو

کارە بکەن، هەڵبەت ئەگەر توانای ئەوەتان هەبێت کە بتوانن بەپڕاوپڕی لەم شتە تێبگەن...“

بەڵام پێش ئەوەی دەرفەتی ئەوەی هەبێت قسەکانی تەواو بکات، نادیا بەتوندی پڕی کرد بە قۆڵیدا و ئەوەندەی لە توانایدا بوو، لە ڤێلچانینۆڤی دوور خستەوە. پاشان هاواری کرد، ”ئەی هاوار، چەند بێئەقڵیت تۆ پرێدپۆسیلۆڤ! لێرە برۆ، لێرە برۆ، لێرە برۆ و جارێکی تر پڕکێشیی ئەوە نەکەیت بەدزییەوە گوێ بگریت، پێم وتبوویت لێرە دوور بکەویتەوە!...“

نادیا کە وای وت، پێیە بچووکەکانی بەتووڕەیییەوە کوتی بە عەردەکەدا، کاتێکیش کوڕە لاوەکە بەخشپەیی خۆی کردەوە بەناو بیشەڵانەکەدا، نادیا هێشتا هەر بەناو ڕێگە چەپەکەکەدا دەهات و دەچوو، هەر سەرەوخواری بوو، چاوەکانی دەدرەوشانەوە و باڵەکانیشی لەپێشەوە لە خۆی ئاڵاندبوو، بە شێوەیەک، وەک ئەوەی لە تووڕەییدا ئەسڵەن هەر بەسەر دنیاشەوە نەبێت. پاشان لەناکاو لە بەردەم ڤێلچانینۆڤ خۆی قوت کردەوە و وتی، ”ڕەنگە بڕوا نەکەیت کە ئەمانە چەند بێئەقڵ و گەمژەن! ڕەنگە تۆ گاڵتەت لێ بێت، بەڵام بیر لەوە بکەرەوە، کە ئەمە چ هەستێکی ناخۆش بە من دەبەخشێت.“

ڤێلچانینۆڤ پێکەنی و وتی، ”ناشێت ئەمە ئەو بێت، هەر بەڕاست ئەمە ئەو نییە؟“

”بەدڵنیایییەوە ئەو نییە، نازانم بۆ وا بیر دەکەیتەوە کە ئەمە ئەو بێت!“

نادیا کە وای وت، زەردەخەنەی دەکرد و ڕوخساریشی وردەوردە سوور هەڵدەگەڕا، پاشان ئەمەشی خستە سەر قسەکانی تری، ”ئەو تەنها هاوڕێیەتی. بەڵام لەوە تێناگەم کە

چۆن ئەم جۆرە هاوڕێیانە هەڵدەبژێرێت؛ هەموویان دەڵێن ئەو دەبێتە سەرکردەی ئایندە، بەڵام من لەم شتانە تێناگەم... ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، من هیچ کەسێکی تر شک نابەم کە پەنای بۆ ببەم، بۆ دواجار داخوازییەکەمت بۆ دووپات دەکەمەوە، ئەتوانیت ئەم دیارییە بگێڕیتەوە؟"

"ئەی بەسەر چاو، بمدەرێ، بەدڵنیاییەوە دەیگێڕمەوە بۆی."

نادیا لە خۆشیدا ڕوخساری درەوشایەوە و سندوقچەکەی بۆ درێژ کرد، وتی، "ئاهـ بەڕاستی تۆ کەسێکی بەخشندە و میهرەبانیت! لە پاداشتی ئەم کارەتدا، تەواوی ئەم ئێوارەیە بە دڵی خۆت سترانت بۆ دەچڕم. ڕەنگە نەزانیت کە چەند بەجوانی ستران دەچڕم. دەزانی ئەو کاتەی پێم وتیت حەزم لە میوزیک نییە، ئەوە تەنیا درۆیەکی بچکۆلانە بوو کردم. بە هەرنرخێک بووە، دەبێت جارێکی تریش سەرمان لێ بدەیتەوە، چەند خۆشحاڵ دەبم ئەگەر ئەو کارە بکەیتەوە. هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، هەموو شتێک، هەموو شتێک، لەبەر ئەوەیش کە زۆر میهرەبانن، وەک – میهرەبان ڕێک وەک، ڕێک وەک کاتیای خوشکم میهرەبان! شتی زیاتریشت بۆ باس دەکەم."

کاتێک ڕۆشتن بۆ خواردنەوەی چای، ڕێک بەو شێوەیەی گفتی دابوو، دوو دانە سترانی چڕی، سەرباری ئەوەی ڕاهێنانیشی نەکردبوو و بەزەحمەتەوە سترانەکانی چڕی، بەڵام بەڕاستی تەبەقەی دەنگی زۆر بەرز بوو، هەستێکی خۆشی بە مرۆڤ دەبەخشی. ئەو کاتەی ئەوان لەناو باخەکە گەڕانەوە و خۆیان کردبوو بە ژوورەوەدا، پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەهەستمردووییەوە لەسەر مێزی چای خواردنەوەکە، کە

پێشتر سەماوەرێکی گەورەی لەسەر دانرابوو، قوڵپی دەدا، بە چواردەوریشیدا کوپی فەخفوریی تایبەتیی چینی دانرابوو، لەگەڵ دایک و باوکەکەدا دانیشتبوو. لەوە دەچوو لەسەر بابەتێکی زۆر گرنگ لەگەڵ ئەو دوو مرۆڤە بەتەمەنەدا گفتوگۆ بکات، چونکە دوای دوو ڕۆژی تر شار بەجێ دەهێڵێت و تا نۆ مانگی ڕێکیش ناگەڕێتەوە. پاڤێل پاڤلۆڤیچ تەنانەت بە تیلەی چاویش سەرنجی کچەکانی نەدا، کە لە باخەکە گەڕانەوە و خۆیان کرد بە ژوورەوەدا، زۆر بەتایبەتی خۆی لە تەماشاکردنی ڤێلچانینۆڤ بوارد.

بە هەمان شێوە زۆر ڕوون بوو کە جارێ گلەوگازندەی لە کەس نەبوو، تا ئەو ساتەش هەموو شت ئاسایی و هێمن دەر دەکەوت.

بەڵام هەر هێندەی نادیا دەستی کرد بە سترانچڕین، یەکسەر خۆی گەیاندە پێشەوە و خۆی قوت کردەوە. نادیا هەر بەئەنقەست پرسیارێکی ئەوی وەڵام نەدایەوە، کە ئاڕاستەی ئەمی کردبوو. بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە هۆی ئەم کارەی نادیاوە نە هەستی بە تەریقبوونەوە کرد و نە واشی لێ کرد سڵ بکاتەوە. ڕاستەوڕاست چوو لەپشت کورسییەکەی نادیاوە لێی دانیشت، بە ڕوخسار و هەڵسوکەوتیدا وا دەر دەکەوت، کە بڵێت ئەمە شوێنی خۆیەتی و لەژێر هیچ بارودۆخێکدا ئامادە نییە دەستبەرداری ئەو شوێنە ببێت بۆ هیچ کەسێک!

کچەکان تەقریبەن هەموویان بە یەک دەنگ لە یەک کاتدا هاواریان کرد، "دایە، دایە، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ ستران دەچڕێت، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ دەیەوێت ستران بچڕێت!"

پاشان هەموویان لەدەوری پیانۆکە خڕ بوونەوە، کە

ڤێلچانینۆڤ بەوپەڕی بڕوابەخۆبوونەوە لە بەردەم پیانۆکەدا خۆی جێگیر کردبوو، نیازی بوو هاوڕێ لەگەڵ ئەو سترانەی کە دەیچڕێت، خۆشی پیانۆکە لێبدات. پیرەژن و پیرەپیاویش بەلارەلار خۆیان کرد بە دیوەخانەکەدا و لەگەڵیشیاندا کاترینا فیدۆسیێڤناش هات، کە لەوێ لەگەڵیان دانیشتبوو چایی بۆ تێدەکردن.

ڤێلچانینۆڤ یەکێک لە سترانەکانی گلینکای* هەڵبژارد بۆ وتن، کە تەقریبەن ئەمڕۆ لەلای هەمووان ناسراو بوو:

خۆشەویستم، ئەو ساتەی لێوە ناسکەکانت دەکەیتەوە و بەعیشوەوە دەبۆڵێنیت، بۆڵەکانت لای من شیرنترن لە گمەگمی کۆترەکان**.

سترانەکەی چڕی و تەواوی ئاماژەکانیشی ڕوو بە نادیا

---

* گلینکا: میخائیل ئیڤانۆڤیچ گلینکا Mikhail Ivanovich Glinka: گەورەئاوازدانەری ڕووسی لەساڵی ١٨٠٤ لە نۆڤۆسپاسکۆیە لە ڕوسیا لەدایک بووە، یەکەمین ئاوازدانەری ڕوسییە، کە خەڵاتی ڕێزلێنانی نێودەوڵەتیی پێ بەخشراوە. هەروەها لە ڕوسیادا بە باوکی قوتابخانەی میوزیکی ناسیۆنالیست دادەنرێت. لە ساڵی ١٨٥٧ لە بەرلین-ئەڵمانیا کۆچی دوایی کردووە.

** هۆنراوەکە: هۆنراوەی هۆزانڤانی پۆڵەندی ئادەم مبکیفتسە، کە لە ساڵی ١٨٣٤ هۆنراوەکانی وەر گێڕدراوەتە سەر زمانی ڕوسی و ئاوازدانەری بەتوانای ڕووسییش، گلینکا، ئاوازەکەی بۆ داناوە. گۆرانییەکی بازاڕیی جیاوازی نەبێت، دووریش نییە زۆر ئابڕووبەریش بێت؛ بەبێ بوونی ئەو هەستانە، زۆر ئەستەمە بتوانرێت هەست و سۆزێکی وەها قووڵ دەر ببڕێت، بەبێ ئەوەی گوێگر هەستی تووڕەیی ببزوێت. بەڵام ڕاستگۆیی و سادەیی کەسی گۆرانیبێژ لەو جۆرە دۆخانەی قوتار دەکات.

بوو، کە لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو لە هەرکەسێکی تر لێوەی نزیکتر بوو. هەرچەندە دەنگە خۆشەکەی جارانی نەمابوو، بەڵام کە گوێبیستی دەبوویت، بە دەنگیدا دەتزانی کاتی خۆی دەنگێکی زۆر ناوازەی هەبووە، بیست ساڵ پێشتر، ئەو کاتەی ڤێلچانینۆڤ هێشتا قوتابی بوو، بەخت یاوەری ببوو کە بۆ یەکەم جار گوێبیستی ئەم سترانە ببێت، لەلایەن خودی گلینکاوە، کە لە ئێوارەخوانێکی زگورتی و کەشێکی هونەری و ئەدەبیدا، کە لە ماڵی یەکێک لە هاورێکانی خودی گلینکای ئاوازدانەرەوە رێک خرابوو. لەو رۆژەدا گلینکا کە ئیجگار دڵخۆشببوو، سەرجەم ئەو ئاوازانەی تایبەت بوون لای، خۆی ژەنیبووی، لە نێوانیشیاندا ئەم گۆرانییەی کە ڤێلچانینۆڤ چریبووی، بەوپەڕی کامەرانییەوە چریبوو. گلینکاش بە هەمان شێوە ئەو کاتە دەنگە خۆشەکەی جارانی نەمابوو، بەڵام ڤێلچانینۆڤ هەمیشە ئەو کاریگەرییە قووڵەی لەیاد نەدەکرد، کە ئەم گۆرانییە لەسەر دڵ و دەروونی بەجێی هێشتبوو. باشترین گۆرانیبێژی ناو دیوەخانەکان، هەرچەندێکیش بەهرەمەند بووایە، هەرگیز نەیدەتوانی کاریگەرییەکی هێندە قووڵی لەسەر بەجێ بهێڵێت. لەو گۆرانییەدا قووڵیی سۆز و خرۆشان بەبەردەوامی لە هەر دێڕێکیدا و لە هەر وشەیەکیدا جار لەدوای جار بەرزتر و بەرزتر دەبووەوە؛ هەر بە هۆی ئەم لەڕادەبەدەر قووڵبوونەوەیەوە، بۆ نموونە، لە ئۆپێرادا بچووکترین زیادەڕۆیی لەلایەن ستران بێژەکەوە، یاخود وتنی شتێکی دوور لە ڕاستی و کردنی بچووکترین هەڵە، دەبێتە هۆی لەدەستدانی چێژی گوێگرەکانی، هەروەها دەبێتە هۆی شێواندنی ئاوازەکە و هونراوەکەش بەتەواوی بایەخی خۆی لەدەست

دەدات. ئەم گۆرانییە تا بڵێی سادەیە، بەڵام لەڕادەبەدەر نایابە، زۆر گرنگە ئەو کەسەی سترانەکە دەچڕێت کەسێکی ڕاستگۆ بێت، زۆر گرنگە خاوەنی ئیلهامێکی ڕاستەقینە بێت، خاوەنی هەست و سۆزێکی قووڵ و ڕاستەقینە بێت، یاخود هەستێکی تەواو شاعیرانە لە ناخیدا بێت، چونکە ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت، ئەوە گۆرانییەکە حەقی خۆی پێ نادرێت و شکست دەهێنێت و ڕەنگە تەنانەت لەگەڵ ڤێلچانینۆڤ ئەوەی بەبیر هاتبووەوە، کە چەند جارێک و لە چەند بۆنەیەکدا لە وتنی ئەم گۆرانییەدا سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنابوو. تەقریبەن لاساییی شێوازی گلینکای دەکردەوە لە سترانچڕینەکەیدا.

بەڵام هەنووکە، هەر لە ژەنینی یەکەم نۆتەوە، لە دەربڕینی یەکەم دێڕەوە، ڕۆحی سەرشار ببوو بە ڕووناکی و ئیلهام، بە شێوەیەک، کە لەرزە کەوتبووە دەنگییەوە. بە شێوەیەک هەستی خرۆشابوو، کە هەر وشەیەک لە زاری دەر دەهات، زیاتر و زیاتر سۆزی جۆش دەدا؛ لە دوادێڕەکانی کۆتاییدا، چاونەترسانە وشەگەلێکی سۆزداری و ورووژێنەری بەکار هێنا، تەنانەت کاتێک ئەم چەند دێڕەی کۆتاییی گۆرانییەکەی چڕی، ڤێلچانینۆڤ بە چاوی بلێساوییەوە، ڕووی کردە نادیا و ئاڕاستەی ئەوی کرد:

هەنووکە لە چاوەکانت سەرکێشانەتر دەڕوانم
لێوەکانمت لێ نزیک دەکەمەوە و چیی تر بەرگە ناگرم
دەمەوێت ماچت بکەم، ماچت بکەم، ماچت بکەم!
دەمەوێت ماچت بکەم، ماچت بکەم، ماچت بکەم!

نادیا مووچڕکەی پێدا هات و تەقریبەن سووکەترسێکیشی لێ نیشت، تەنانەت هەنگاوێکیش چووە دواوە، کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕابوو، ڕێک لەو کاتەدا ڤێلچانینۆڤ کورتەنیگایەکی ڕوخساری نادیای کرد و لە ڕوخساری بچکۆلانە و سوورهەڵگەڕاو و ترساویدا، نیشانەی قابیلبوونی بەدی کرد. ڕوخساری تەواوی گوێگرەکان بە شێوەیەکی لێ هاتبوو، وەک ئەوەی ئەفسوونیان لێ کرابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەموویان سەریان لەوە سوور مابوو، هەموویان پێیان وا بوو کە بەڕاستی زۆر شەرمهێنە، زۆر ئەستەمە مرۆڤ بەم هەموو چاوقاییمییەوە ستران بچڕێت، کەچی سەرباری ئەوەش، لە هەمان کاتدا هەمووان ڕوخساریان سوور هەڵگەڕابوو، چاوی هەموویان دەدرەوشایەوە و وا دەر دەکەوت چاوەڕوانی شتی لەوە زیاتریش بن. لەنێوان ئەو ڕوخسارانەدا، ڤێلچانینۆڤ نیگایەکی زۆر تایبەتی ڕوخساری کاترینا فیدۆسیڤنای کرد، کە لە جوانیدا دەدرەوشایەوە. زاخلیبینینی پیر، کە کەمێک واقی وڕ مابوو، منجاندی، "چەند ڕۆمانسی بوو! بەڵام... بەڵام هەست ناکەن کەمێک زیادەڕوویی تێدا بووە؟"

"دڵفڕێن بوو، بەڵام زیادەڕەوییشی تێدا بوو..."

خاتوو زاخلیبینینیش قسەی مێردەکەی پشتڕاست کردەوە، "بەڵێ، زیادەڕەویی تێدا بوو..."

بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەرفەتی نەدا قسەکانی تەواو بکات، لەناکاو وەک ئەوەی جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت، لە شوێنی خۆی دەر پەڕی و بازێکی دا بۆ پێشەوە، وەک ئەوەی ئاگای لە خۆی نەمابێت، پەلاماری قۆڵی نادیای دا و لە ڤێلچانینۆڤی دوور خستەوە؛ وەک شێت بازی دا بۆ لای ڤێلچانینۆڤ، چاوی

بڕییە چاوەکانی ڤیلچانینۆف، بە ڕوخسارێکی بێهیواوە و لە کاتێکدا لێوەکانی دەلەرزی، دەجووڵانەوە بەبێ ئەوەی دەنگی لێوە بێت.

دواجار بە دەنگێکی لەرزۆک و پچڕپچڕەوە چرپاندی، "نیو خولەک بە یارمەتیت!"

لەو ساتەدا ڤیلچانینۆف پەی بەوە برد، کە ڕەنگە بەو دۆخەی ئێستای ئەم پیاوەی تێدایە، ڕەنگە لە دەستی بێت بەبێ بیرکردنەوە چەندین کاری گەوجانە ئەنجام بدات، بۆیە بەبێ دواکەوتن خێرا پەلی پاڤێل پاڤلۆڤیچی گرت، بەبێ گوێدان بە سەراسیمەبوونی ئەو کەسانەی لەوێ دانیشتبوون، بردیە دەرەوەی باڵکۆنییەکە، تەنانەت چەند هەنگاوێکیش لەگەڵیا چووە ناو باخەکەوە، هەنووکە ئەو شوێنە بەتەواوی لەناو تاریکایدا نوقم ببوو."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وتی، "دەزانیت، هەر ئێستا دەبێت لەگەڵ من ئێرە بەجێ بهێڵیت؟"

"نەخێر نازانم..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە شێتگیرییەکەی خۆیەوە بەردەوام بوو، چرپاندی، "بیرت دێت، بیرت دێت کە تۆ پێداگریی ئەوەت دەکرد کە پێویستە من هەموو شتێکت بۆ باس بکەم، هەموو شتێک بێ پێچ و پەنا، قسەی کۆتایی... بیرت دێت؟ ئێستا کاتی ئەوە هاتووە قسەی کۆتاییت پێ بڵێم... با بڕۆین!"

ڤیلچانینۆف ساتێک بیری کردەوە و تەماشایەکی پاڤێل پاڤلۆڤیچی کرد و پاشان قایل بوو کە بەیەکەوە بڕۆن.

ئاگادارکردنەوەی ڕۆیشتنی لەناکاویان، دایک و باوکەکەی زویر کرد، هەروەها تەواوی کچەکانیشی بە شێوەیەکی

سامناک تووڕە کرد.

خاتوو زاخلیبینین بەگلەییەوە وتی، "هیچ نەبووایە چاییەکی ترتان لەگەڵماندا بخواردایەتەوە، ئینجا ئۆغرتان بکردایە."

پاشان زاخلیبینینی ئیختیار بەمۆنییەوە و بەدڵئیشاوییەوە ڕووی کردە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە بەپێوە و بەبێدەنگی ڕاوەستابوو، بەدرۆوە بزەی دەکرد، پێی وت، "وەرە کوڕی خۆم، بزانم چ شتێک قەڵسی کردوویت؟"

پاشان کچەکان بەکینەوە ڕوویان کردە پاڤێل پاڤلۆڤیچ و دەستیان کرد بە گلەوگازندەکردن لێی، "بۆچی ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ خۆت دەبەیت، پاڤێل پاڤلۆڤیچ؟"

نادیا زۆر بە ڕق و تووڕەیییەوە لە پاڤێل پاڤلۆڤیچی دەڕوانی و چاوی تێ بڕیبوو، زۆر بەڕوونی دیار بوو کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە تەریقیدا گرمۆڵە بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر نەهاتە ژێر بار.

ڤێلچانینۆڤ لە کاتێکدا تەوقەی لەگەڵ زاخلیبینیدا دەکرد، بەزەردەخەنەوە وتی، "لە ڕاستیدا دەبێت سوپاسی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بکەم، کە کارێکی ئێجگار گرنگی بیر خستمەوە کە دەبوو ئەنجامی بدەم، خۆ ئەگەر ئەو نەبووایە، بێ شک لەبیرم دەچوو."

پاشان وەکوو ڕێز خۆی بۆ خاتوو زاخلیبینین و کچەکان چەماندەوە و بە شێوەیەکی زۆر تایبەتی و جیاواز لە هەموو ئەوانی تر، بەوپەڕی نەزاکەتەوە خۆی بۆ کاترینا فیدۆسیڤناش چەماندەوە.

زاخلیبینین بەوپەڕی سەنگینی و بەپوختی وتی، "بەڕاستی لە هاتنت بۆ ئێرە، گەلێک سوپاسگوزارین و هەموو ساتێ بە

هاتنت بۆ ئێره خۆشحاڵ دەبین."

دایەش خێرا بەدوای مێردەکەیدا بەبەسۆزییەوە وتی، "بەڕاستی گەلێک دڵخۆش دەبین..."

لە کاتێکدا لەگەڵ پاڤێل پاڤلۆڤیچ سواری گالیسکەکە ببوو، دەنگێکی بێشوماری کچەکانی بەرگوێ کەوت، کە لە باڵکۆنییەکەوە هاواریان دەکرد، "سەرلەنوێ سەر بدەرەوە ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، سەرلەنوێ سەر بدەرەوە!"

پێدەچوو یەکێک لە دەنگەکان لە هەموو دەنگەکانی تر ناسکتر بانگ لە ڤێلچانینۆڤ بکات، "سەرلەنوێ وەرەوە ئازیز گیان، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچی ئازیز."

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی "ئەوە کچە قژخورماییەکەیە."

# ١٣

# حەق بەلای کامیانەوەیە زیاتر

پێدەچوو بیر لە کچە قژخورماییەکە بکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتاش لە ناخەوە هەستی بە ئازارێکی بەسوێ دەکرد، لەڕادەبەدەر هەستی بە پەشیمانی دەکرد. لە ڕاستیدا تەواوی ڕۆژەکەش کە تێپەڕی، هەر بەو شێوەیە هەستی بە ئازارێکی ڕاستەقینە دەکرد لە ناخی خۆیدا، هەرچەند بەڕواڵەت وا دەر دەکەوت کە گەلێک دڵخۆش بێت، بەڵام لە ڕاستیدا لە ناخەوە ئازارێکی قووڵ دەروونی دەخواردەوە. تەنانەت پێش ئەوەی گۆرانییەکەش بچڕێت، نەیدەزانی بە چ شێوەیەک خۆی لەو ئازارانەی ناخی بەتاڵ بکاتەوە، ڕەنگە هەر ئەوەش بووبێتە هۆکاری ئەوەی گۆرانییەکە بەو هەموو دەربڕین و هەست و سۆزەوە بچڕێت.

دەستی کرد بە سەرزەنشتکردنی خۆی: "چۆن توانیم بەو شێوەیە ڕەفتار بکەم... هەموو شتێکم لەبیر خۆم بردبۆوە." بەڵام بەخێرایی کۆتایی بەم جۆرە بیرکردنەوانە هێنا. لە ڕاستیدا پێی وا بوو کە پێویست ناکات بە دەربڕینی هەستی

پەشیمانبوونەوە خۆی زەلیل و ڕسوا بکات، باشترین ڕێگە ئەوەیە، کە تووڕەیی و ئازارەکەی بەسەر یەکێکی تردا خاڵی بکاتەوە.

بەوپەڕی تووڕەیییەوە نیگایەکی پەیکەری خامۆشی پاڤێل پاڤلۆڤیچی کرد، کە لەتەنیشتیەوە لەناو گالیسکەکەدا دانیشتبوو، بەرقەوە چرپاندی، "گەمژەی بێئەقڵ!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ سوور بوو لەسەر بێدەنگییەکەی، لەوە دەچوو بیروهۆشی خۆی کۆ بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێت دەبێت چ شتێک ئامادە بکات بۆ وتن. ماوەماوە بەنائارامی کڵاوەکەی لە سەری دادەکەند و بە دەسەسڕەکەی ئارەقەی ناوچەوانی دەسڕی.

ڤێلچانینۆڤ بەکینەوە لە دڵی خۆیدا دەیوت، "ئارەق دەر دەدات!"

لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە بەڕێگەوە بوون، تەنها یەک جار پاڤێل پاڤلۆڤیچ پرسیاری کرد، ئەویش پرسیاری لە گالیسکەوانەکە کرد، "ئەرێ لەوە دەچێت زریان بەڕێوە بێت؟"

"بەڵێ، بێگومان! ئەویش چ زریانێک! تەواوی ڕۆژەکەش بەردەوام دەبێت."

لە ڕاستیدا هەوری ڕەش ئاسمانی بەتەواوی تاریک کردبوو، لە دوورەوە چەخماخە ئاسمانی تاریکی ڕووناک دەکردەوە.

دەوروبەری کاتژمێر دەو نیو بوو، کە گەیشتنەوە ناو شارۆچکەکە. پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە هێندە دوور نەبوون لە ماڵەکەی ڤێلچانینۆڤ، ڤێلچانینۆڤی ئاگادار کردەوەو پێی وت،

"بەدڵنیابییەوە لەگەڵتدا دێمە ژوورەوە."

"دەزانم، بەڵام حەز ئەکەم ئەوەش بزانیت، کە من هەر بەڕاستی هەست بە باشی ناکەم."

"خەمت نەبێت، زۆر نامێنمەوە."

کاتێک گەیشتنە لای دەروازەکە، پاڤیل پاڤلۆڤیچ بەرەو کوختی دەرگاوانەکە غاری دا بۆ ئەوەی ماڤرا بدۆزێتەوە.

کاتێک پاڤیل پاڤلۆڤیچ گەڕایەوە و لەگەڵ ڤێلچانینۆڤ خۆی کرد بە ژوورەوەدا، ڤێلچانینۆڤ بەڕووتاڵییەوە لێی پرسی، "ئێشت چی بوو بەو شوێنە و بۆچی ڕۆیشتیت بۆ ئەوێ؟"

"ئا... هیچ... گالیسکەوانەکە..."

"ڕێت پێ نادەم بخۆیتەوە"

هیچ وەڵامێک بەرگوێ نەکەوت. ڤێلچانینۆڤ مۆمەکانی داگیرساند و پاڤیل پاڤلۆڤیچیش یەکسەر لەسەر کورسییەکە دانیشت. ڤێلچانینۆڤ لە بەردەمیدا بە ڕوویەکی مڕومۆچەوە ڕاوەستابوو، پاشان کە هێشتاش توورەیییەکەی لەناو خۆیدا دەخواردەوە، دەستی پێ کرد، "منیش بە هەمان شێوە بەڵێنم پێ دابوویت کە قسەی کۆتاییی خۆمت پێ بڵێم. ئەمەش پوختەی قسەکەیە: من بە تەواوی بیروهۆشی خۆمەوە گەیشتووم بەو ئەنجامەی کە هەرچییەک لەنێوانی من و تۆدا هەبووە، کۆتایی پێ هات، بەم شێوەیە، لە ڕاستیدا، هیچ شتێک نییە تا من و تۆ قسەی لەبارەوە بکەین- گوێت لێیە؟ - هیچ شتێک، بۆیە باشتر نیە هەر ئێستا لەماڵەکەم بچیتە دەرەوە و منیش لەدواتەوە دەرگاکە دابخەم؟"

پاڤیل پاڤلۆڤیچ، لە کاتێکدا بەهێمنی و بە لێڕوانینێکی

تایبەتەوە لە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤی دەڕوانی، وتی، "کەواتە ڕێ بدە با حسابەکەمان ڕێک بکەینەوە."

ڤێلچانینۆڤ بە حەپەساوییەکی زیاترەوە دووبارەی کردەوە، "حسا... بەکەمان ڕێک... بکەینەوە! چ قسەیەکی سەیر دەکەیت! چ حسابێک ڕێک بکەینەوە؟ تڕحێو! ئەترسم ئەمە قسەی کۆتاییت بوو بێت کە بەڵێنت دابوو... پەردەی لەسەر هەڵبماڵیت بۆ من؟"

"بەڵێ، خۆیەتی."

ڤێلچانینۆڤ بەلوتبەرزییەوە وتی، "ئێمە هیچ حسابێکمان نییە تاکوو ڕێکی بکەینەوە، ئێمە زۆر پێشتر حسابی خۆمان ڕێک کردۆتەوە!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێکی کاریگەرەوە، لە کاتێکدا بە شێوەیەکی زۆر سەیر هەردوو دەستی لەیەک ئاڵاند و لەسەر سنگی دای نا، وەڵامی دایەوە، "هەر بەڕاست پێت وایە هیچ حسابێک لە نێوانماندا نەماوە؟"

ڤێلچانینۆڤ وەڵامی نەدایەوە، بەڵام بەردەوام بوو لە هەنگاونان و سەروخوارکردن لەناو ژوورەکەدا.

لە دڵی خۆیدا بەئاهوناڵەوە هەر دەیوت، "لیزا! لیزا!"

پاشان دوای بێدەنگییەکی دوورودرێژ، بەمرومۆچییەوە پرسیی، "کەواتە پێم بڵێ بزانم ئەتویست چ شتێک ڕێک بکەیتەوە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ تەواوی کاتەکە، کە هێشتاش دەستەکانی لەیەک ئاڵاندبوو، لەسەر سنگی دای نابوو، چاوەکانی بەشوێن ڤێلچانینۆڤەوە بوو. لەپڕ لەسەر کورسییەکەی هەستا و بە دەنگێک، کە تا ڕادەیەک لە چرپەکردن و پاڕانەوە دەچوو،

وتی، "جارێکی تر مەچۆرەوە بۆ ئەوێ!"

ڤێلچانینۆڤ بە شێوەیەکی زۆر کیناوی پێکەنی، وتی، "چیییییی! کەواتە ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە؟ بەڕاستی ڕۆژی ئەمڕۆ گەلێک سەرسامت کردم!"

سەرەتا بە شێوەیەکی زۆر بەدخوازانەوە دەستی پێ کرد، بەڵام کتوپڕ ڕەنگی گۆڕا، بەخەمباری و بە هەستێکی ئێجگار ڕاستگۆیانە و قووڵەوە وتی، "گوێ بگرە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، هەست ئەکەم قەت هێندەی ئەمڕۆ ئاستی خۆم دانەبەزاندووە و هێندە خۆم بچووک نەکردۆتەوە - سەرەتا بە قایلبوونم بە هاوەڵیکردنت بۆ ئەو شوێنە، دواتریش ئەوەی کە لەوێ ڕووی دا... بەڕاستی زۆر سەخیفانە بوو، زۆر جێگەی داخ و پەژارە بوو... بە هۆی ئەوەی هاتم بۆ ئەوێ و خۆم لەو بابەتەوە گلاند، هەست ئەکەم گلاو بووم، هەست ئەکەم خۆم سووک و ڕسوا کردووە... هەروەها لەبیرم چوو... بەڵام ئا!"

ڤێلچانینۆڤ قسەکانی بۆ تەواو نەکرا، خێرا دای لە پرمەی گریان.

بەبێ دوودڵی بەم شێوەیە کۆتاییی پێ هێنا، "گوێ بگرە، تۆ کە ئەمڕۆ زانیت من بارودۆخی تەندروستیم باش نییە و گەلێک نیگەرانم، لە بێئاگاییدا هێرشت کردە سەرم... بەڵام پێویست ناکات بڕوبیانوو بۆ خۆم بهێنمەوە! من جارێکی تر ناچمەوە بۆ ئەوێ، دڵنیاشت دەکەمەوە هەرچۆنێک بێت خۆشیم لە چارەیان نایەت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ نەیتوانی ڕێ لە شادیدەربڕینەکەی بگرێت،

لە خۆشیدا هاواری کرد، "بەڕاست؟ بەڕاست؟"

ڤێلچانینۆڤ بە چاوێکی سووکەوە لێی ڕوانی، پاشان دەستی کردەوە بە سەروخوارکردن و هاتوچۆ لەناو ژوورەکەدا. نەیتوانی دان بە خۆیدا بگرێت و پرسیار نەکات، "لەوە دەچێت بڕیارت دابێت بە هەرنرخێک بووە بەختەوەر ببیت؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە نەرمی و دەنگێکی هێمنەوە وتی، "بەڵێ."

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "باشە ئەمە کەی کێشەی من، خۆ ئەو لە گاڵتەجاڕێک زیاتر چیی دی نییە، تەنها بیر لە شتی پڕوپووچ و قۆڕ دەکاتەوە، ئیتر ئەمە چ بایەخێکی بۆ من هەیە؟ بەڕاستی هەرچەندێ دەکۆشم، ناتوانم ڕقم لێی نەبێت، هەرچەندە ئەو لەوە هیچوپووچترە، کە تەنانەت ڕقیشم لێی ببێتەوە!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە شێوەیەکی سەرشۆڕانە و خوێڕییانە زەردەخەنەیەکی کرد، پاشان وتی، "من مێردێکی هەمیشەییم، ماوەیەکی زۆر لەمەوپیش، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەم دەربڕینەم لە خۆت بیست، ئەو ڕۆژانەی لەگەڵمان دەژیایت. گەلێک لەو وتە مەزنانەتم لە بیرە، کە لە ماوەی ئەو ساڵەدا وتنت. دواجار کە دەستەواژەی مێردی هەمیشەییت، بەکار هێنا، زۆر بیرم لێ کردەوە و تێگەیشتم."

لەو کاتەدا ماڤرا بە بوتڵێک شەمپانیا و دوو پەرداخەوە خۆی کرد بە ژوورەوەدا.

"بمبەخشە ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، هەر وەک دەزانیت، من بێ ئەمە هەڵناکەم! تکایە ئەمە بە بێڕێزیکردن لێک مەدەنەوە،

ئەسڵەن من وەک غەوارەیەک ببینە، نەک وەک کەسێک کە لەئاستی بەڕێزتاندا بێت.“

ڤێلچانینۆڤ بەڕقلێبوونەوە بۆڵاندی، ”بەڵێ... بەڵام دڵنیات دەکەمەوە کە تەندروستیم لەڕادەبەدەر خراپە...“

”هەر ئێستا... هەر ئێستا... تەنها یەک پێکی بچووک لەبەر ئەوەی قورگم...“

قسەکەی تەواو نەکرد، حەقەجی پەرداخەکەی نا بە بینیەوە و تا دوادڵۆپی هەڵچۆڕاند، پاشان لە شوێنی خۆی دانیشت، بە شێوەیەک، کە لە نیگایدا جۆرێک لە سۆز و بەزەییی تێدا دەخوێندرایەوە، چاوی بڕییە ڤێلچانینۆڤ.

ماڤرا لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

ڤێلچانینۆڤ بۆڵاندی، ”چەند بێشعورە!“

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە لەناکاو هۆشی هاتبووەوە بەبەردا، بەوپەڕی متمانەبەخۆبوونەوە وتی، ”هەر هەمووی خەتای کچە هاوڕێکانیەتی.“

”چی؟ ئەها، بەڵێ، جاری هەر دالغەت لای...“

”هەر هەمووی لەژێر سەری ئەو کچە هاوڕێیانەیدایە! ئێ هەر وەک خۆت دەزانیت، ئەو کچە هێشتا منداڵە، ڕاستە کە ئەوان گەلێک دلڕفێن و جوانن، بەڵام هەر وەک دەزانیت، ئێمەش خاوەنی کەمێک فیز و شکۆی خۆمانین! بەڵام دواجار، دواجار، خۆت دەزانیت، دەبێت ببمە کۆیلەی، هەر هێندەی کەمێک جیاوازتر مامەڵەی لەگەڵدا کرا، هەر هێندە پێی خستە ناو کۆمەڵگەوە و شتەکانی بینی... ئەوە دەستبەجێ گۆڕانی بەسەردا دێت.“

ڤێلچانینۆڤ بەخۆشحاڵییەوە لە کاتێکدا یاریی بە

سندوقچەکەی دەکرد لە گیرفانیدا، لە دڵی خۆیدا وتی، "هەرچۆنێک بێت، پێویستە بازنەکەی بۆ بگێڕمەوە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەردەوامیی دایەوە بە قسەکانی و بەوپەڕی متمانەبەخۆبوون و تەنانەت تا ڕادەیەکیش بەشاگەشکەبییەوە وتی، "ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، تۆ کەمێک بەر لەئێستا بە منت وت، کە سوورم لەسەر ئەوەی خۆشبەخت بم؟ بەڵێ، ئەمە ڕاستە، من دەبێت سەرلەنوێ ژن بهێنمەوە، ئەگەر وا نەکەم، خۆشم نازانم چیم لێ بەسەر دێت؟ خۆت چاو لێ بکە!" پاڤێل پاڤلۆڤیچ کە وای وت، پەنجەی ئاڕاستەی بوتڵە شەمپانیاکە کرد. "ئەمە یەکێکە لە سەدان ئەو بەدڕەفتارییانەی ئەنجامی دەدەم. هەرگیز ناتوانم دەستبەرداری هەموو ئەم شتانە ببم بەبێ ژنهێنان، بەبێ باوەڕێکی نوێ؛ دەبێت سەرلەنوێ باوەڕم پتەو بکەمەوە و دیسانەوە بە خۆمدا بچمەوە و لە شوێنی خۆم هەستمەوە."

ڤێلچانینۆڤ، کە پێکەنین خەریک بوو برستی لەبەر دەبڕی، بەقاقاوە و بەوپەڕی سەرسوورمانەوە پرسیی، "بەڵام توو شەرەفت پێم ناڵێیت ئەم شتانە بۆچی بە من دەڵێیت؟"

تەواوی ئەم شتانە بەلای ڤێلچانینۆڤەوە کەمێک سەیر بوون، پاشان بەردەوام بۆوە و هاواری کرد، "بەڵام پێم بڵێ بزانم، ئامانجت چی بوو لەوەی منت پەلکێشی ئەوێ کرد؟ منت بۆ چ شتێک دەویست لەوێ؟"

"وەک تاقیکردنەوەیەک..."

وا دەر دەکەوت پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەناکاو لە حاڵی خۆی تەریق بوو‌بێتەوە.

"تاقیکردنەوە بۆ چ شتێک؟"

"دەمویست بزانم تا چ ڕادەیەک کاریگەریت هەیە... تەماشا بکە ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، ئەگەر هەمووی بخەیتە سەر یەک، هەفتەیەک دەبێت... کە بە دەوروخولی ئەوێدا دەچم." پاڤێل پاڤلۆڤیچ تا بهاتایە، زیاتر و زیاتر دەپەشۆکا. "دوێنێ کە چاوم پێت کەوت، بیرم لەوە کردەوە، کە تا ئێستا هەرگیز نادیام نەبینیوە کە لە دەرەوە لەگەڵ خەڵکی بێگانە یاخود بڵێین خەڵکی خانەدان جگە لە خۆم، ئەگەر بیانبینێت، چۆن ڕەفتار دەکات... بیرۆکەیەکی گەمژانەبوو، تازە هەست بە گەمژەییی ئەو بیرۆکەیەم دەکەم، من چاوەڕوانی لەوە زیاترم دەکرد... ئاخ، ئەمە سروشتی بۆگەنی منە..."

لەناکاو سەری هەڵبڕی و ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو.

ڤێلچانینۆڤ کە سەری لە خۆی سوڕ مابوو، لە دڵی خۆیدا وتی، "هەر بەڕاست، تۆ بڵێی ئەمە هەموو ڕاستییەکە بێت کە دەیڵێیت؟"

پاشان پرسیی، "زۆر باشە، ئەی دواتر؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە شێوەیەکی مەکربازانە زەردەخەنەیەکی شیرینی کرد، پاشان وتی، "هیچ نەبووە، جگە لە گەمەیەکی دڵڕفێنی منداڵانە! هەمووی خەتای کچە هاوڕێکانی بوو! تەنها داوای لێبووردنت لێ دەکەم بۆ ئەو هەڵسوکەوتە گەمژە و هەرزەکارانەیەی ئەمڕۆ لە بەردەمتدا نواندم، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، هەرگیز جارێکی تر ئەمە دووبارە نابێتەوە، هەر بەڕاستی جارێکی تر ئەمە ڕوو ناداتەوە."

ڤێلچانینۆڤ بەزەردەخەنەوە وتی، "منیش جارێکی تر سەر ناکەمەوە بەو شوێنەدا."

"لە سەرێکی ترەوە، منیش هەر مەبەستم لەمە بوو."

ڤێلچانینۆڤ هەستی کرد کەمێک هەستی بریندار کراوە، بەجاڕزییەوە وتی، "بەڵام هەر وەک دەزانیت، خۆ من تەنها پیاو نیم لەم دنیایەدا!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ دیسانەوە لە تەریقیدا سوور هەڵگەڕایەوە، "بەڕاستی هەست بە غەمباری دەکەم کە گوێم لەو قسانە دەبێت، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، بڕوام پێ بکە، من ڕێزێکی زۆرم هەیە بۆ نادیژدا فیدۆسیێڤنا..."

"بمبوورە، بمبوورە، مەبەستم هیچ شتێک نەبوو، تەنها کەمێک بەلامەوە سەیرە، کە تۆ زیادلەپێویست بڕوات بە هێزی دڵڕفاندنی من هەبووە... هەروەها... زیادلەپێویست بڕوات بە من هەبووە!"

"من بۆیە وەها بڕوا و متمانەیەکم بە تۆ هەیە، هەموو ئەوەی لە ڕابردوودا ڕووی دا... دوای هەموو ئەوانە، ئینجا گەیشتم بەو هەموو متمانەیە."

"کەواتە ئەگەر وا بێت، هێشتاش تۆ من بە بەڕێزترین پیاو دەزانیت؟"

ڤێلچانینۆڤ وای وت و کتوپڕ لە قسەکردن وەستا. ساویلکەییی پرسیارەکەی، لەو ساتەدا بووە جێگەی واقوڕمانی خودی خۆشی.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ چاوەکانی خۆی نەوی کرد، پاشان وتی، "هەمیشە پێم وا بووە کە تۆ وایت."

"بەڵێ، بەدڵنیاییەوە... مەبەستم ئەوە نەبوو، ئەوەیە، لەو ڕووەوە نا. تەنها مەبەستم ئەوە بوو کە بڵێم، سەرەڕای هەرشتێک... هەر هەڵسەنگاندنێک."

"بەڵێ، سەرەڕای هەر هەڵسەنگاندنێک."

ڤیلچانینۆڤ نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت لەوەی کە پرسیار نەکات، سەرباری ئەوەشی دەیزانی کە کونجاکاوییەکەی چەند ناپەسەندە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرسیی، "تەنانەت ئەو کاتەشی کە هاتیت بۆ پترسبۆرگ؟"

"بەڵێ، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، تەنانەت ئەو کاتەشی کە هاتم بۆ پترسبۆرگ، هەر بە چاوی بەڕێزترین پیاو لە تۆم دەڕوانی. هەمیشە ڕێزم لێ گرتوویت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ چاوەکانی هەڵهێنا، بەبێ خۆنواندن، بەبێ ئەوەی شەرم بکات، چاوی بڕییە نەیارەکەی. ڤیلچانینۆڤ کتوپڕ هەستی بە جۆرێک لە ترس کرد، بە هیچ شێوەیەک نەیدەویست نیگەرانی ڕوودانی هیچ شتێک بێت، یاخود هیچ شتێک لە سنووری خۆی لا بدات، بەتایبەت کە خۆی ئەم مەسەلەیەی ورووژاندبوو.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەک ئەوەی لەپڕ بڕیاری دابێت قسە بکات، وتی، "من تۆم خۆش دەویست، ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ... تەواوی ئەو ساڵەی کە لە ت لەلامان بوویت، من هەر خۆشم دەویستیت، بەڵام تۆ هەستت بەوە نەدەکرد."

لەبەرامبەر ترساوییە سامناکەکەی ڤیلچانینۆڤ، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە درێژەی دایەوە بە قسەکانی، "بە بەراورد بە تۆ، هەستم دەکرد من زۆر لەوە بچووکترم تا بتوانم وات لێ بکەم ئەو خۆشەویستییەم بۆ تۆ ببینیت. لە ڕاستییشدا ئەسڵەن هەر پێویستیشی نەدەکرد، ڕەنگە بەو شێوەیە باشتریش بووبێت. ئەزانی تەواوی ئەو نۆ ساڵە هەر لەبیری تۆدا بووم، لەبەر ئەوەی ڕاستیت پێ بڵێم، لە

هەموو ژیانمدا هیچ ساڵێکم هاوشێوەی ئەو ساڵە نەبووە.“
چاوەکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچ وردەوردە کەوتنە درەوشانەوە.
”گەلێک لە وتە و بڕگەکان و بیرۆکەکانتم هێشتاش هەر لەبیر ماوە. هەمیشە پێم وا بووە تۆ پیاوێکی دڵگەرم، بە سۆز و سروشتپیاوانە، پیاوێکی ڕۆشنبیر، بە مانای وشە ڕۆشنبیر، خاوەنی بیرۆکەی تایبەت بە خۆت؛ بیرۆکە مەزنەکان هێندەی دەرهاویشتەی دڵ و دەروونێکی مەزنن، هێندە دەرهاویشتەی ژیرییەکی مەزن نین. ئەمە خودی خۆت وتت، پێدەچێت بیرت نەما بێت. بەڵام من هەر لەبیرم ماوە. هەمیشە وەک کەسێک دڵ و دەروون مەزن لە تۆم ڕوانیوە... سەرەڕای هەموو شتێک، هەمیشە جێگەی بڕوای من بوویت و... هەمیشەش بڕوام پێت بووە.“

لەناکاو چەناگەی کەوتە لەرزین. ڤێلچانینۆڤ بەئاشکرا دیار بوو کە ترساوە؛ ئەسڵەن پێویست بوو خێرا کۆتایی بەم تۆنە چاوەڕواننەکراوە بهێنرێت، ئەگەر بە هەرنرخێک بووە.

ڤێلچانینۆڤ کە ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو، بە نائارامی و شڵەژاوییەوە منجاندی، ”تکات لێ دەکەم، چیی تر بەسە پاڤێل پاڤلۆڤیچ!“

پاشان کتوپڕ قیژاندی، ”بەڵام پێم ناڵێیت بۆچی، پێم ناڵێیت بۆچی بەرۆکی مرۆڤێک دەگریت، لە کاتێکدا ئەو مرۆڤە نیگەران و نەخۆشە، لە کاتێکدا ئەو مرۆڤە بەتەواوی خەریکی وڕێنەکردنە، هەر بەزۆر پەلکێشی ناو تاریکییەکی بێ بنی دەکەیت... لە کاتێکدا... لە کاتێکدا جگە لە خەیاڵێکی خاو و پڕوپووچ، زیاتر چیی دی نییە،

جگە لە تراویلکەیەک، جگە لە درۆیەکی زل و ئابڕووبەر و ناسروشتی، هەروەها جگە لە شتێکی زلکراو، چیی دی نییە. لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە، لە هەمووی ئابڕووبەرتر ئەوەیە، کە زیاد لە قەبارەی خۆی شتەکە زل کراوە! هەر بۆیە هەموو ئەمانە قسەی قۆڕن؛ ئێمە هەردووکمان یەک لە یەک شەڕەنگێزترین، دوو مرۆڤی بەدکار و درۆزن و خوێڕیین... ئەگەر ئەتەوێت، ئەتوانم بۆ جەنابتی بسەلمێنم کە تۆ ئەسڵەن منت خۆش ناوێت، بگرە لە ناخی دڵیشتەوە ڕقت لێمە، هەر لەبەر ئەوەشە کە جەنابت درۆ دەکەیت، ڕەنگیشە خۆت هەست بە درۆکانی خۆت نەکەیت؛ تۆ زۆر پێداگریی ئەوەت کرد، کە بمبەیت بۆ ئەوێ، ئەویش نەک لەبەر ئەو بیرۆکە حیزەی بەحساب ژنی داهاتووت بە من تاقی بکەیتەوە چ بیرۆکەیەکی ناماقوڵ! بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو، کە دوێنێ جەنابت منت بینی و سەرلەنوێ تووڕەیی بەرۆکی گرتیتەوە و منت هەڵفریوان بۆ ئەوێ و تا نیشانم بدەیت و پێم بڵێیت، ها، تەماشای ئەم دیارییە بکە! ئەوە دەبێت بە هیی من، تۆش بچۆ بۆخۆت هەر بیخولێنەرەوە! بەربەرەکانێی منت کرد، ڕەنگە خۆت ئەمەت نەزانیبێت، بەڵام ئەمە ڕاستیی مەسەلەکەیە، ئەمە ڕێک ئەو شتەیە، کە تۆ هەستت پێ دەکرد... ئەگەر تۆ بەو شێوەیە ڕقت لە من نەبووایە، ئەوا هەرگیز بەو شێوەیە بەربەرەکانێت نەدەکردم، بۆیە پێویست بە درۆودەلەسە ناکات، تۆ ڕقت لە منە!"

ڤێلچانینۆڤ بەشڵەژاوییەوە، بەخێرایی لەمسەری ژوورەکەوە دەچوو بۆ ئەوسەری ژوورەکە و دەیقیژاند. ئەوەی لە هەموو شت زیاتر هەراسان و بێتاقەتی کردبوو،

ئەوەی هەستی بریندار دەکرد و ویژدانی دەهەژاند، ئەوە بوو کە هەستی دەکرد خۆی لە بەردەمی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا زۆر بچووک کردۆتەوە.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کتوپڕ بە دەنگێکی ڕوون، کە چەناگەی سەرلەنوێ کەوتەوە لەرزین، بەخێرایی چرپاندی، "لە ڕاستیدا ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ، دەمویست کۆتایی بە ناکۆکیی نێوانمان بهێنم."

هەر هێندەی ڤێلچانینۆڤ گوێی لەم قسەیە بوو، بە شێوەیەک بەرچاوی تاریک بوو، کە چەقۆت لێ بدایە، خوێنی لێ ندەهات، وا هەستی کرد هەرگیز و بە هیچ شێوەیەک لە هەموو ژیانیدا ئاوا سووکایەتیی پێ نەکراوە.

نەڕاندی، "دیسانەوە پێت دەڵێمەوە، جەنابت بەرۆکی پیاوێکتان گرتووە، کە نیگەران و نەخۆشە... تۆ بۆیە تەنگیی پێ هەڵدەچنیت، بۆ ئەوەی هەر بەزۆر لە کاتی وڕێنەکردندا شتێکی شەیتانیی لێ هەڵبگۆزیت! ئێمە... ئێمە دوو مرۆڤین سەر بە دوو جیهانی زۆر جیاوازین، لەوە تێبگە، هەروەها... هەروەها... لەنێوانماندا گۆڕێک هەیە!"

ئەمەی دواییی بە دەنگێکی نزم و خێرا وت، لەناکاو پەیی بەوە برد، کە کەوتۆتە چ هەڵەیەکەوە...

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە کتوپڕ ڕوخساری تێک چوو و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، وتی، "تۆ چوزانیت؟ تۆ چوزانیت ئەو گۆڕە بچووکە لێرە بۆ من چ ماناگەلێک دەبەخشێت!"

پاشان هەنگاوی نا بەرەو لای ڤێلچانینۆڤ، بە شێوەیەکی پێکەنیناوی، بەڵام زۆر بەتوندی مشتی خۆی توند کردبوو، ئەیکێشا بەسەر دڵی خۆیدا، پاشان هاواری کرد، "من دەزانم

گۆڕێکی بچووک لێرە و لەم نێوانەدا هەیە، هەردووکمان، هەریەکە لە لایەکی ئەو گۆڕە بچووکە ڕاوەستاوین، بەڵام حەقی زیاتر لەو لایەیە، کە من لێی ڕاوەستاوم نەک ئەو لایەی تۆ لێی ڕاوەستاویت، زیاتر..."

بە شێوەیەک لەبەر خۆیەوە دەیچرپاند، وەک ئەوەی وڕێنە بکات، هێشتا هەر بە مشت سەر دڵی خۆی دەکووتی و لەبەر خۆیەوە دەیوت، "زیاتر، زیاتر، زیاتر..."

لەناکاو زەنگی دەرگاکە بە شێوەیەکی زۆر نائاسایی و خێرا، چەند جارێک لەسەر یەک لێدرا، بە شێوەیەک، کە هەردووکیانی لە شوێنی خۆیان ڕاچڵەکاند و بەئاگای هێنانەوە. زەنگەکە هێندە بەتوندی لێدەدرا، لەوە دەچوو ئەو کەسەی لێی دەدات، سوێندی خواردبێت هەر بە یەکەم لێدان زەنگەکە لە بن و بێخ دەر بهێنێت.

ڤێلچانینۆڤ بەشڵەژاوییەوە وتی، "ئەو کەسانەی بیانەوێت چاویان پێم بکەوێت، هەرگیز بەم شێوەیە لە زەنگ نادەن!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، کە ئەویش بە هەمان شێوە هاتبووەوە سەر خۆی، بەخوتەوبۆڵەوە وتی، "منیش بە هەمان شێوە، ئەوەی بیەوێت بمبینێت، هەرگیز بەو شێوەیە لە زەنگ نادات."

ڤێلچانینۆڤ بەخێسەکردنەوە ڕۆشت دەرگاکە بکاتەوە.

لەناو ڕاڕەوەکەدا گوێی لە دەنگی لاوێکی جوانخاس و متمانەبەخۆ بوو، دەیوت، "گەر بەهەڵەدا نەچووبم، ئێوە بەڕێز ڤێلچانینۆڤن؟"

"بەڵێ خۆمم، چیتان دەوێت؟"

لاوەکە بە هەمان دەنگی متمانەبەخۆبوونەوە بەردەوام

بووەوە لە قسەکانی، "لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە زانیاریی ئەوەم لەلایە، کە بەڕێز جەنابی ترۆسۆتسکی لەم ساتەدا لەلای بەڕێزتانە. پێویستە هەر ئێستا و بەبێ دواکەوتن چاوم پێیان بکەوێت."

گومانی تێدا نەبوو، لەو ساتەدا ڤێلچانینۆڤ حەزی دەکرد یەک شاپ بدات لە قوونی ئەو لاوە، کە هێندە متمانەی بە خۆی بوو و لە قادرمەکانەوە فڕێی بداتە خوارەوە؛ بەڵام بۆ ساتێک بیری کردەوە، پاشان خۆی کێشا بەملاوە و ڕێگەی بۆ لاوەکە کردەوە تا خۆی بکات بە ژوورەوەدا:

"فەرموون وەرنە ژوورەوە، ئەمەش بەڕێز جەنابی ترۆسۆتسکییە..."

# ١٤

## ساشنکا و نادنکا*

کوڕە لاوەکە، کە تەمەنی دەوروبەری نۆزدە ساڵێک دەبوو، هەرچەندە بە ڕوخساریدا لەوە بچووکتریش دەر دەکەوەت، خۆی کرد بە ژوورەوەدا. ڕوخساری گەلێک جوان بوو، کوڕێکی قۆز و بەویقار، هەروەها زۆر متمانەبەخۆش دەر دەکەوت. بە شێوەیەکی زۆر کەشخە خۆی گۆڕیبوو، هەرچۆنێک بێت، ئەو پۆشاکانەی لەبەری کردبوون، زۆر لێی دەهات؛ بالای کەمێک لە بالای ناوەند بەرزتر بوو، قژی ڕەش و کاکۆڵی بە لاجانگیدا هاتبووە خوارەوە، هەروەها چاوەکانیشی گەورە و ڕەش، بوێرییەکی زۆری تێدا بەدی دەکرا، هەموو ئەمانەش سەرنجڕاکێشییەکی تایبەتی بە ڕوخساری بەخشیبوو، تەنها لووتی نەبێت، کە کەمێک لێی تێک دابوو، ئەویش ئەوە بوو، گەلێک پان بوو، ئەگینا تا بڵێی لاوێکی قۆز بوو. بە شێوەیەکی زۆر سەنگین بەرەو ناوەوە هەنگاوی نا.

---

* ساشنکا و نادنکا: کورتکراوەی ناوی ئەلکساندەر و نادیژدایە، کە وەک خۆشەویستی بەو شێوەیە کورت دەکرێتەوە.

وتی، "پێم وا بێت دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخساوە، تا لەگەڵ جەنابی ترۆسۆتسکی گفتوگۆ بکەم."

بە دەنگێکی زۆر تایبەتی ئەم وشانەی دەر بڕی، بەتایبەت بە شێوەیەک دانی نا بە وشەی "دەرفەت"ەکەدا، کە داماڵرابوو لە هەرچی ئەوەی پێی بوترێت ڕێز و ئەتەکێت، ویستی بەم شێوازی قسەکردنە ئەوە لەبەرامبەرەکەی بگەیەنێت، کە بە گفتوگۆکردن لەگەڵیدا نە "شەرەفمەند" بووە نە "خۆشحاڵ"یش بووە.

ڤێلچانینۆڤ بەرەبەرە خەریک بوو لە شتێک تێدەگەیشت، بە هەمان شێوە پاڤێل پاڤلۆڤیچیش لەوە دەچوو، کە سووسەی شتێکی کردبێت، لە ڕوخساریدا جۆرێک لە دڵەڕاوکێ دەبینرا، بەڵام هەرچۆنێک بێت، تەواوی هەوڵی خۆی دا جڵەوی خۆی لەدەست نەدات. پاشان بە شێوەیەکی شکۆدارانە وەڵامی دایەوە، "شەرەفی ناسینی ئێوەم پێ نەبەخشراوە پێشم وا نییە هیچ شتێکی هاوبەش من و جەنابتان بەیەکەوە ببەستێتەوە!"

"باشتر وایە سەرەتا گوێم لێ بگرن و پاشان بۆچوونی خۆتان دەرببڕن."

لاوەکە بەوپەڕی بڕوا بەخۆبوونەوە و بە سەرزەنشتکردنەوە ئەمەی بە پاڤێل پاڤلۆڤیچ وت. پاشان چاویلکە یەکچاوییەکەی لە گیرفانی دەر هێنا، کە چوارچێوەکەی لە سەدەف دروست کرابوو، خستیە سەر چاوێکی و لێڵی و ڕوونییەکەی بەو بوتڵە شەمپانیایە تاقی کردەوە، کە لەسەر مێزەکە دانرابوو. پاشان کە بەتەواوی لە تاقیکردنەوە و لێوردبوونەوەکەی لە بوتڵەکە لێبووەوە، چاویلکەکەی بەهێواشی لەسەر چاوی لا برد، سەرلەنوێ ڕووی کردەوە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، "ئەلێکساندەر لۆبۆڤ."

"مەبەستت چییە لە ئەلێکساندەر لۆبۆڤ؟"

"ئەلێکساندەر لۆبۆڤ منم. پێشتر لەبارەی منەوە هیچت نەبیستووە؟"

"نەخێر."

"ڕاست دەکەن، چۆنچۆنی بمناسن؟ ڕاستییەکەی، من بۆ مەسەلەیەکی زۆر گرنگ لێرەم، کە بە شێوەیەکی زۆر تایبەتی پەیوەندیی بە جەنابتانەوە هەیە. ڕوخسەتم بدەن دابنیشم، زۆر شەکەتم."

ڤێلچانینۆڤ فەرمووی لێ کرد، "فەرموو دابنیشە."

بەڵام لاوەکە پێش ئەوەی خولکی دانیشتن بکرێت، دەستبەجێ دانیشت.

سەرباری ئەوەی ڤێلچانینۆڤ تا بهاتایە ئازارەکەی سەرسنگی زیادی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزی ئەم لاوە چاوقاییمە چووبوو بە دڵیدا. لە خەیاڵدانی خۆیدا لە ڕوخساری جوان و منداڵانە و پەمەییی ئەم لاوەدا شێوەی نادیای دەهاتە پێشچاو.

لاوەکە بە سەرلەقاندنێکی بێبایەخەوە ئاماژەی بە کورسییەکی بەرامبەری خۆی کرد و پێشنیاری کرد بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وتی، "تۆش بە هەمان شێوە دابنیشە."

"خۆت سەغڵەت مەکە، هەر بەپێوە دەبم."

"بەڵام ماندوو دەبن. تۆش بەڕێز ڤێلچانینۆڤ، پێم وا بێت پێویست ناکات ئێرە بەجێ بهێڵن، ئەگەر پێتان خۆش بوو، دەتوانن بمێننەوە!"

"پێویست ناکات بۆ هیچکوێ بڕۆم، ماڵ ماڵی خۆمە!"

"هەرچۆنێک پێتان خۆشە. ڕاستییەکەی دانی پێدا دەنێم، کە

گەلێک خۆشحاڵیش دەبم کە بەشدار ببن لەو ڕوونکردنەوانەی دەیدەم بەم پیاوە بەڕێزە. نادیژدا فیدۆسیڤنا، زۆر بەڕێزەوە بە شانوباڵی ئێوەدا بۆی هەڵداوم."

"بەڕاست! بەڵام پێم ناڵێن چۆن دەرفەتی دەست کەوت تا باسی منت لەلا بکات؟"

"هەر ڕێک دوای ئەوەی ئێوە لەوێ ئۆغرتان کرد. خۆشم بە هەمان شێوە ئێستا هەر لەوێوە هاتم بۆ ئێرە."

پاشان ڕووی وەر چەرخاند بەرەو لای پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە هێشتاش هەر بەپێوە ڕاوەستابوو، وتی، "تۆش جەنابی تروسۆتسکی، مەسەلەیەک هەیە دەمەوێت لەسەری قسەتان لەگەڵ بکەم. ئێ - واتا من و نادیژدا فیدۆسیڤنا، بەردەوام بوو لە قسەکردن، لە کاتێکدا شانی دادابوو لەسەر کورسییە دەسکدارەکەی، وشەکانی بەوردی و دانەدانە بەدوای یەکدا دەر دەبڕی. "زۆر لەمێژە یەکترمان خۆش دەوێت و هەردووکمان بەڵێنی هاوسەرگیریمان داوە بە یەکتر. ئێستاش جەنابت بوویتەتە بەربەست لە ڕێماندا، هاتووم تا پێشنیاری ئەوەتان بۆ بکەم، کە باشترە لەم مەسەلەیە بکشێنەوە. ئایا ئامادەن مل بدەن بۆ پێشنیارەکەم؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هێندەی نەمابوو بە قنگدا بکەوێت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بەڵام خێرا بزەیەکی شەیتانی کەوتە سەر لێوەکانی و پاشان بەپوختی و بەڕوونی وتی، "نەخێر، بە هیچ شێوەیەک مل نادەم."

لاوەکە لەسەر کورسییەکەی کەمێک وەر چەرخا و لاقی خستە سەر لاق، پاشان وتی، "ئەها! کەواتە بەم شێوەیەیە!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ ئەمەشی خستە سەر قسەکانی، "ئەسڵەن

من هەر نازانم ئەم کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەم کێیە، لە ڕاستیدا لەو بڕوایەدام، کە هیچ خاڵێکی هاوبەش لەنێوان من و تۆدا نەبێت، تا بەردەوامی بدەین بە گفتوگۆکەمان.‟

هەر کە ئەم وشانەی دەر بڕی، وای بە باش زانی ئەمیش بە هەمان شێوە دابنیشێت.

لاوەکە بەلامسەرلاییەوە وتی، ”پێم وتن کە ماندوو دەبن. هەر ئێستا خۆم پێ ناساندن و پێم وتن ناوم ئەلێکساندەر لۆبۆڤە، من و نادیژدا بەڵێنمان بە یەکتر داوە، بۆیە ناکرێت خۆتان لە گێلی بدەن و بڵێن نازانن ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەن کێیە! هەر وەک ئێستا کە خۆتان واتان وت! ناشتوانن خۆتان بەوە هەڵبخەڵەتێنن، کە هیچ شتێک نییە لەنێوان من و تۆدا تا قسەی لەسەر بکەین!‟

ڤیلچانینۆڤ لەژێر لێوەوە وتی، ”تۆ سەیری ئەم سەلکەسەگە!‟

پاڤێل پاڤلۆڤیچ تۆزێک خۆی ڕێک کردەوە و بەویقارەوە وتی، ”بە هەرحاڵ، بەڕێزم، من هیچ بیانوویەک نابینم بۆ ئەو شتانەی باست کردن، تەنانەت بیانووەکانیشت نەک هەر جێگەی قەناعەت نین، بگرە زۆریش جێگەی گومانن و بەسە بۆ ئەوەی چیی تر بەردەوامی نەدەین بە گفتوگۆکەمان. وای دەبینم کە سەرتاپای ئەم بابەتە لە کارێکی گەمژانە و هەرزەکارانە زیاتر، چیی دی نییە. سبەینێ خۆم پرسوجۆیەکی ئەمە لەگەڵ هاوڕێی زۆر بەحیشمەتم، فیدۆسی سیمیۆنۆڤیچ دەکەم و ئێستاش تکاتان لێ دەکەم، هەرچی زووترە، لێرە ئۆغر بکەن.‟

لاوەکە چیی تر نەیتوانی هەر بەو لامسەرلایی و بێبایەخییەوە

بمێنێتـەوە، زۆر بەتامەزرۆییـیـەوە ڕووی کـردە ڤێلچانینـۆڤ و هـاواری کـرد، "چـاوت لێیـە ئەمـە چ جۆرە بنیادەمێکـە؟ هێـندەی بـەس نەبـووە کـە ئەمـڕۆ هـەر بـۆ ڕابـواردن زمانیـان لـێ دەر هێنـاوە و بـە شـاپان لـەوێ کردوویانەتـە دەرەوە - کەچـی بەتەمایـە سـبەینێش بڕواتـەوە و باسـی چیرۆکـی ئێمـە بـۆ ئـەو پیرەپیاوە بکات! کەواتـە پێـم بڵـێ، ئـەی پیـاوی ڤیرسـیچمە، ئایـا بەمـە نایسـەلمێنیت کـە دەتەوێت هـەر بـەزۆر ئـەو کچـە بەدەسـت بخـەیت، دەتەوێت لـە خـەڵکێکی خەڵەفاوی بکڕیت، کـە هێشـتاش بیـری وەحشـیگەری و دواکەوتـووی کۆمەڵایەتـی وڵاتەکەمـان بەسـەریاندا زاڵـە و ئازادییەکانـی ئافـرەت زەوت دەکـەن؟ باشـە هێنـدە بـەس نەبـوو بـۆت، کـە ئـەو بـە چاوێکـی سـووک لێـی ڕووانیویت؟ هێنـدە بەس نەبووە بۆت، کە هـەر ئەمـڕۆ دیارییـە ناشاییسـتەکەتی بـۆ گەڕاندبوویتـەوە؟ بازنەکـەت؟ لەمـە زیاتـر چیـی تـرت دەوێت؟"

پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ بەحەپەسـاوییەوە وتـی، "هیـچ کەسـێک بازنەکەمـی بـۆ نەگێڕاومەتـەوە! ئەسـڵەن ئـەوە مەحاڵـە!"

"مەحاڵـە؟ ئەتەوێت بڵێیت تـا ئێسـتا بەڕێـز ڤێلچانینـۆڤ بازنەکـەی بـۆ نەگێڕاویتەتـەوە؟"

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "دەک بەنەفرەت بیت!"

پاشـان ڕووی کـردە پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ و بەمۆنییـەوە وتـی، "ڕاستییەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ، نادیژدا فیدۆسیڤنا داوای لێ کردم ئـەم سندوقچەیەت بۆ بگێڕمـەوە، هەرچەنـدە ڕەتم کـردەوە ئـەم کارە بکـەم، بـەڵام زۆر لێـم پاڕایـەوە... بەڕاسـتی جاڕز بـووم... فەرمـوو ئـەوەش سـندوقچەکەت..."

سـندوقچەکەی لـە گیرفانـی دەر هێنـا، زۆر لـە حاڵـی خـۆی

تەریق بووەوە، لە بەردەم پاڤێل پاڤلۆڤیچدا دای نا، کە لە گێژیدا وڕوکاس ببوو.

لاوەکە ڕووی کردە ڤێلچانینۆڤ و بە زمانێکی زبر وتی، "بۆچی پێشتر بۆت نەگێڕابووەوە؟"

ڤێلچانینۆڤ بە ڕوویەکی تاڵەوە وەڵامی دایەوە، "هەر وەک دەبینیت، تا ئەم ساتەش دەرفەتم بۆ نەڕەخسابوو بۆی بگێڕمەوە."

"بەڕاستی سەیرە!"

"چیییییییییییی؟"

"پێویستە دان بەوەدا بنێیت، کە ئەمە بەڕاستی سەیرە، بە هەرحاڵ، هەرچۆنێک بێت، من ئامادەم قاییل ببم بەوەی کە ڕەنگە بە هەڵەتێگەیشتن ڕووی دابێت."

ڤێلچانینۆڤ لەو ساتەدا مەیلێکی زۆر بەهێزی تێ گەڕابوو، کە یەکسەر لە شوێنی خۆی ڕاست ببێتەوە و توند گوێچکەی ئەو هەتیوە چەقاوەسووە لە بنا دەر بهێنێت، تەمبێی بکات لەسەر بێڕێزیکردنی بەرامبەر بە گەورەتر لە خۆی، بەڵام نەیتوانی لەسەر دڵگەرمییەکەی بەردەوام ببێت و لەپڕ دای لە قاقای پێکەنین، لاوەکەش بە هەمان شێوە دەستبەجێ دای لە قاقای پێکەنین. بەڵام شتەکە بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ تەواو جیاواز بوو، ئەگەر لەو ساتەدا ڤێلچانینۆڤ، لە کاتێکدا بە لۆبۆڤ پێدەکەنی، دەرفەتی ئەوەی هەبووایە سەرنجێکی ڕوخساری سامناکی پاڤێل پاڤلۆڤیچی بدابا، کە بە چ شێوەیەکی تۆقێنەر لێی دەڕوانێت، ئەوە هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە لە وەها ساتێکدا بەو شێوەیە بدات لە قاقای پێکەنین، چونکە لەو ساتەدا لە ڕوخساری پاڤێل

پاڤلۆڤیچدا پەیی بە تووڕەییەکی زۆر تۆقێنەر و سەرشێتانە دەبرد، کە بۆی هەبوو تووڕەبوونەکەی ئەو زەلامە کارەساتی نەخوازراوی لێ بکەوێتەوە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە کە ئەو نیگایەی پاڤێل پاڤلۆڤیچی نەبینی، هەستی کرد پێویستە لەسەری لایەنگریی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بکات.

پاشان بە دەنگێکی هاوڕێیانە دەستی بە قسەکردن کرد، "گوێ بگرە بەڕێز لۆبۆڤ، بەبێ ئەوەی خۆم بهاوێژمە ناو گفتوگۆیەکی نەخوازراو و هەندێک هۆکار و وردەکاریی زیادەوە، کە لە ڕاستیدا ئەوە بە ئیشی خۆم نازانم و تا پێشم بکرێت خۆمی لێ بەدوور دەگرم، دەمەوێت سەرنجت بەلای چەند ڕاستییەکدا ڕابکێشم، قسەی دروستیش لەوەوەیە، کە یەکەمن، پاڤێل پاڤلۆڤیچ ئەگەر بێت و داخوازیی نادیژدا فیدۆسێڤنا بکات و مارەی بکات، ئەوا لە زۆر ڕووەوە لە جەنابتان لەبەرترن، لەبەر ئەوەی زۆر بەباشی لەلایەن ئەو خێزانەوە کەسایەتییەکەی ناسراوە، دووەم، پاڤێل پاڤلۆڤیچ خاوەنی پۆستێکی بەرز و ئابڕوومەندە، لە کۆتاییشدا، سەروەت و سامانەکەشی لەولاوە بوەستێت، هەر بۆیە ئەمە شتێکی زۆر سروشتییە کاتێک پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەست بە سەرسووڕمانێکی زۆر بکات لە کاتێکدا هاوتایەکی وەک جەنابتان لەبەرامبەر خۆیدا دەبینێتەوە. ڕەنگیشە تۆش بە هەمانشێوە خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی تایبەت بە خۆت بیت، بەڵام هەر لەبەر ئەوەی هێشتا تەمەنت زۆر کەمە و جارێ زۆر گەنجیت، بۆیە بۆ ئەو گەلێک دژوارە تا بە چاوی ڕکابەرێکی هاوشانی خۆی لێت بڕوانێت... هەر بۆیە ئەوە شتێکی زۆر ڕەوایە، کە داواتان لێ بکات کۆتایی بەم گفتوگۆیە بهێنن."

"مەبەستت چییە لەوەی کە دەڵێیت تەمەنم زۆر کەمە؟ مانگێک دەبێت بوومەتە نۆزدە ساڵ. بەپێی یاساش بێت، زۆر لەمێژ بوو دەمتوانی هاوسەرگیری بکەم. ئەمە هەموو شتێکە کە دەتوانم بۆتان ڕوون بکەمەوە."

"بەلام پێم نالێیت چ باوکێک ئامادەیە لە دۆخێکی ئاوادا قاییل ببێت بەوەی کچەکەی خۆیت پیشکەش بکات؟ تەنانەت گریمان ئەگەر بشبێت بە ملیۆنەر یاخود لە داهاتوودا ببیت بە کەسایەتییەکی ناسراوی ناو مرۆڤایەتییش؟ کەسێک لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ناتوانێت بە بەرپرسیارێتییەکانی خۆشی هەستێت، ئێستا پێم نالێیت چۆن دەتوانێت بەرپرسیارێتیی داهاتووی مرۆڤێکی تر هاوشێوەی خۆی منداڵ لە ئەستۆ بگرێت! ڕەنگە پێت وا بێت ئەمە کارێکی تەواو ئابڕوومەندانەیە؟ ئەوەیشی کە پرکێشیی ئەوەم کرد کە بەم شێوە ڕاشکاوانە قسەتان لەگەڵ بکەم، هەر لەبەر ئەوەی خودی خۆت کەمێک بەر لە ئێستا منت کرد بە نێوەندێک لەنێوان خۆت و پاڤێل پاڤلۆڤیچدا.

لاوەکە وتی، "ئەها، بەڵێ بەدڵنیاییەوە، ناوی پاڤێل پاڤلۆڤیچە! بەلام نازانم بۆچی پێم وا بوو ناوی ڤاسیلی پیترۆڤیچە؟"

پاشان بەردەوام بووەوە و ڕووی کردە ڤێلچانینۆڤ، وتی، "بەڵێ، لە ڕاستیدا وتەکانی ئێوە تۆزقاڵێکیش چییە تووشی سەرسووڕمانی نەکردم، دەمزانی هەمووتان هەر لەیەک دەچن! هەرچەندە بەلامەوە گەلێک سەیرە، چونکە ئەوان بە شێوەیەک باسی تۆیان بۆ کردم، پێم وا بوو ڕەنگە کەسێکی زۆر نوێخواز بیت. بەلام وا بزانم ئەوانە هەمووی قسەی

قۆڕ بوون، هەرچەندە ئێوە زۆر بەسەربەستی ئەوەتان وت کە بەحساب ئەوەی من دەیکەم کارێکی نەشیاو و نائابڕوومەندانەیە، بەڵام خودی خۆم تەواو پێچەوانەکەی بە ڕاست دەبینم، هیواخوازیشم بتوانم ئەوەتان بۆ بسەلمێنم. حەز دەکەم لەوەوە دەست پێ بکەم، کە ئێمە هەردووکمان پەیمانمان بە یەکتر داوە، دواتریش، من بە شەرەفی خۆم لە بەردەم دوو شایەتدا بەڵێنم پێ داوە، کە ئەگەر هات و ڕۆژێک لە ڕۆژان کەوتە داوی خۆشەویستیی کەسێکی ترەوە یاخود لە هاوسەرگیریکردنی لەگەڵ من پەشیمان بووەوە و ویستی لێم جیا ببێتەوە، ئەوا من دەستبەجێ گەواهینامەیەکی فەرمیی لەسەر ناپاکیم بەرامبەری پڕ دەکەمەوە و ڕوونیشی دەکەمەوە، کە ناپاکیی هاوسەرگیریم لەگەڵیدا کردووە، بەمەش وا دەکەم بتوانێت بەئاسانی تەڵاقی خۆی وەر بگرێت. هەر بەوەشەوە ناوەستم، بەڵکوو پێشبینیی ئەوەشمان کردووە، کە ئەگەر هات و لە داهاتوودا من لە پێدانی وەها گەواهینامەیەک پاشگەز بوومەوە و قسەکەی خۆم نەبردە سەر، ئەوا لەم حاڵەتدا بۆ بردنەسەری ئەم پەیمانە، لە ڕۆژی ئاهەنگی گواستنەوەکەیدا، ئەوە سەنەدێکی سەد هەزار ڕۆبڵیی بۆ واژۆ دەکەم و دەیخەمە دەستیەوە، ئەمە ئەگەر هات و پابەند نەبووم بە گەواهینامەکەوە، قایل نەبووم بە جیابوونەوە لێی، ئەوا ئەو کاتە ئەو دەتوانێت دەستبەجێ ئەو سەنەدە لە دژم بەکار بهێنێت و بە هۆیەوە لە زیندانم بنێت. بەم شێوەیە ئەگەر کەمێک ورد ببنەوە، ئەوا دەبینن کە پێشوەختە پێشبینیی هەموو ئەگەرێکمان کردووە و ڕێگەشمان بۆ داناوە، منیش هەرگیز ئامادەی ئەوە نیم کە لەسەر حسابی خۆم

یاریی بە داهاتووی هیچ کەسێکی ترەوە بکەم و داهاتووی بخەمە مەترسییەوە، کە ئەمەش بەر لە هەموو شتێکە.“

ڤێلچانینۆڤ هاواری کرد، ”گرێو دەکەم ئەمە هەمووی ئەو هەتیوە - ناوی چی بوو؟ - ئا، بەڵێ، بیرم کەوتەوە، پرێدپۆسیلۆڤ، هەموو ئەمانە لە داهێنانەکانی ئەوە بۆ تۆ!“

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە شێوەیەکی زۆر ڤیزەوون دای لە قاقای پێکەنین، ”ها، ها، ها، ها!“

”ئەریّ بەڕاست ئەم برادەرە بەڕێزە بە چی پێدەکەنێت؟ بەڵێ، پەیپێبردنەکەی ئێوە تەواوە، ئەمە بیرۆکەی پرێدپۆسیلۆڤ بوو، ئەبێت جەنابت دان بەوەدا بنێیت، کە بیرۆکەکەی بەڕاستی بیرۆکەیەکی دانایانەیە. بە هۆی ئەوەوە یاسا پووچەکان بەتەواوی لە کار دەخرێت. بەدڵنیاییەوە، بەڵێنم بە خۆم داوە نادیام بۆ هەتاهەتایە خۆش بوێت، خودی نادیاش ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی نائاسایی بە پێکەنینی دەهێنێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەم بیرۆکەیە بەتەواوی دانایانەیە و پێویستە قاییل ببیت بەوەی کارێکی تەواو ئابڕوومەندانەیە و بگرە هیی ئەوەش نییە هەموو پیاوێک خۆی لە قەرەی بدات!“

”بەڵام بە بڕوای بەندە، ئەم کارە نەک هەر ئابڕوومەندانە نییە، بگرە کارێکی تەواو ناپەسەندیشە.“

لاوەکە، وەک ئەوەی گاڵتەی بە قسەکەی ڤێلچانینۆڤ بێت، شانێکی هەڵتەکاند و پاش ساتێک بێدەنگی وتی، ”حەز ئەکەم جارێکی تریش پێتان بڵێمەوە، کە قسەکەتان بە هیچ شێوەیەک تووشی سەرسووڕمانی نەکردم، ئەسڵەن زۆر لەمێژە بڕیارم داوە بەو جۆرە شتانە سەرم نەسووڕمێت. پێم وا بێت پرێدپۆسیلۆڤ بەڕوونی ئەوەی بەبیر هێنابوونەوە، کە

جەنابتان زۆر لەوە لاوازترن کە بتوانن پەی بەو جۆرە شتانە ببەن، هەرچەندە ئەگەر ئەو شتانە زۆر سروشتی و سادەش بن، هۆکاری بۆگەنکردن و تێکچوونی هەرە سادەترینی هەستەکانتان و بیرۆکەکانتان، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژیانە پووچ و بێمانایەی لەمێژە بەو شێوەیە دەیگوزەرێنن، هەروەها ئەو بەتاڵی و بێکارییەشتان هۆکارێکی ترە لەو هۆکارانە. ڕەنگە هەر ئەمەش ببێتە هۆکاری لەیەکترتێنەگیشتنمان، بەڵام بە هەرحاڵ، ئەوان سەبارەت بە تۆ زۆر بەچاکی دەدوان... پێم وا بێت ئیوە تەمەنتان پەنجا ساڵە، وایە؟"

"ببوورن، ئەکرێت لە بابەتەکە لا نەدەن و بێنەوە سەر بابەتە سەرەکییەکە!"

"تکایە بمبوورن بۆ دەمشڕییەکەم و جاڕز مەبن، مەبەستم هیچ شتێکی تایبەتی نەبوو. دێمەوە سەر باسەکەی خۆمان و بەردەوام دەبم: من لە داهاتوودا نابم بە ملیۆنەر بەو شێوەیەی ئێوە بیرتان لێ کردبۆوە، چ بیرۆکەیەکی پێکەنیناوییە! من خاوەنی هیچ شتێک نیم، هەر ئەوەم کە ئێستا دەمبینیت، بەڵام بڕوای تەواوم بە داهاتووی خۆم هەیە. هەروەها من نە دەبم بە قارەمان و نە دەشبم بە ناودارێکی مەزن بۆ مرۆڤایەتی. بەڵام ئەتوانم ئاگام لە خۆم و خێزانەکەم بێت، ڕاستە هەنووکە من خاوەنی هیچ شتێک نیم، تەنانەت بۆ زانیارییشت، من هەر لە منداڵییەوە لە ماڵەکەی ئەواندا گۆش کراوم..."

"چۆن چۆنی؟"

"بەڵێ، هەر وەک دەبینن، من کوڕی یەکێک لە خزمە دوورەکانی ژنەکەی زاخلیبینینی پیرم، کاتێک هەموو کەسوکارەکەم لەدەست دا، ئەو کاتە من تەمەنم تەنها

هەشت ساڵ بوو، ئیتر پیرەپیاویش منی هێنایە لای خۆیان و بەرپرسیارێتیی بەخێوکردنی منی گرتە ئەستۆی خۆی، دواتریش ناردمیە قوتابخانەی ئامادەیی. ئەو بەڕاستی پیاوێکی سروشتباشە، هەڵبەت ئەگەر بەلاتانەوە گرنگ بێت...»

«ئەوە دەزانم.»

«بەڵێ، هەرچەندە بیرکردنەوەکانی کەمێک کۆن و بەسەرچوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلێک بەخشندە و میهرەبانە. بەڵێ، بەدڵنیاییەوە لەمێژە لەژێر بەرپرسیارێتیی ئەو هاتوومەتە دەرێ، دەمەوێت خۆم لەسەر پێی خۆم ڕابوەستم و پشت بە هیچ کەسێک نەبەستم بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی خۆم و نامەوێت چاوبەرەوژێری هیچ کەسێک بم.»

ڤێلچانینۆڤ، کە مەیلی زانینی تێ گەڕابوو، کونجکاوانە پرسیی، «لەکەییەوە سەربەخۆیی خۆتت بەدەست هێناوە؟»

«نزیکی چوار مانگێک دەبێت.»

«ئەها، کەواتە ئێستا هەموو شتێک ڕوون بووەوە، ئێوە هاوڕێی منداڵیی یەکترن! ئەی هیچ ئیش و کارێک ئەنجام دەدەیت؟»

«بەڵێ، کارێکی تایبەتم هەیە، لەلای دادنووس مانگی بە بیستوپێنج ڕۆبڵ ئیش دەکەم. هەرچەندە ئەمە بۆ ماوەیەکی کاتییە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کاتەی لێی چوومە پێشەوە و داوام کرد، ئەوەشم نەبوو. ئەو کاتە لە بەشی خزمەتگوزاریی هێڵی ئاسنین، مانگی بە دە ڕۆبڵ ئیشم دەکرد، بەڵام هەموو ئەم ئیشانە کاتین.»

«مەبەستت لە چوونەپێشەوە ئەوەیە، کە خوازبێنیت کرد؟»

"بەڵێ، بە شێوەیەکی فەرمی خوازبێنیم کرد، ماوەیەک بەر لە ئێستا - نزیکەی سێ هەفتەیەک دەبێت."

"زۆر باشە، ئەی چی ڕووی دا؟"

"سەرەتا باوکەکە بە شێوەیەکی زۆر تۆقێنەر دای لە قاقای پێکەنین، پاشان بە شێوەیەکی تۆقێنەریش تووڕە بوو، ئەو کچە داماوەشی لە نهۆمی سەرەوەدا حەپس کرد. بەڵام نادیا زۆر قارەمانانە بەرگریی کرد و ملی نەدا. بەڵام ئەزانیت، هەموو ئەمانە هەر لەبەر ئەوە بوو، کە پێشتر باوکەکە کەمێک ڕقی لێم بوو، ڕقەکەشی لەوەوە بوو، کە ئەو فەرمانگەیەم بەجێ هێشتبوو، کە چوار مانگ بەر لە ئێستا لەوێ جێگەی بۆ کردبوومەوە، هەڵبەت ئەمە پێش ئەوەی بچمە سەر کاری هێڵی ئاسنینەکە. ئەو پیرەپیاوێکی زۆر باشە، هەر وەک پێشتریش ئاماژەم پێ کرد، ئەو لە ماڵەکەی خۆیدا کەسێکی تا بڵێی سادە و ڕووخۆشە، بەڵام ناتوانیت ئەوە بهێنیتە بەرچاوی خۆت، کاتێک دەچێتە ئۆفیسەکەی، چ زەلامێکی لێ دەر دەچێت! ڕێک وەک جۆڤی* لێدێت! هەڵبەت من لەوێ کارێکم کرد و بە شێوەیەکی زۆر سروشتی تێم گەیاند، کە هەڵسوکەوتەکانی بە هیچ شێوەیەک جێگەی سەرنجم نین. بەڵام تاوانباری ڕاستەقینە لەو مەسەلەیەدا جەنابی جێگری بەڕێوەبەر بوو، ئەم پیاوە بەڕێزە وای ئاخنیبووە مێشکی بەڕێوەبەرەکەوە، کە بەحساب من قسەی ڕەقم بەرامبەری بەکار هێناوە، لە کاتێکدا من تەنها پێم وتبوو کە کەسێکی

---

* جۆڤ: یاخود ژوپیتێر Jopiter، خواوەندی ئەفسانەییی ڕۆمانییەکان، خواوەندی خواوەندەکانە، خواوەندی ئاسمان و هەورەبرووسکەیە، یەکێکە لە تووڕەترین خواوەندەکان.

ناشایستەیە. ئیتر بەم شێوەیە وازم لە هەموو شتێکیان هێنا و ئێستاش بۆ خۆم لای دادنووسێک کار دەکەم."

"ئەی لەو فەرمانگەیە مووچەکەت باش بوو؟"

"ڕاستییەکەی نەخێر، چونکە من تەنانەت لە ڕیزی فەرمانبەرە ئاساییەکانیش نەبووم! خودی زاخلیبینینی بەساڵاچوو مووچەکەی پێ ئەدام، هەر وەک پێم وتن، ئەو مرۆڤێکی زۆر باشە. بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو، کە دانوومان بەیەکەوە نەدەکوڵا، هەرچۆنێک بێت، ئێمە کۆڵ نادەین! بەدڵنیاییەوە بیستوپێنج ڕۆبڵ بەشی ژیانی ژن و مێردایەتی ناکات، بۆیە بەهیوام بەم زووانە پشکێکم لە بەڕێوەبردنی موڵکەکانی کۆنت زاڤیلیسکی چنگ بکەوێت، کە ماوەیەکە کارەکانی هەمووی ترشاوە بەسەر یەکدا، ئەو کاتە مووچەکەم دەفڕێت بۆ سێ هەزار ڕۆبڵ، خۆ ئەگەر ئەوەش سەری نەگرت، هەوڵ دەدەم ببم بە پارێزەر. خەڵکی لەم سەردەمەدا هەر بە ڕێی دادگاکانەوەن... ئاها! چ هەورەتریشقەیەک بوو! پێدەچێت زریان هەڵبکات، خوا بەوە ڕەحمی کرد، پێش ئەوەی زریانەکە هەڵبکات، گەیشتمە ئێرە، بە پێ هاتم، تەقریبەن نیوەی ڕێگەکەم بەڕاکردن تەی کرد."

"بەڵام بمبوورە، ئەگەر بەو شێوەیەیە کە خۆت باست لێوە کرد، تێم ناگەیەنیت چۆن کاتی ئەوەت دەست کەوت لەگەڵ نادیژدا فیدۆسیڤنا قسە بکەیت، بەتایبەتی کە دەڵێیت ئەوان هەنووکە پێشوازیت لێ ناکەن لە ماڵەکەی خۆیاندا؟"

"بەڵام خۆ پیاو دەتوانێت لەسەر پەرژینەکەوە قسەی لەگەڵدا بکات! ئایا سەرنجی کچە قژخورماییەکەت دابوو؟"

وای وت و پێکەنی، پاشان بەردەوام بووەوە لە قسەکانی،

"ئەو و ماری نیكیتیشنا زۆر هاوكاریی ئەو دووانەمان دەكەن، ئاھ ئەو ماری نیكیتیشنایە بەس بەتەنها خۆی شەیتانێكە بۆخۆی!... بەڵام پێم بڵێن بۆ دادەچڵەكێن، ئایا لە هەورەتریشقە دەترسن؟"

"نەخێر، تەندروستیم باش نییە، تەندروستیم زۆر خراپە..."

ڤێلچانینۆڤ لەتاو ئازاری سنگی، هەستایە سەر پێ و هەوڵی دا كەمێک لەناو ژوورەكەدا هاتوچۆ بكات.

"ئاھ كەواتە بمبوورن كە بێزارم كردن، خۆتان نارەحەت مەكەن، هەر ئێستا دەڕۆم!"

پاشان لاوەكە لەسەر كورسییەكەی هەستا بۆ ئەوەی بڕوات، بەڵام ڤێلچانینۆڤ زۆر بەنەزاكەتەوە و بە زمانێكی شیرین وتی، "نا، نا! بە هیچ شێوەیەک ئێوە بێزارتان نەكردووم، شتێكی هێندە گرنگ نییە."

"چۆن گرنگ نییە؟ كاتێک كۆبیلنیكۆڤ ئازاری گەدەی هەبوو*... ئەمەت بیر دێت لە شچدریندا؟ ئایا تۆ شچدرینت خۆش دەوێت؟"

"بەڵێ."

"منیش بە هەمان شێوە. زۆر باشە ڤاسیلی... ئا، ببوورە، پاڤێل پاڤلۆڤیچ، وەرە با كۆتایی بەم مەسەلەیە بهێنین!" بە شێوەیەک وای وت و ڕووی كردە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، هێندەی نەمابوو بدات لە هارەی پێكەنین، "بۆ ئەوەی بەباشی لە قسەكانم تێبگەیت، جارێكی تریش پرسیارەكەمت بۆ دووبارە

---

* ئەم دێڕە "كاتێک كۆبیلنیكۆڤ ئازاری گەدەی هەبوو،" ئەمە دێڕی یەكێک لە چیرۆكەكانی گەورەڕۆماننووسی هەجووی ڕوسی، میخائیل یۆگرافیمەیچ سالتیكۆڤ شچدرینە، كە لە ساڵی ١٨٢٦ بۆ ١٨٨٩ ژیاوە.

دەکەمەوە، ئایا ئامادەیت سبەینێ لە ئامادەبوونی مندا بە شێوەیەکی فەرمی کشانەوەی خۆت لەم خوازبێنییە سەبارەت بە نادیژدا فیدۆسێڤنا پێشکەش بە دایک و باوکی بکەیت و بەوپەڕی ڕێزەوە بڕۆیت بە ڕێگەی خۆتەوە؟"

"بەوپەڕی دڵنیاییەوە نەخێر."

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان شێوە لەسەر کورسییەکەی بەوپەڕی بێئۆقرەییەوە هەستا و بە تۆنێکی لووتبەرزانەوە درێژەی دایەوە بە قسەکانی، "هەر بۆیە جارێکی تریش داواتان لێ دەکەمەوە، کە هەرچی زووترە لێرە بڕۆن و ئاسوودەییم مەشێوێنن... چونکە هەموو ئەمانە لە هەڵسوکەوتێکی هەرزەکارانە و گەمژانە زیاتر، چیی دی نییە!"

لاوەکە پەنجەی هەڕەشەی بەرز کردەوە و ئاڕاستەی پاڤێل پاڤلۆڤیچی کرد، بە زەردەخەنەیەکی لووتبەرزانەوە وتی، "باشترە ئاگاداری خۆتان بن! هەوڵ بدەن لە ژماردنەکەتاندا هەڵە نەکەن! دەزانیت هەر هەڵەیەکی سادە، چارەنووستان بەرەو کوێوە دەبات؟ لە ئێستاوە ئاگادارت دەکەمەوە، کە ئەگەر دوای نۆ مانگی تریش بگەڕێیتەوە، لە کاتێکدا کە ڕەنگە پارەوپولێکی زۆریشت لەم ڕێگەیەدا بەخەرج دابێت، خۆشت تووشی سەرئێشەیەکی زۆر کردبێت، ئەوە دڵنیا بە هەر ناچار دەبێت دەستبەرداری نادیژدا فیدۆسێڤنا ببیت، ئەگەریش هات و دەستبەرداری نەبوویت، ئەوا ئەو کاتە ڕووبەڕووی کێشە و سەرئێشەی زیاتر دەبیتەوە، دڵنیا بە کە زۆر خراپ بەسەرتدا دەشکێتەوە!

"پێویستە ئاگادارتان بکەمەوە کە جەنابتان هاوشێوەی سەگێکن، هەڵبەت بمبورن کە وا دەڵێم، ئەمە تەنها بۆ

لێکچوواندنە، کە لەسەر ئاخوڕێک پاڵ کەوتووە، نە خۆی دەیخوات و نە ئەشهێڵێت کەسانی تریش لێی بخۆن. دووبارە لەبەر چاکەی خۆتان و لەبەر هەستی مرۆڤایەتی، پێتان دەڵێمەوە، کە بەباشی بیر لەم مەسەلەیە بکەنەوە، هیچ نەبێت ئەگەر تەنها بۆ یەک جاریش بووە لە ژیانتانا کەمێک بەژیری بیر بکەنەوە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەتوورەییەوە هاواری کرد، "تکاتان لێ دەکەم بەم شێوەیە ئامۆژگاریی من مەکەن! لەسەر ئەم توانجە چەپەڵانەشت... لە سبەینێ زووتر نییە کە ڕێ و شوێنی تایبەت دەگرمە بەر، ڕێ و شوێنی نوێ!"

"توانجی چەپەڵ؟ مەبەستت چییە لەوە؟ دیارە خۆت کەسێکی زۆر چەپەڵیت، بۆیە بەو شێوەیە لە قسەکانم گەیشتوویت و لە مێشکی خۆتدا وا لێکت داوەتەوە! بە هەرحاڵ، من قاییلم بەوەی تا سبەینێش چاوەڕوان ببم، بەڵام ئەگەر... ئاخ، دیسانەوە هەورەبروسکەیە!"

تەماشایەکی ڤێلچانینۆڤی کرد و سەرێکی بۆ دانەواند و وتی، "بە خواتان دەسپێرم، گەلێک خۆشحاڵ بووم بە ناسینتان."

پاشان بەتالووکە بۆی دەر چوو، ئاشکرا بوو کە پەلەی ئەوەی بوو، پێش ئەوەی لێزمەباران دابکات و تەڕ ببێت، بگەڕێتەوە.

# ١٥

# حسابەکە یەکلایی دەبێتەوە

هەر هێندەی لاوەکە بەجێی هێشتن، پاڤێل پاڤلۆڤیچ خۆی گەیاندە لای ڤێلچانینۆڤ و هاواری کرد، "چاوت لێیە؟ چاوت لێیە؟"

ڤێلچانینۆڤ بەلامسەرلاییەوە وتی، "بەڵێ، تۆ زۆر بێبەختیت!"

ئەگەر ئەو ئازارەی سەرسنگی نەبووایە کە زۆر بەتوندی ئازاری دەدا و هەتا بهاتایە ئازارەکەشی زیادی دەکرد، ئەوە بێ شک هەرگیز ئەو وشانەی بە زاردا نەدەهات.

"هەمووی لەبەر ئەوە بووە، کە هەستت بە بەزەیی کردووە بەرامبەرم، بۆیە بازنەکەت بۆ نەگێڕاومەتەوە، ئایا وا نەبووە؟"

"نەخێر، تەنها لەبەر ئەوەی دەرفەت نەبوو..."

"ڕەنگە تۆ وەک هاوڕێیەکی ڕاستەقینە، حەزت نەکردبێت دڵم بشکێنیت؟"

ڤێلچانینۆڤ، کە لە تووڕەییدا خەریک بوو دیقی دەکرد، هاواری کرد، "ئاییی، بەڵێ، بەزەییم بە حاڵتدا هاتەوە!"

هەرچۆنێک بێت، ڤێلچانینۆڤ بەکورتی و بەپوختی هەموو

شتێکی بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ گێڕایەوە. تێیگەیاند کە بە چ شێوەیەک بازنەکە گەڕێندراوەتەوە بۆی، هەروەها بۆی باس کرد کە چۆن نادیژدا فیدۆسیێڤنا تەقریبەن ناچاری کردووە هاوکار ببێت لە گەڕانەوەیدا...

"ڕەنگە لەوە تێبگەیت، کە هیچ شتێکی تر نەیدەتوانی ناچارم بکات کە بازنەکە وەر بگرم، چونکە کێشەو سەرئێشەکانی خۆم هێندە کەم نین، تا سەرئێشەی تریش بۆ خۆم دروست بکەم!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بزەیەکی کرد و وتی، "تۆش فریوت خوارد و وەرت گرت؟"

"قسەی قۆڕ دەکەیت، بەڵام هەرچۆنێک بێت، لەو قسەیەت دەبوورم، چونکە هەر وەک ئێستا خۆشت بینیت، ئەوەی جێگەی مەترسییە بۆ جەنابت و ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، من نیم، بەڵکوو کەسانی ترن."

"بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، تۆ هەر فریوت خوارد."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ پەرداخەکەی پڕ کرد و دانیشت. پاشان وتی، "وا خەیاڵ دەکەیت لە بەردەم ئەو کوڕی قەحبەیەدا چۆک دادەم؟ دەبینیت چۆن بۆت هەنجنهەنجن دەکەم! سبەینێ دەبینیت، کە چۆن شوێنەواری ناهێڵم، سەرنگومی دەکەم، دووکەڵی ناو ژووری ئەو منداڵە دەر دەکەم و خاوێنی دەکەمەوە!"

تەقریبەن پەرداخەکەی بە یەک قوم بەتاڵ کردەوە و سەرلەنوێ پڕی کردەوە، لە ڕاستیدا، وردەوردە بە شێوەیەکی دژەباو کەوتە هەڵسوکەوتکردن و بەتەواوی و بێ ئەوەی خۆی شلوێ بکات، زۆر بەسەربەستی هەڵسوکەوتی دەکرد.

"ئاخخخ، نادنکا و ساشنکا، خۆشەویستە بچکۆلە و نازدارەکان، هە، هە، هە!"

لە کاتێکدا لە ناوەوە تووڕەیییەکەی قوڵپی دەدا و ئاگای لە دنیا نەمابوو، لەو کاتەدا هەورەتریشقەیەکی تر، کە دەنگی زۆر لەوانی پێشووتر بەرزتر بوو، ئاسمانی بەتەواوی ڕووناک کردەوە و باڵاخانەکەشی خستە لەرزە، پاشان باران بەلێزمە دای کرد. پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە شوێنی خۆی هەستا و ڕۆشت تا پەنجەرە کراوەکە دابخات. پاشان بە شێوەیەکی زۆر شەیتانانە بە توانج و لاقرتێوە وتی، "کەمێک پێش ئێستا ئەو لاوە لێی پرسیت کە ئایا لە هەورەتریشقە دەترسیت، ها، ها، ها! ڤێلچانینۆڤ و لە هەورەتریشقە بترسێت! کۆپیلنیکۆڤ، کۆپیلنیکۆڤ کێیە؟... ئەی مەبەستی لە پەنجا ساڵ چی بووبێت... ها؟ بیرت دێت وای وت؟"

"لەوە ناچێت نیازی ڕۆشتنت هەبێت!"

ڤێلچانینۆڤ لەبەر ئەو ئازارەی سەرسنگی زۆر بەدژواری توانیی وشەکان دەر ببڕێت، پاشان وتی، "من بۆ خۆم پاڵ دەکەوم، تۆش دەتوانیت چیت پێ خۆش بوو، ئەنجامی بدەیت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە دەنگێک، وەک ئەوەی زۆری لێ کرابێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا وا دەر دەکەوت بەتەواوی خۆشحاڵ بووبێت بەوەی ئاوا زۆری لێ کراوە، وتی، "بۆ ئەگەر سەگیش بم، لە کەشێکی ئاوادا فڕێم دەدەیتە دەرەوە!"

ڤێلچانینۆڤ منجاندی، "زۆر باشە، دابنیشە و بۆخۆت هەر خەریکی خواردنەوە بە... ئەگەر پێت خۆش بوو، شەویش بمێنەرەوە!"

لە کاتێکدا بەکزی دەیناڵاند، لە سەر چەرپاکەی خۆی درێژ کرد.

"شەو لێرە بەسەر بەرم؟ ئەی ناترسیت؟"

ڤێلچانینۆڤ لە ناکاو سەری بەرز کردەوە، "لە چی بترسم؟"

"ئۆی، هیچ! ئاخر بۆیە پرسیم، چونکە جاری پێشوو زۆر ترسابوویت، یان پێدەچێت من وا هەستم کردبێت؟"

ڤێلچانینۆڤ نەیتوانی بەر بە خۆی بگرێت و هیچ نەڵێت، "بەڕاستی گەمژەیت!"

پاشان بەتووڕەیی ڕووی خۆی وەر چەرخاند و ڕووی کردە دیوارەکە.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ وەڵامی دایەوە، "زۆر باشە."

نەخۆشەکە ڕێک دوای یەک خولەک کە لەسەر چەرپاکە پاڵ کەوتبوو، یەکسەر چاوەکانی چوونە خەو. ئەو خۆنواندن و هەڵسوکەوتە ڕووکەشەی تەواوی ڕۆژەکە خەریکی بووبۆ شاردنەوەی خراپیی باری تەندروستییەکەی، ئێستا و لەناکاو لە پەلوپۆی خستبوو، تەندروستیی بە شێوەیەکی ترسناک تێک چووبوو، هەر وەک منداڵێکی لاواز هەستی بە لاوازیی خۆی دەکرد. بەڵام دواجار ئازارەکە سەر کەوت بەسەر خەوتن و شەکەتییەکەیدا، هەمووی کاتژمێرێکی نەبرد، کە لەتاو ئازار خەبەری بۆوە و لەسەر چەرپاکەی هەستا. زریانەکە هێمن ببووەوە، ژوورەکە لە دووکەڵی جگەرەدا نوقم ببوو، لەسەر مێزەکە بوتڵێکی بەتاڵ کەوتبوو، هەروەها پاڤێل پاڤلۆڤیچیش لەسەر یەکێکی تر لە چەرپاکان خەوی لێ کەوتبوو. لەسەر پشت ڕاکشابوو، سەریشی خستبووە سەر دەسکی چەرپاکە، جلوبەرگەکەی نەگۆڕیبوو، ڕێک بە پۆتینەکانییەوە خەوی لێکەوتبوو. چاویلکە یەک چاوییەکەی لە گیرفانی هاتبووە دەرەوە و بە شێوەیەک شۆڕ ببووەوە، کە خەریک بوو بەتەواوی لە عەردەکەی دەدا. کڵاوەکەی لەولای خۆیەوە لەسەر عەردەکە

کەوتبوو. ڤیلچانینۆڤ زۆر بەدڵتەنگییەوە لێی ورد دەبۆوە، بەڵام کارێکی وای نەکرد تا بە ئاگای بهێنێت. بە ئازارێکی زۆرەوە لەناو ژوورەکەدا دەستی کرد بە هەنگاونان، وەک ئەوەی چیی تر بەرگەی ئەوە نەگرێت و لە توانایدا نەبێت کە لە ناو جێگەکەیدا ڕابکشێت. دەینااڵند و لەتاو ئازار جێگەی بە خۆی نەدەگرت وەک جووچکەی بێلانەی لێ هاتبوو.

زۆر لەو ئازارەی سەرسنگی دەترسا، هەڵبەت ترسەکەشی بێهۆ نەبوو. زۆر لەمێژ بوو بەدەست ئەم دەردەوە دەیناڵاند، بەڵام ئەم ئازارە، زۆر بە دەگمەن نابووایە، هێرشی بۆ نەدەهێنا، یەک جار لە ساڵێکدا یاخود لە دوو ساڵدا. دەیزانی سەرچاوەی ئازارەکانی جگەریەتی. لە سەرەتادا ئازارەکە سووکە، زۆر توند نییە، بەڵام وردەوردە ئازارەکە زیاد دەکات و تا وای لێ دێت نەخۆشەکە لەتاو ئێش و ئازار گرمۆڵە دەبێت، وەک ئەوەی هەموو ئازارەکە لە خاڵێکدا، لەناو سنگیدا، لەژێر دەفەی شانەکان یاخود لەسەروو دەفەی شانەکان چڕ ببێتەوە. بەردەوام ئازارەکە لە زیادبووندا دەبێت، هەندێک جار ئازارەکە دە کاتژمێر درێژە دەکێشێت، دواجار فشاری ئازارەکە هێندە توند دەبێت و دەگات بە ئاستێک، کە بەرگە ناگیرێت و کەسەکە لەتاو بەسوێیی ئازارەکە، مەرگی خۆی بە ئاوات دەخوازێت. کۆتا جار کە ڤیلچانینۆڤ بەر هێرشی ئەو ئازارە کوشندەیە کەوتبوو، ساڵێک پێشتر بوو، دوای دە دانە کاتژمێر لە ئازارچەشتن و پێوەتلانەوەی، ئەو کاتەی لەناو جێگەدا کەوتبوو، هێندە لاواز ببوو، کە زۆر بەئەستەم توانیبووی دەستەکانی بجووڵێنێت، پزیشکەکەشی ڕێگەی نەدابوو تەواوی ڕۆژەکە هیچ شتێک بخوات و بخواتەوە، جگە لە چەند

کەوچکێک لە چایی کەمڕەنگ و چەند تیکە نانێکی خوساو لەناو مەرگەدا. ڕێک وەک منداڵێکی ساوا. هێرشی ئازارەکان بە هۆی چەند هۆکارێکی جیاوازەوە ڕووی دەدا، هەرگیز ئازارەکە دەر نەدەکەوت جگە لەو کاتەدا نەبێت، کە فشاری خوێنیی بە شێوەیەکی تەواو نائاسایی بەرز ببووایەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئازارەکە بە شێوەیەکی زۆر سەیریش لەناو دەچوو، هەندێک جار دەکرا هەر لەدوای نیوکاتژمێری سەرەتای سەرهەڵدانی ئازارەکەدا، ئازارەکە ڕابگیرێت، ئەویش بە هۆی بەکارهێنانی دەوریی گەرم، کە دەخرێتە سەر ناوچەی ئازارەکە و دەستبەجێ بەتەواوی ئازارەکەی لە کۆڵ دەبێتەوە، بەڵام هەندێک جاریش هیچ شتێک دادی نادات، هەر وەک ئەوەی لە جاری پێشوودا بەسەری هاتبوو، ئازارەکەش ناوەستێت، تەنها بە بەکارهێنانی یەک لەدواییەکی دەرمانی ڕشانەوە نەبێت. پزیشکەکە جاری پێشوو دانی بەوەدا نابوو، کە گومانی لەوە کردبوو نەخۆشەکە ژەهرخوارد کرابێت.

هەنووکە زۆری مابوو ڕۆژ ببێتەوە. ڤێلچانینۆڤ خۆشیی لەوە نەدەهات، کە بەو شەوە بنێرێت بەشوێن پزیشکدا، جگە لەوەش، هەر خۆی بە سروشتی خۆی حەزی بە چارەی پزیشکان نەدەکرد. دواجار نەیتوانی چیی تر لەوە زیاتر دان بە خۆیدا بگرێت، بە دەنگی بەرز کەوتە ناڵین. ناڵینەکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچی خەبەر کردەوە، لە شوێنی خۆی ڕاست بۆوە و لەسەر چەرپاکە دانیشت، چەند ساتێک گوێی بۆ دەنگی ناڵەوفیغانی ڤێلچانینۆڤ ڕادێرا، بەحەپەساوییەوە تەماشای دەکرد، کە چۆن ڤێلچانینۆڤ لەتاو ئازار تەقریبەن بەڕاکردن سەروخوار دەکات لەنێوان دوو ژوورەکەدا. دیار بوو بوتڵە

شەمپانیاکە زۆر بەڕوونی لە کاتە ئاساییەکانی تر زۆر زیاتر کاریگەریی لەسەر بەجێ هێشتبوو، بە شێوەیەک، جەستە و بیر و هۆشی سست کردبوو، کە پێویستی بە هەندێک کات هەبوو تا بێتەوە سەر خۆی. دواجار کەمێک هۆش خۆی هاتەوە و لە دۆخەکە تێگەیشت و بەپەلە خۆی گەیاندە ڤێلچانینۆڤ، کە وای لێ هاتبوو بەئەستەمیش وەڵامی بۆ نەدەدرایەوە لەتاو ئازار.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە لەپڕا بێئەندازە جۆشابوو، هاواری کرد، "ئەوە پەیوەندیی بە جگەرەوە هەیە، من ئەوە دەزانم! پیوتر کۆزمیچ پۆلۆسخین بەدەست هەمان دەردی تۆوە دەیناڵاند، ئەویش هەر بە هۆی ئازاری جگەرەوە دەیناڵاند. پێویستە خێرا باندجت بۆ ببەسترێت. پیوتر کوزمیچیش هەمیشە کە وای لێ دەهات، باندجی دەبەست... هیچ دوور نییە مرۆڤ بە هۆی ئازارەکەیەوە بمرێت! خێرا بچم بۆ لای ماڤرا؟"

ڤێلچانینۆڤ بەجاڕزییەوە لە خۆی دوور خستەوە و وتی، "پێویست ناکات! پێویست ناکات! هیچم ناوێت!"

بەڵام پاڤێل پاڤلۆڤیچ مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێت کە بۆچی، ئەتوت ئەم شتە پەیوەندیی بە مەرگ و ژیانی کوڕی ڕاستەقینەی خۆیەوە هەیە و دەبێت لە مردن ڕزگاری بکات. بەبێ ئەوەی گوێ بۆ نارەزاییدەربڕینەکانی ڤێلچانینۆڤ بگرێت، پێداگریی ئەوەی دەکرد، کە هەرچۆنێک بووە ڤێلچانینۆڤ قایل بکات بەوەی دەورییە گەرمەکە زۆر پێویستە بۆ چارەسەرکردنی، هەروەها بە هەمان شێوە دەستبەجێ نۆشینی دوو بۆ سێ کوپ چایی کەمڕەنگ، کە "نەک هەر گەرم بێت، بەڵکوو دەبێت داخ بێت!" خێرا خۆی گەیاندە لای ماڤرا، بێ ئەوەی چاوەڕوانی ڕوخسەتخواستن بێت لە ڤێلچانینۆڤەوە.

هاوکاریی ماڤرای کرد لە داگیرساندنی ئاگر لەو ئاشپەزخانەیەی زۆر لەمێژ بوو ئاگری تێدا نەکرابووەوە و بەتەواوی پشتگوێ خرابوو، خێرا سەماوەرەکەیان پڕ کرد لە ئاو، لە هەمان کاتیشدا توانیی سەرکەوتوو بێت لەوەی نەخۆشەکەش بخاتە ناو جێگەکەیەوە، خێرا جلەکانی لەبەر داکەند و لیفەیەکی لێوە ئالاند، هەمووشی بیست خولەکێکی پێ نەچوو، کە چاییەکە دەمی کێشا و باندجەکەش ئامادە بوو.

لە کاتێکدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەورییەکی داخی بە دەستەوە بوو کە بە پەڕۆیەک پێچرابووەوە، لە سنگی ڤێلچانینۆڤی نزیک کردەوە و بە گەرمی و شەیدابییەوە وتی، "ئەم دەورییە گەرمە، نەک هەر گەرمە، بگرە زۆریش داخە! هەنووکە لەمە باشتری لێ نییە، بەڵام بە شەرەفی خۆم سوێندتان بۆ دەخۆم، کە ئەمە تەنانەت زۆر لەوە باشترە، کە کاتی خۆی بە هەردوو دەستی خۆم لە بەردەم پیوتر کوزمیچدا دام نا، من بە چاوەکانی خۆم ئەوەم بینی. دەزانیت، ئەگەری زۆرە ئەم دەردە مرۆڤ تا لێواری مەرگ ببات و بیکوژێت. چاییەکەت بخۆرەوە، هەڵی بقوڕێنە! گرنگ نیە ئەگەر قورگیشت بسووتێت، چونکە ڕزگارکردنی ژیانی خۆت گرنگترە... هەڵبەت ئەگەر ژیانی خۆتت بەلاوە گرنگ بێت."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەتەواوی ماڤرای پەشۆکاندبوو، کە هێشتاش خەو بەتەواوی بەری نەدابوو. هەر سێ-چوار خولەک جارێک، سەرجەم دەورییەکانیان دەگۆڕی بە دەوریی نوێ. پاش سێیەم دەوری و دووەم کوپە چای کە هەڵی قوڕاندبوو، ڤێلچانینۆڤ هەستی بە باشبوونێکی لەناکاو کرد.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە خۆشیدا هاواری کرد، "ئەگەر بتوانین

دەستبەجێ بەهێزیی ئازارەکە کەم بکەینەوە و بەسەریدا زاڵ ببین، ئەوا دەبێت سوپاسی خوا بکەین، چونکە ئەوە نیشانەیەکی زۆر باشە!"

پاشان بەوپەڕی کامەرانییەوە بەخێرایی ڕۆشت تا دەورییەکی نوێ و کوپێک چایی تازەی لە ئاسپەزخانەکە بۆ بهێنێتەوە.

بەردەوام دەیوت و دەیوتەوە، "ئەگەر تەنها بتوانین ئازارکە کەم بکەینەوە، ئەگەر بتوانین ڕێ لە پەرەسەندنی ئازارەکە بگرین، ئەوە باشترین کارە!"

دوای نیوکاتژمێرێک، بەهێزیی ئازارەکە بەتەواوی کەم بووەوە، بەڵام بە هۆی ماندوویی لەڕادەبەدەری نەخۆشەکە و سەرەڕای لێپاڕانەوەیەکی زۆر لەلایەن پاڤێل پاڤلۆڤیچەوە، بەڵام نەخۆشەکە ڕەتی کردەوە کە "قاپێکی تری خنجیلەی لەسەر سنگی دابنرێت." هێندە لاواز ببوو، کە هەموو دنیا لە بەرچاوی تاریک ببوو.

بە دەنگێکی لاواز، لەسەر یەک چەند جارێک وتی، "دەخەوم... دەخەوم..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە قایلبوونەوە وەڵامی دایەوە، "بەدڵنیاییەوە."

"شەو لێرە بمێنەرەوە... کاتژمێر چەندە؟"

"نزیکی کاتژمێر دووە، چارەکی دەوێت."

"ئەمشەو لێرە بە."

"بەسەر چاو، بەسەرچاو."

دوای خولەکێک، سەرلەنوێ نەخۆشەکە بانگی لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ کردەوە. پاڤێل پاڤلۆڤیچ خۆی گەیاندێ و خۆی بۆ

نووشتاندەوە تا بزانێت دەیەوێت چیی پێ بڵێت، پاشان نەخۆشەکە بەورتە وتی، "تۆ، تۆ، تۆ لە من باشتریت! لە هەموو شت تێدەگەم، هەموو شت... سوپاس بۆ تۆ."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەچرپە وتی، "بخەوە، بخەوە."

پاشان لەسەر نووکی پەنجەی پێ بەپەلە ڕۆشتەوە سەر چەرپاکەی. لە کاتێکدا ڤێلچانینۆڤ کە خەریک بوو چاوەکانی دەچوونە خەو، گوێی لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ بوو، کە زۆر لەسەرخۆ و بە خشپەخشپ جێگەکەی خۆی چاک دەکات و خەریکە جلەکانی دەگۆڕێت. دواجار، مۆمەکەی کوژاندەوە و تەقریبەن هەناسەی خۆی لە سنگیدا خەفە کردبوو لە ترسی ئەوەی مەبادا نەخۆشەکە خەبەری ببێتەوە، پاشان لەسەر چەرپاکە خۆی درێژ کرد.

گومان لەوەدا نەبوو کە ڤێلچانینۆڤ هەر دوابەدوای کوژاندنەوەی مۆمەکە، لە خەوێکی قووڵ ڕۆ چوو، دواتر زۆر بەڕوونی ئەمەی بیر هاتەوە. بەڵام تەواوی ئەو کاتەی خەوی لێ کەوتبوو، تا ئەو ساتەشی کە خەبەری بووەوە، بەردەوام خەونی بەوەوە دەبینی، کە نەخەوتووە، هەرچەندە سەرباری هەموو شەکەتییەکەشی هەستی دەکرد ناتوانێت بخەوێت. دواجار خەونی بینی کە لە ئاگاییدا خەریکی وڕێنەکردنە، هەروەها ناتوانێت ئەو تارماییيانە لە خۆی دوور بخاتەوە کە تەوقیان دابوو. هەرچەندە بەتەواوی دەیزانی ئەمە تەنها بریتییە لە وڕێنە و فڕی بە ڕاستییەوە نییە. تەواوی ئەو تارماییيانەی دەناسییەوە، ژوورەکەی وا دەر دەکەوت، کە پڕ بێت لە خەڵکی، دەرگای ڕاڕەوەکەش لەسەر پشت بوو، خەڵکێکی زۆر بە حەشامەت خۆیان دەکرد بە ژوورەوەدا، سەر

قادرمەکان هێندەی خەڵک تێ ترنجابوو، جمەی دەهات. لە بەردەم مێزەکەدا، کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانرابوو، یەک پیاوی لێ دانیشتبوو - ڕێک وەک هەمان ئەو خەونەی مانگێک پێشتر بینیبووی. هەر ڕێک وەک ئەو خەونەی پێشتر، ئەو پیاوە ئانیشکی لەسەر مێزەکە دانابوو، ورتەی لێوە نەدەهات، بەڵام ئەم جارە ئەو پیاوە کڵاوەکەی شریتێکی ڕەشی پێوە کردبوو. ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "چۆن! باشە دەکرێت ئەو جارەی تریش ئەو کەسە هەر پاڤێل پاڤلۆڤیچ بووبێت؟" بەڵام کاتێک چاوی بڕییە ڕوخساری کابرای بێدەنگ، بۆی دەر کەوت ئەمە کەسێکی ترە. ڤێلچانینۆڤ بەحەپەساوی لە خۆی دەپرسی، "باشە بۆچی شریتی ڕەشی بەستووە بە کڵاوەکەیەوە؟" دەنگەدەنگ و هاوارهاواری ئەو حەشیمەتەی چواردەوری مێزەکەیان دابوو، زۆر سامناک بوو. وا دەر دەکەوت ئەو خەڵکە زۆر لە جاری پێشووتر، کە لە خەوییدا بینیبوونی، تووڕەتر و زۆر توندوتیژتر بن بەرامبەری. مشتیان نووقاندبوو و بەتوندی دەیانجووڵاند و هەڕەشەیان لە ڤێلچانینۆڤ پێ دەکرد. بە شتێک هەڕەشەیان لێ دەکرد و بە هەموو هێزی خۆیان بەسەریدا هاواریان دەکرد، بەڵام ڤێلچانینۆڤ زۆر بەڕوونی دیار بوو کە لەوە تێنەدەگەیشت، کە پێیان دەوت. لە دڵی خۆیدا دەیوت، "بەڵام ئەمە وڕێنەیە، بەدڵنیاییەوە دەزانم ئەمە لە وڕێنە زیاتر چیی دی نییە!" دەزانم نەمتوانی بخەوم، هەر لەبەر ئەمەشە هەنووکە بەخەبەرم، چونکە لەتاو توندیی ئازارەکە، نەمتوانی پاڵ بکەوم و بخەوم..." بەڵام هاوارکردنەکان و خەڵکەکە و جموجووڵەکانیان، زۆر لە ڕاستەقینە دەچوون، هێندە لە ڕاستی دەچوون، کە هەندێ کات تووشی گومانی دەکرد و

دەیوت، "باشە هەر بەڕاست، ڕێی تێ دەچێت ئەمانە هەمووی وڕێنە بێت؟ بۆ خاتری خوا، ئەم خەڵکە چیی لە گیانی من دەوێت؟ بەڵام... ئەگەر ئەمە هەمووی خەیاڵات و وڕێنە بووایە، ئایا ڕێی تێ دەچوو ئەم هەموو دەنگەدەنگە تا ئێستا پاڤێل پاڤلۆڤیچی بەئاگا نەهێنابایە؟ ئەوەتا بۆخۆی لەسەر چەرپاکەی خەوتووە!" لە کۆتاییدا کتوپڕ سەرلەنوێ شتێک ڕووی دا، هەر وەک خەوەکەی جاری پێشوو، هەموو ئەو حەشامەتەی لەناو ژوورەکەدا بوون، بە هوروژم بەرەو قادرمەکان تێیان تەقاند و لە بەردەم دەرگاکەدا هۆسەیەکی گەورەیان نابووەوە. ئەمە لە کاتێکدا حەشیمەتێکی نوێ لە خەڵکی بەسەر قادرمەکاندا سەر دەکەوتن و خۆیان کرد بە ژوورەوەدا. ئەم خەڵکەی تر لەگەڵ خۆیاندا شتێکیان هێنابوو، شتێکی گەورەو قورس؛ دەیتوانی گوێی لە قورسیی ئەو هەنگاوانە ببێت، کە شتەکەیان هەڵگرتبوو، بەسەر قادرمەکاندا بەهەناسەبڕکێوە سەر دەکەوتن و بانگیان لە یەکتر دەکرد. هەموو ئەو خەڵکەی لە ژوورەوە بوون، تێکڕا هاواریان کرد، "ئەوە خەریکن دەیهێنن، خەریکن دەیهێنن!" تەواوی چاوەکان دەبریقانەوە و هەموو چاوەکان لەسەر ڤێلچانینۆڤ بوون، هەموویان بە چاوێکی هەڕەشەئامێز و هەستی سەرکەوتنەوە ئاماژەیان بۆ قادرمەکان دەکرد. چیی تر گومانی لەوە نەمابوو کە ئەمە دوور لە ڕاستی بێت و وڕێنە نەبێت، لەسەر نووکی پەنجەی پێ خۆی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بتوانێت لەسەروو سەری ئەو خەڵکەوە، هەرچی زووتر بزانێت ئەو شتە چییە کە لەسەر قادرمەکانەوە دەیهێننە سەرەوە. دڵی بەخێرایی لێی دەدا، لێی دەدا، لێی دەدا، بەڵام لەناکاو، هەر ڕێک وەک خەونەکەی جاری پیشووی، گوێی لە

لیدانی سێ جاری یەکلەسەریەکی توندی زەنگی ماڵەکەی بوو. دیسانەوە لیدانی زەنگەکە هێندە ڕوون بوو، هێندە ڕاستەقینە هاتە بەرگوێ، کە جێگەی هیچ گومانێک نەبوو کە ئەو لیدانی زەنگە ڕاستی نەبێت و هەمووی لە خەونێک زیاتر چیی دی نەبووبێت...

بەڵام ئەم جارەیان کە خەبەری بۆوە، وەک جاری پێشوو نەچوو دەرگاکە بکاتەوە. دەبێت چ بیرۆکەیەک یەکەم هەنگاوی ئاڕاستە کردبێت، یاخود تۆ بڵێیت ئەسڵەن ڕێی تێ بچێت کە لەو ساتەدا هیچ بیرۆکەیەک لە مێشکیدا بووبێت؟ بەڵام لەوە دەچوو یەکێک دنەی ئەوەی بدات، کە پێویستە چ هەنگاوێک بنێت. لەناو جێگەکەیەوە قەڵەمبازێکی دا و هاتە دەرەوە، وەک ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات بەرامبەر بە هێرشێکی لەناکاو و بیەوێت شتێک لە خۆی دوور بخاتەوە، دەستەکانی لەپێش خۆیەوە درێژ کردبوو، بەپەلە و ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت، کە پاڤێل پاڤلۆڤیچی تێدا خەوتبوو. بەڵام کتوپڕ دەستەکانی بەر دەستانێکی تر کەوت، کە لای سەریەوە درێژ کرابوو، توند دەستەکانی گرت، کەواتە کەسێک پێشتر بەسەر سەریەوە خۆی نووشتاندبووەوە، سەرەڕای ئەوەی پەردەکان دادرابوونەوە، بەڵام ژوورەکە بەتەواوی تاریک نەبوو، چونکە لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، کە پەردەیەکی وەهای پێوە نەبوو، ڕووناکییەکی کز دزی بە تاریکییەکە دەدا. کتوپڕ هەستی بە ئازارێکی ناخۆش کرد، شتێک ناو لەپی دەستی چەپی و پەنجەکانی بڕی، دەستبەجێ بۆی دەر کەوت کە ئەوەی پڕی پیا کردووە یان دەمی چەقۆیەکی تیژە یاخود گوێزانی ڕیشتاشینە و بەتوندی لەناو دەستەکانیدا گرتوویەتی... هەروەها ڕێک لەو

ساتەدا شتێک زۆر بەتوندی بەر بووەوە سەر عەردەکە و زرمەی لێ هەستا.

هەرچەندە کە ڕەنگە هێزی ڤێلچانینۆڤ سێ ئەوەندەی هێزی پاڤێل پاڤلۆڤێچ بووبێت، کەچی هێشتاش و لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرانبازییەکەی نێوانیان ماوەیەکی زۆری خایاند تا تەواو بوو، سێ خولەکی ڕێکی پێ چوو، هەر زوو لە عەردەکەدا تەختی کرد و قۆڵی لەدواوە نووشتاندەوە و بەڵام هەر لەخۆیەوە هەستی کرد پێویستە دەستی لەدواوە ببەستێتەوە. لە کاتێکدا بە دەستی چەپی، واتە دەستە بریندارەکەی، پیاوکوژەکەی گرتبوو، بە دەستەکەی تری پەلی کوتا بۆ ڕاکێشانی گوریسی ئەو پەردەیەی بە پەنجەرەکەوە هەڵواسرابوو، بۆ ماوەیەکی درێژ هەر خەریکی پەلکوتان بوو، نەدەهات بە دەستیدا، بەڵام لە کۆتاییدا دەستی پێی گەیشت و پاشان لە پەنجەرەکەی کردەوە. دواتر خۆشی لەو هەموو هێزەی خۆی ئێجگار سەری سوور ما، کە لەو کارەدا بەخەرجی دابوو. لە تەواوی تێپەڕبوونی ئەو سێ خولەکەدا، هیچ یەکێکیان تاقە وشەیەکیش چییە، لە زاریان دەر نەهاتبوو، هیچ دەنگێک بەرگوێ نەدەکەوت، جگە لە دەنگی هەناسە توندەکانیان لەگەڵ دەنگی کپی زۆرانبازییەکەیان. پاش ئەوەی قۆڵی پاڤێل پاڤلۆڤیچی بەتوندی لەدواوە بەست و بەیەکەوە شەتەکی دان، ڤێلچانینۆڤ لەسەر عەردەکە بەجێی هێشت و هەستایەوە سەر پێ، پەردەکانی لە پەنجەرەکان لا دا و پەردەکانی ژێرەوەشی بەرز کردەوە و بۆ ماوەیەک لەبەر پەنجەرەکە بەپێوە ڕاوەستا و بەقووڵی چەند هەناسەیەکی لە هەوای پاکژی دەمەوبەیان هەڵمژی. کەمێک لە چارەک بۆ چوار لای دابوو. پەنجەرەکەی داخستەوە و بەخێرایی

بەرەو کەنتۆرەکە هەنگاوی نا، خاولییەکی پاکژی دەر هێنا و بەتوندی لەو دەستەیەوە پێچا، کە بریندار ببوو، بۆ ئەوەی خوێنەکەی پێ بگیرسێنێتەوە. لەبەر پێیدا پاکەتێک گوێزانی هەڵپچڕاو لەسەر بەڕەکە کەوتبوو، دەستی برد و هەڵی گرتەوە و سەری پاکەتەکەی داخستەوە و کردیەوە ناو قووتووی گوێزانەکانی، کە لە بەیانییەوە لەسەر مێزێکی گچکە لەتەنیشت چەرپاکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچەوە دای نابوو، لەبیری چووبوو لەو شوێنەدا لای بدات. پاشان کردیە چەکمەجەی دۆلابەکەوە و چەکمەجەکەی کلۆم دا، کاتێک لە هەموو ئەم شتانە لێبۆوە، چوو بۆ لای پاڤێل پاڤلۆڤیچ و بە کینەیەکی زۆرەوە دەستی کرد بە لێوردبوونەوەی. هەرچۆنێک بێت، پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەو کاتەدا کە ڤێلچانینۆڤ سەرقاڵ ببوو، توانیبووی بە کۆششێکی زۆر لە سەر عەردەکە هەستێتەوە و لەسەر کورسییەکی دەسکدار دابنیشێت. جگە لە کراسەکەی، هیچ شتێکی تری لەبەردا نەبوو، تەنانەت پۆتینەکانیشی. پشتەوە و سەرقۆڵی کراسەکەی شەلاڵی خوێن ببوو، بەڵام خوێنەکە خوێنی خۆی نەبوو، بەڵکوو هەمووی خوێنی دەستە بریندارەکەی ڤێلچانینۆڤ بوو. گومانی تێدا نەبوو ئەوە پاڤێل پاڤلۆڤیچ بوو، بەڵام ئەگەر بهاتبا و یەکێک لەو کاتەدا چاوی پێی بکەوتایە، ئەوە گەلێک ئەستەم دەبوو بۆی کە بەئاسانی بیناسییایەتەوە، چونکە سەرتاپای سیمای گۆڕابوو. بەناقۆڵایی لەسەر کورسییە دەسکدارەکە دانیشتبوو، هەوڵی دەدا خۆی ڕاست بکاتەوە و قنجوقیت دابنیشێت، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستی بەتوندی لە دواوە شەتەک درابوو، نەیدەتوانی. ڕوخساری شێوابوو، ماندوو، سەوز هەڵگەڕابوو، ناوەناوەش سەرتاپای گیانی وەک شەقشەقە دەکەوتە لەرزین.

بە شێوەیەکی جێگیر چاوی بڕیبووە چاوەکانی ڤێلچانینۆڤ، بەڵام چاوەکانی نەدەدرەوشانەوە، وەک ئەوەی چیی تر هیچ شتێک بەڕوونی نەبینێت. هەر لەخۆیەوە کتوپڕ زەردەخەنەیەکی بەتاڵی خستە سەر لێوەکانی و بەسەر ئاماژەی بۆ بوتڵێک ئاو کرد، کە لەسەر مێزەکە دانرابوو، بەمنجەمنج و تەقریبەن بەنیوە چرپاندنەوە وتی، "ئاو، تینوومە، کەمێک ئاوم بدەرێ."

ڤێلچانینۆڤ پەرداخێکی بۆ پڕ کرد و بۆی گرت تا بیخواتەوە. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەتاسوقەوە خۆی بۆ ئاوەکە خوار کردەوە، دوای سێ قوم، سەری بەرز کردەوە و بە چاوێکی تیژەوە لە ڕوخساری ڤێلچانینۆڤی ڕووانی، کە لەتەنیشتیەوە بەپێوە ڕاوەستابوو، پەرداخەکەش بە دەستیەوە بوو، بەڵام بێ ئەوەی وشەیەک لە زاری بێتە دەرەوە، سەرلەنوێ خۆی نووشتاندەوە بۆ خواردنەوەی ئاوەکە. کاتێک لە خواردنەوەی ئاوەکە لێبۆوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی. ڤێلچانینۆڤ پشتییەکەی خۆی هەڵگرت و ئەو جلوبەرگانەی بڵاو بووبوونەوە بەسەر عەردەکەدا، هەمووی کۆ کردەوە و پاشان چوو بۆ ژوورەکەی تر، پاڤێل پاڤلۆڤیچیشی لە ژووری یەکەمدا حەپس کرد و دەرگاکەی لەسەر کلۆم کرد.

ئازارەکە بەتەواوی لەناو چووبوو. بەڵام هەنووکە دوای ئەوەی ئەو هەموو هێزەی کەمێک پێشتر بەخەرجی دابوو، لەڕادەبەدەر هەستی بە بێهێزیی خۆی دەکرد. هەوڵی دەدا لەوە تێبگات کە ڕووی دابوو، بەڵام بیرکردنەوەکانی زۆر بەسەختی تێکەڵوپێکەڵ ببوو بەسەر یەکدا، خراپ داچڵەکیبوو. هەندێک جار بەرچاوی تاریک دادەهات و ئەمەش ماوەی دە خولەکێک زیاتر، یاخود کەمتر درێژەی دەکێشا، پاشان لەپڕ ڕادەپەڕی، بەئاگا

دەهاتەوە، هەموو شتێکی بیر دەکەوتەوە، دەستە بریندارەکەی، کە بە خاولییەکە پێچابووی و شەڵاڵی خوێن ببوو، پاشان بە شێوەیەکی زۆر چاوبرسییانە و بێسرەوت لە قووڵاییی بیرکردنەوە ڕۆ دەچووەوە. لە ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی زۆر، گەیشتبوو بەو بڕوایەی کە پاڤێل پاڤلۆڤیچ زۆر بەدڵنیاییەوە قەسدی بووە سەری ببڕێت، بەڵام تەنها یەک چارەکەسەعات پێشتر، ڕەنگە خودی پاڤێل پاڤلۆڤیچیش خۆشی نەیزانیبێت کە ڕەنگە هەڵبستێت بە ئەنجامدانی وەها کارێک. ڕەنگە ئێوارەی پێشووتر، کاتێک چاوی کەوتۆتە سەر ئەو پاکەتی گوێزانە و بێ ئەوەی ئەسڵەن لەو ساتەدا ئەو پاکەتە هیچی لەلا دروست بکات، دوور لە ویستی خۆی وێنەی ئەو پاکەتە لە مێشکیدا نەقشی بەستبێت. "بە شێوەیەکی ئاسایی ڤێلچانینۆڤ هەمیشە پاکەتی گوێزانەکەی لەناو چەکمەجەی دۆڵابەکەدا دادەنا و چەکمەجەکەشی کلۆم دەدا، تەنها دوێنێ بەیانی نەبێت، کە دەری هێنابوو بۆ ئەوەی ڕیش و سمێڵی پێ بتاشێت و قەنافیزەکانی چاک بکات، هەر وەک چۆن جاروبار ئەم کارەی دەکرد." لە یەکێکی تر لەو گریمانە و بیرۆکانەی تر کە بە مێشکی ڤێلچانینۆڤدا هاتبوو، لە دڵی خۆیدا دەیوت، "ئەگەر ئەو لەمێژ بووایە بڕیاری ئەوەی دابووبێت کە بمکوژێت، ئەوا چەقۆیەک یاخود دەمانچەیەکی بۆ ئەم کارە ئامادە دەکرد، پەنای نەدەبرد بۆ گوێزانەکانی من، کە هەرگیز پێشتر چاوی پێیان نەکەوتبوو هەتا دوێنێ ئێوارەی ڕابردوو."

دواجار زەنگی کاتژمێر شەش لێی دا، ڤێلچانینۆڤ خۆی ڕاست کردەوە، خۆی گۆڕی و چوو بۆ لای پاڤێل پاڤلۆڤیچ. دەرگاکەی کردەوە، نەیتوانی سەر لەوە دەر بکات کە بۆچی

لەبریی ئەوەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە ماڵەکەی بکاتە دەرەوە، کەچی چووە لەو ژوورەدا حەپسی کردووە. بەتەواوی حەپەسا کاتێک بینی تاوانبارەکە جلوبەرگی تەواوی پۆشیوە، ئەگەری زۆر زۆر بوو کە ڕێگەیەکی دۆزیبێتەوە و بە هۆیەوە دەستی خۆی کردبێتەوە. لەسەر کورسییە دەسکدارەکە دانیشتبوو، بەڵام هەر کە ڤێلچانینۆڤ وەژوور کەوت، یەکسەر لە شوێنی خۆی ڕاست بووەوە. پێشتر کڵاوکەی بە دەستیەوە گرتبوو بۆ ئەوەی ئامادەی ڕۆیشتن بێت، لە چاوە نیگەرانەکانیدا ئەوە دەخوێندرایەوە، کە پەلەی ئەوەی بێت بڵێت، "تکایە دەست بە گفتوگۆ مەکە، هیچ سوودی نییە، ئەسڵەن هەر پێویست ناکات قسە بکرێت!"

ڤێلچانینۆڤ وتی، "لێرە بڕۆ!"

پاشان لە دواوە هاواری لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ کرد و ئەمەشی زیاد کرد بۆ قسەکەی، "بازنەکەشت لەگەڵ خۆت ببەرەوە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لەدەم دەرگاکەدا ئاوڕێکی بۆ دواوە دایەوە، پاشان گەڕایەوە، سندوقچەکە و بازنەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و کردنیە ناو گیرفانیەوە و بە قادرمەکاندا ڕۆیشتە خوارەوە. ڤێلچانینۆڤ لای دەرگاکەدا ڕاوەستابوو، تا لەدوایەوە دەرگاکە کڵۆم بکات. بۆ کۆتا جار ڕوانینەکانیان تێکەڵ بە یەکتر بوو؛ پاڤێل پاڤلۆڤیچ کتوپڕ لە شوێنی خۆی وشک بوو، بۆ ماوەی پێنج چرکەیەک هەردووکیان چاویان بڕییە چاوی یەکتر، وەک ئەوەی لاڵ بووبێتن، لە کۆتاییدا ڤێلچانینۆڤ بەلاوازی دەستی ڕاوەشاند و بە دەنگێکی نزمەوە وتی، "زۆر باشە، لێرە بڕۆ!"

پاشان دەرگاکەی کڵۆم کرد.

# ١٦

# شیکردنەوە

هەستێکی ئێجگار نائاسایی و خۆش سەرتاپای دڵ و دەروونی گرتبۆوە، شتێک کۆتاییی پێ هاتبوو، لوغزێک چارەسەر کرابوو، ئەو دڵەڕاوکێ سەخت و ترسناکە بۆ هەتاهەتایە ون بوو و لە ناو چوو. ئا بەم شێوەیە بەلای ڤیلچانینۆڤەوە دەر دەکەوت. ئەم دڵەڕاوکێیە ماوەی پێنج دانە حەوتووی ڕێکی خایاندبوو. دەستی بەرز کردەوە و تەماشایەکی ئەو خاولییەی کرد، کە بە خوێن خووسابوو، پاشان لەبەر خۆیەوە بە خۆی وت، "بەڵێ، ئێستا هەموو شتێک، بێ هیچ گومانێک، کۆتاییی پێ هات!" تەواوی ئەو بەیانییە، لەدوای سێ دانە حەوتووی ڕێک، بۆ یەکەم جار بوو کە هیچ بیری لە لیزا نەکردەوە - وەک ئەوەی ئەو خوێنەی لە پەنجە بڕاوەکانی ڕژابوو، ئەوی لە هەموو شتێک، تەنانەت لەو پەژارەیەشی کە بۆ لیزا هەیبوو، ڕزگاری کردبێت.

زۆر بەڕوونی درکی بەوە دەکرد، کە لە مەترسییەکی سامناک دەربازی بووە. لە دڵی خۆیدا دەیوت، "ئەم جۆرە

خەڵکە، تەنها ئەم جۆرە خەڵکە یەک خولەک پێشتر هەرگیز نازانن دەیانەوێت یەکێک بکوژن یاخود نا، بەڵام هەر هێندەی چەقۆیەک دەگرن بە دەستە لەرزۆکەکەیانەوە و هەست بە گەرمیی تەوژمی خوێن دەکەن کە تەوژم دێنێت بۆ سەری پەنجەکانیان و گەرمی دەکاتەوە، تەنها بەوەوە ناوەستن کە بەس قورگت ببڕن، بەڵکوو لەو کاتەدا حەز دەکەن سەری قوربانییەکەیان لە لاشە جیا بکەنەوە، دەیانەوێت شوێنەوارت نەهێڵن، هەر وەک چۆن تاوانبارەکە، کە لە دواییدا لە دادگادا خۆی دانی پێدا دەنێت. بەڵێ، ئا بەم شێوەیەیە." نەیتوانی لەماڵەوە بمێنێتەوە، هەر بۆیە ڕۆیشتە دەرەوە، ڕۆیشت بۆ ناو شەقامەکە، هەستی دەکرد دەبێت خێرا شتێک بکات، ئەگینا شتێکی بەسەر دێت. لەناو شەقامەکەدا هاتوچۆی دەکرد و جاروباریش ڕادەوەستا. زۆری حەز دەکرد چاوی بە کەسێک بکەوێت، حەزی دەکرد قسە لەگەڵ یەکێکدا بکات، گرنگ نەبوو بەلایەوە هەرکەسێک بێت، تەنانەت ئەگەر غەوارەیەکیش بووبێت. دواجار ئەوە هات بە مێشکیدا، کە سەردانی پزیشکێک بکات، بۆ ئەوەی دەستە زامدارەکەی دەستبەجێ بۆ تیمار بکات و جوان لەفافی تێوە بپێچێت بۆی. پزیشکەکە، کە ناسیاوێکی لەمێژینەی خۆی بوو، پاش ئەوەی دەستی بۆ تیمار کرد و بۆی پێچایەوە، بە شێوەیەکی کونجکاوانە پرسیاری ئەوەی لێ کرد، کە بە چی وای لێ هاتووە. ڤێلچانینۆڤ دای لە قاقای پێکەنین و هێندەی نەمابوو هەموو ڕووداوەکەی شەوی ڕابردووی بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام هەرچۆنێک بێت، دانی بە خۆیدا گرت و هیچی نەوت. پزیشکەکە ڤێلچانینۆڤی ناچار کرد لێدانی دڵی

بۆ بگرێت، کاتێکیش مەسەلەی ئازارەکەی دوێنێ شەوی بیست، هەرچۆنێک بێت، قاییلی کرد کە هەندێک دەرمانی هێورکەرەوە و ئازارشکێن، کە لەو کاتەدا لە بەردەستا هەبوو، لەگەڵ خۆی ببات و بەکاریان بهێنێت. سەبارەت بە زامەکەشی، دڵنیای کردەوە و پێی ڕاگەیاند، کە زامەکەی جێگەی مەترسی نییە و هیچ دەرئەنجامێکی خراپیشی لەسەر بەجێ ناهێڵێت. ڤێلچانینۆڤ دای لە قاقای پێکەنین و پزیشکەکەی لەوە دڵنیا کردەوە، کە پێشتر باشترین دەرئەنجامی دەست کەوتووە، کە بەتەواوی جێگەی ڕەزامەندییەتی! دوو دانە جاری تر هەر لەو ڕۆژەدا مەیلێکی هێندە بەهێز دابووی لە کەللەی، کە نەیدەتوانی بەر بە خۆی بگرێت لەئاست ئەو مەیلە بەهێزەدا، ئەویش بریتی بوو لە مەیلی گێڕانەوەی تەواوی چیرۆکەکە بۆ یەکێک. تەنانەت جارێکیان ویستی تەواوی چیرۆکەکە بۆ کەسێکی تەواو غەوارە بگێڕێتەوە، کە لە چایخانەیەک بەیەکەوە دانیشتبوون و ئەم، واتە ڤێلچانینۆڤ، هەر لەخۆیەوە سەری قسەی کردبۆوە لەگەڵ کابرای غەوارەدا و کەوتبووە گفتوگۆیەکی گەرم. ئەمە لە کاتێکدا، کە ڤێلچانینۆڤ پێشتر هەرگیز لە شوێنی گشتیدا حەزی بە گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسانی غەوارەدا نەدەکرد.

خۆی کرد بە دوکانێکدا تا ڕۆژنامەیەک بکڕێت، پاشان ڕۆشت بۆ لای بەرگدرووەکەی و داوای قاتێکی لێ کرد. هێشتاش بیرۆکەی سەردانکردنی خێزانی پۆگۆریلستێڤ جاڕزی دەکرد و هەستێکی ناخۆشی لەلا دروست دەکرد، هەر لەبەر ئەوە، زۆر بیری لێ نەدەکردنەوە، لە ڕاستییشدا نەیدەتوانی بچێت بۆ ڤێللاکەیان، چونکە لێرە، لەناو

شارۆچکەکە، چاوەڕوانی شتێکی تری دەکرد. بەتاسوقەوە نانی ئێوارەی خوارد و بە ڕوویەکی خۆشەوە قسەی لەگەڵ شاگردی چێشتخانەکە و ئەو کەسەی تریش کە لەولایەوە چێشتی دەخوارد، کرد، تەقریبەن نیوبوتڵ عەرەقیشی هەڵدا. لەو بڕوایەدا نەبوو نەخۆشییەکەی دوێنێ شەوی سەرلەنوێ ئەوکی بگرێتەوە، بەڵکوو بڕوای وا بوو کە نەخۆشییەکەی بەتەواوی پەڕیبوو، هەر لەو ساتەدا، کاتێک هێندە شەکەت ببوو و لە خەوێکی قووڵ ڕۆ چووبوو، هەروەها دوای ئەوەی کاتژمێر و نیوێک دواتر لە جێگەکەی قەڵەمبازی دابوو و بەو هێزە زۆرەوە پیاوکوژەکەی لە عەردەکەدا تەخت کردبوو. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوئێوارەکەی هەستی بە وڕی دەکرد.

هەندێک جار هەندێک بیرکردنەوە تەوقی دەدا، کە شێوەی لەو وڕێنانە دەچوو، کە شەوی پێشوو لە خەویدا و لە کاتی خەوتندا کردبوونی. تاریک و لێڵی ئێوارە بوو کاتێک گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کاتێکیش خۆی کرد بە ژوورەوەدا، دیمەنی ژوورەکە بەتەواوی ترساندی. هەستی کرد بالاخانەکە زۆر سامناک و تەلیسماوییە. چەندین جار لەناو بالاخانەکەدا سەروخواری کرد، تەنانەت سەرێکی لە ئاشپەزخانەکەش دا، کە پێشتر بەدەگمەنیش سەری بەو ئاشپەزخانەیەدا نەدەکرد. لە دڵی خۆیدا وتی، "کەواتە دوێنێ لێرەدا دەورییەکانیان داخ دەکرد." دەرگاکەی بەوپەڕی خۆپارێزییەوە کڵۆم کرد، هەروەها مۆمەکانیشی لە کاتی ئاسایی زووتر داگیرساند. هەر هێندەی دەرگاکەی کڵۆم کرد، بیری کەوتەوە کە نیوکاتژمێر پێشتر، کاتێک بەلای زنجی دەرگاوانەکەدا تێپەڕیبوو، بانگی

لە ماڤرا کردووە، سەبارەت بەوە پرسیاری لێ کردبوو کە ئایا ئەمڕۆ لە ئامادەنەبوونی ئەمدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەردانی ئێرەی کردووە یاخود نا، وەک ئەوەی کە دەبوو بهاتبا.

پاش ئەوەی زۆر بەوریایی دەرگاکانی لەسەر خۆی کڵۆم کرد، چەکمەجەی دۆڵابەکەی کردەوە و قووتووی گوێزانەکەی دەر هێنا و سەری قووتووەکەی کردەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ تەماشای گوێزانەکەی ناوی بکاتەوە. لەسەر دەسکە سپییە لەعاجدروستکراوی گوێزانەکە هێشتاش هەندێک پاشماوەی خوێنی مەیوی لەسەر بەجێ مابوو. گوێزانەکەی کردەوە ناو قووتووەکەی و سەری قووتووەکەی قەپات کردەوە، پاشان سەرلەنوێ کردیەوە ناو چەکمەجەی دۆڵابەکە و چەکمەجەکەی کڵۆم کردەوە. هەستی بە خەواڵوویی دەکرد، هەستی کرد پێویستە یەکسەر بچێتە ناو جێگەکەیەوە، ئەگینا "سبەینێ ناتوانێت هیچ کارێک بەڕێکوپێکی ئەنجام بدات." خۆشی نەیدەزانی بۆچی و لەبەر چ هۆکارێک سبەینێی بە ڕۆژێکی زۆر گرنگ و هەروەها یەکلاییکەرەوە دەزانی.

بەڵام هەموو ئەو بیرکردنەوانەی تەواوی ڕۆژەکە، لەناو شەقامەکەدا بۆ ساتێکیش چییە لە کۆڵی نەدەبووەوە، هەنووکە سەرومڕ یەک لەدوای یەک قەرەباڵغییان لەسەر دەماغە نەخۆشەکەی دروست کردبوو، لە پەستا فشاریان بۆ دەهێنا، بەردەوام بیری دەکردەوە، بیری دەکردەوە، بیری دەکردەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر، هەرچەندێک هەوڵی دەدا چاوی بچێتە خەو، خەوی لێ نەدەکەوت... بەردەوام بوو لە بیرکردنەوە: "باشە گریمان ئەو بەڕێکەوت ویستوویەتی من بکوژێت، تۆ بڵێیت هەرگیز پێشتر ئەم بیرۆکەیە بە مێشکیدا

نەهاتبێت، تەنانەت ئەگەر بە لایەنی کەمەوە بۆ یەک جاریش بووبێت، لە خەوندا یاخود لە کاتی تووڕەییدا؟"

بە شێوەیەکی زۆر سەیر لەسەر ئەو پرسیارە هەڵوێستەی کرد و بەم شێوەیە وەڵامی خۆی دایەوە، "پاڤێل پاڤلۆڤیچ مەبەستی بووە بیکوژێت، بەڵام خودی بیرۆکەی کوشتن هەرگیز بە مێشکیدا نەهاتووە." بەکورتی، "پاڤێل پاڤلۆڤیچ ویستوویەتی بیکوژێت، بەڵام نەیزانیوە دەیەوێت بیکوژێت. هەرچەندە ئەم قسەیە کەمێک سەیر و بێمانا دێتە بەرگوێ، بەڵام ئەوە ڕاستیی مەسەلەکەیە." ڤێلچانینۆڤ بیری کردەوە، "ئەوەی ئەو هاتبوو بۆ ئێرە، لە ڕاستیدا نە لەبەر بەرزکردنەوەی پۆستەکەی بووە، نە لەبەر باگاوتۆڤیش بووە، هەرچەندە ئەو چەندین جار هەوڵی ئەوەی دابوو لێرە پۆستێکی چنگ بکەوێت، چەندین جاریش بەپەلە ڕۆشتبوو تا چاوی بە باگاوتۆڤ بکەوێت کاتێکیش باگاوتۆڤ گیان دەسپێرێت، مردنەکەی لەڕادەبەدەر تووڕەی دەکات، بەڵام بیری لەوە کردبۆوە کە باگاوتۆڤ تازە بۆ ئەو لە پارچەتەپاڵەیەکی بێنرخ زیاتر، چیی دی نییە. ئەو کە هاتبوو بۆ ئێرە، لە ڕاستیدا ڕێک لەبەر من هاتبوو، کە هاتبووش، بەتەنیا نەهاتبوو، بەڵکوو لیزاشی لەگەڵ خۆی هێنابوو..."

"ئەی باشە من هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم لە ئەو دەکرد... کە ئەو بیەوێت بمکوژێت؟" ڤێلچانینۆڤ قسەکەی خۆی پشتڕاست کردەوە و باوەڕی بە خۆی هێنا، کە ئەو ئەو کارەی دەکرد، ئەسڵەن ئەم هەر لەو ساتەوە چاوەڕوانی وەها کارێکی لێ دەکرد، بەتایبەتی کاتێک لەناو گالیسکەکەدا بینیبووی شوێن تەرمەکەی باگاوتۆڤ کەوتبوو.

"بەڵێ، هەر لەو کاتەوە من چاوەڕوانی ڕوودانی شتێک بووم... بەڵام، بەدڵنیاییەوە ئەو شتە نا، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبووم، کە سەرم لە لاشە جیا بکاتەوەو بمکوژێت!..."

"ئەی باشە تۆ بڵێیت هەموو ئەو شتانە ڕاست بووبێتن؟"

لەناکاو سەرلەنوێ بەسەرساميیەوە سەری لەسەر باليفەکەی بەرز کردەوە و چاوەکانی بەتەواوی کردەوە. "هەموو ئەوانە، ئەوانە... ئەوەی ئەو شێتە دوێنێ پێی وتم سەبارەت بە خۆشەویستیی بۆ من، کاتێک چەناگەی دەلەرزی و بە مستی توند سەرسنگی خۆی دەکوتا؟"

"بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئەوە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر بوو." بەم شێوەیە ڤێلچانینۆف بڕوای بە خۆی دەهێنا و هێشتاش هەر بەردەوام بوو لە بیرکردنەوە و شیکردنەوە، "ئەو کازیمۆدۆیەی لە شاری ت بوو، بۆ ماوەی بیست دانە ساڵی ڕێک هەستی بە بچووکترین گومان چییە، لە تەواوی ئەو ناپاکییانەی ژنەکەی بەرامبەری کردبووی، گومانی نەکردبوو، هێندەش گەمژە و ساویلکە بووە، کە تەنانەت دۆستی ژنەکەشی خۆش ویستووە و ڕێزێکی زۆری گرتووە! بۆ ماوەی نۆ دانە ساڵی ڕێک، بەوپەڕی ڕێزەوە بیری لە من کردۆتەوە و تەواوی ئەو یادەوەرییانەی لە من هەیبووە، بەرز نرخاندوویەتی و هەروەها بۆ ماوەی نۆ دانە ساڵی ڕێک بەردەوام بەقووڵی بیری لەو وتانە کردۆتەوە، کە لە زاری من هاتبوونە دەرەوە... خوایە گیان! منیش بە هیچ شێوەیەک بۆ ساتێکیش چی بووە بیرم لە ئەو نەکردبۆوە! ئەو شتانەی دوێنێ دەیوتن، دڵنیام درۆی نەدەکرد! بەس ئایا دوێنێ کە هەستی خۆی بۆ دەر بڕیم و پێی

وتم با حسابەکەمان یەکلایی بکەینەوە! بەڕاست تۆ بڵێیت هەر خۆشی ویستبێتم؟ بەڵێ، منی بەکینەوە خۆش دەویست، ئەمە بەهێزترین جۆری خۆشەویستییە...

"گومانی تێدا نییە کە ئەمە هەر دەبوو ڕووی بدایە، بەدڵنیاییەوە پێویست بوو ئەوە هەر ڕووی بدایە، کە لە شاری ت کاریگەرییەکی ئاوا قووڵی لەسەر بەجێ بهێڵم. کاریگەرییەکی گەورە و دڵخۆشکەر، ئەمە ئەو شتە بوو، کە ئاسوودەیی پێ بەخشیوە، تەنها لەگەڵ شیلەرییەکی وەک ئەو، کە لە بەرگی کازیمۆدۆدا خۆی نماییش دەکرد، شتێکی لەم جۆرە ئەگەری ڕوودانی هەیە! ئەو سەد جار زیاتر لە قەبارەی ڕاستەقینەی خۆم گەورەتری کردبووم، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی لەو تەنیاییە فەلسەفییەی هەیبوو، ئێجگار تووشی سەرسامیم کردبوو... خۆش دەبوو گەر بمزانییایە بە چ شتێک زۆر سەرسامم کردووە. ڕەنگە بە دەستکێشە خاوێنەکانم چۆنێتیی لەدەستکردنم سەرسام بووبێت. کازیمۆدۆکان هیوایەتیان هەموو جۆرەکانی ئیستاتیکایە. ئاها! ئەویش چۆن هیوایەتێک! هەندێک جار ڕەنگە تەنها جووتێک دەستکێش بۆ خاوەن دڵێکی باش، یاخود زۆر بەتایبەتی بۆ یەکێک لەم مێردە هەمیشەییانە بەتەواوی بەس بێت. بەس بێت بۆ ئەوەی دواتر خۆیان هەزار جار لەوەی کە هەیت، گەورەترت بکەن، نەک هەر ئەوەش، تەنانەت ئامادەش دەبن لەپێناو بەدیهێنانی ویستێکی سادەتدا خۆیان بە کوشت بدەن. چ بیروباوەڕ و تامەزرۆییەکی سەیری لە خۆی نیشان دەدا بەرامبەر بە هێزی دڵفڕاندنم! ڕەنگە هەر ئەو هێزی دڵفڕاندنەی خۆشم بووبێت، کە ئا بەو شێوە زۆرە تامەزرۆم کردبێت و

سەرسامم کردبێت بە هێزی دڵفڕاندنم. ئەو هاوارەی لەو شەوەدا هاواری دەکرد، "ئەگەر ئەویش بە هەمان شێوەیە... ئیتر دەبێت متمانە بە کێ بکەم!" مرۆڤ لەدوای وەها هاوارکردنێک، ڕەنگە ببێت بە ئاژەڵێکی درندە!..."

"هممم! ئەو دێت بۆ ئێرە، تا لە ئامێزم بگرێت و فرمێسک بڕێژێت! هەر بەو شێوەیەی خودی خۆی بە چەندین ڕێگەی نەشیاو و بەد ئەمەی دەر دەبڕی، کەچی لە ڕاستیدا ئەو هاتبوو بۆ ئێرە تا سەرم لە لاشە جیا بکاتەوە، خۆی وا بیری کردبۆوە کە دێت تا لە ئامێزم بگرێت و فرمێسک بڕژێت... لیزاشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. بەڵام کێش ناڵێت ئەگەر هەر بەڕاستی لەگەڵیدا بگریامایە، بۆی نەبوو هەر بەڕاستی لێم خۆش بووایە!... بەڵام هەموو ئەمانە هەر لە یەکەم دیداردا هەمووی سەرتاپا گۆڕا بۆ هەڵسوکەوتێکی سەرخۆشانە و قۆشمەبازییانە و کاریکاتێرییانە، بۆ ڕەفتارگەلێکی قێزەون، هەر وەک چۆن ئافرەتێک لەسەر هەڵەکانی دەکرووزێتەوە، ئەویش وەک ژن نووزەنووزی دەکرد. ئەی ئەو شاخانە! ئەی ئەو شاخانەی لەسەر تەوێڵی درووستی کردن! هەر بەمەبەست دەهات بۆ ئەوەی بتوانێت بە کامی دڵی خۆی قسە بکات و خۆی خاڵی بکاتەوە، بۆیە بەو شێوەیە خۆی مەست دەکرد، بۆ ئەوەی بەگاڵتەجارییەوە، ئەوەی دەیویست، دەری ببڕێت، هەر لەبەر ئەمەش دەوری گاڵتەجاڕی دەگێڕا، چونکە ئەگەر وای نەکردایە و خۆی مەست نەکردایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە گەلێک دژوار دەبوو بۆی، کە ئەوەی لە ناوەوەیدایە هەڵی بڕێژێتە دەرەوە... چەند دڵخۆش بوو بەوەی ڕۆڵی گاڵتەجاڕ دەگێڕێت! چەند دڵخۆش بوو پێی!"

"ئاها ئەی ئەو کاتەی وای لێ کردم ماچی بکەم، دەبێت چەندێک دڵی خۆش بووبێت! بەڵام تەنها ئەوە نەبێت، کە نەیدەزانی ئایا شتەکە بە لەئامێزگرتنم کۆتایی دێت یاخود بە کوشتنم؟ بەڵام بەدڵنیاییەوە، بیری لەوە کردبۆوە، کە هەردووکیان بەیەکەوە ئەنجام بدات، واتە سەرەتا لە ئامێزم بگرێت و پاشان بمکوژێت. ئەمە سروشتیترین ڕێگەچارە بوو! بەڵێ، لە ڕاستیدا سروشت کەسانی دڕندە و شەڕخوازی خۆش ناوێت و هەر بە ڕێگەی سروشتییش لەناویان دەبات. دڕندەترینی دڕندەکان دڕندەیەکە، کە خاوەنی هەست و سۆزێکی گەورە و جوان بێت، من ئەمەم بە ئەزموونی خۆم بۆ دەر کەوتووە، ئەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ! کە سروشت بۆ دڕندەکان دایکێکی بەسۆز نییە، بەڵکوو باوەژنێکی خوانەناسە. سروشت خۆی ناشرینی بەبار دەهێنێت، بەڵام لەبریی ئەوەی بەزەییی پێدا بێتەوە، ئەشکەنجەی دەدات، ئەمەش لە جێی خۆیدایە. تەنانەت خەڵکی بێگوناهیش لەم سەردەمەدا دەبێت باجی ئامێزکردن و فرمێسکڕشتنی لێخۆشبوون بدەن، ئیتر چ جای بگات بە من و تۆ، پاڤێل پاڤلۆڤیچ! باشترە هەر باسی خۆمان نەکەین!"

"پەنا بە خوا لە گەمژەییی ئەم پیاوە! خۆ ئەونە گەمژە بوو، بردمی بۆ بینینی ژنی داهاتووشی! ژنی داهاتووی! تەنها کازیمۆدۆیەکی وەک ئەو دەتوانێت هیواخوازی ئەوە بێت، کە بە هاوکاریی پاکی و بێگوناهیی مادمۆزێل زاخلیبینین، سەرلەنوێ ژیانێکی نوێ بنیات بنێتەوە. بەڵام ئەمە هەڵەی تۆ نییە پاڤێل پاڤلۆڤیچ، نا، بە هیچ شێوەیەک ئەوە هەڵەی تۆ نییە: تۆ دڕندەیت، بۆیە بەدەست خۆت نییە کە ئاوایت،

دەبێت هەموو ئەو شتانەی لە تۆدان، بریتی بن لە دڕندەیی، تەنانەت خەون و هیواکانیشت، هەرچەندە ئەو دڕندەش بوو، بەڵام گومانی لە خەونەکەی خۆی هەبووە، هەر لەبەر ئەمەش پێویستی بە پاڵپشتیکردنی گەورە و بەڕێزی ئەو کەسەی زۆر جێگەی ڕێز بووە لەلای بەڕێز ڤیلچانینۆڤ بووە. ڤیلچانینۆڤی بۆ ئەوە دەویست، کە بۆی بسەلمێنێت، دڵنیای بکاتەوە خەونەکەی ئەو تەنها خەون نییە، بەڵکوو خەونەکەی، خەونێکی ڕاستەقینەیە. ئەو بۆ ئەوێی نەدەبردم ئەگەر لەبەر ئەو ڕێزە ڕاستەقینەیەی نەبووایە، کە بەرامبەر بە من هەیبوو، یاخود ئەگەر ئیمانی بە خانەدانیی هەست و سۆزم نەبووایە، ڕەنگە بڕوای وا بووبێت، کە لەوێ، لەپشت بیشەڵانێکدا، لە نزیک هەموو ئەو لاوە بێگوناهانەدا، باوەش دەکەین بە یەکتریدا و پێکەوە دەگرین و هۆن هۆن فرمێسک دەڕێژین. بەڵێ! ئەو مێردی هەمیشەییە، دواجار ناچار بوو، زوو بێت یان درەنگ، خۆی لەسەر هەموو شتێک سزا بدات، بۆ ئەوەشی خۆی سزا بدات، بە هەلی زانی و پڕی کرد بە گوێزانەکەدا - ڕاستە بەڕێکەوت گوێزانەکەی هەڵگرتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەلەی قۆستەوەو هەڵی گرت! لەگەڵ ئەوەشدا لە ئامادەبوونی جەنابی پارێزگاردا، چەقۆکەی دەر هێنا و لە ورگی ڕۆ کرد. بەڕاست تۆ بڵێیت هەر بەڕاستی کاتێک چیرۆکی ئەو برازاوایەی بۆ گێڕامەوە، بیرۆکەیەکی لەم جۆرەش نەخزابێتە مێشکی ئەوەوە؟ یاخود ئەو شەوەی لە جێگە خەوەکەی خۆی هاتبووە دەرەوە و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بەپێوە وەستابوو، تۆ بڵێیت هەر بەڕاستی بیری لە ئەنجامدانی وەها کارێک کردبێتەوە و وەها بیرۆکەیەکی

لە مێشکدا بووبێت؟ هممم! نا، ڕەنگە هەر بۆ سوعبەت بەو شێوەیە ڕاوەستابێت. ڕەنگە بۆ شتێکی تر هەستابێت، بەڵام کاتێک بینیبووی من لێی ترساوم، بۆ ماوەی دە خولەکێک هیچ وەڵامێکی نەدابوومەوە، لەبەر ئەوەی گەلێک چێژی بینیبوو لەوەی لێی ترساوم... ڕەنگە لەو ساتەدا بووبێت، کاتێک بەپێوە لەناو تاریکییەکەدا ڕاوەستابوو، بۆ یەکەم جار بیرۆکەیەکی لەو جۆرە خزابێتە مێشکیەوە..."

"ڕەنگە ئەگەر دوێنێ ئەو گوێزانە نەفرەتییەم لە سەر مێزەکە لەبیر نەچووبایە، هیچ شتێک ڕووی نەدایە. تۆ بڵێیت وا بووایە؟ بەدڵنیاییەوە سەرەتا خۆی لە من دوور خستەوە، بۆ ماوەی دوو دانە حەوتوو دانی بە خۆیدا گرت و سەردانی نەکردم، خۆی لە من دەشاردەوە، لەبەر ئەوەی بەزەیی پێمدا هاتۆتەوە! بەدڵنیاییەوە سەرەتا چووبوو بە سەروەختی باگاوتۆڤەوە و ئەوی هەڵبژارد، نەک من! ئەی ئەو پەلەپەلەی بۆ گەرمکردنی دەورییەکان و ئامادەکردنیان بۆ من لەو شەوەدا، ڕەنگە بیری لەوە کردبێتەوە بیری خۆی بە شتێکی ترەوە سەرقاڵ بکات، ڕەنگە ویستبێتی بیرۆکەی چەقۆکە بگۆڕێت بۆ بەزەیی و خۆشەویستی!... دەیویست خۆی و منیش بە هۆی ئەو دەورییە گەرمانەوە ڕزگار بکات!..."

بەم شێوەیە مێشکی نەخۆشی ئەو پیاو دنیادیدەیە بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بەم شێوەیە هەر لە بیرکردنەوە و شیکردنەوەی شتەکاندا بوو، بەردەوام و بەردەوام بە چواردەوری بازنەیەکدا دەخولایەوە، تا هێواش هێواش ئارامتر بۆوە و چاوی چووە خەو. ڕۆژی دواتر بە هەمان ئەو سەرئێشەیەوە خەبەری بۆوە، کە پێوەی خەوتبوو، بەڵام

ئـەم سەرئێشـەیەیان تـەواو نـوێ و هەروەهـا بـە شـێوەیەکی تـەواو چاوەڕواننەکراو ترسـی لـە دڵـی خسـتبوو...

سـەرچاوەی ئـەم ترسـە نوێیـە لـە باوەڕێکـی چەسـپاوەوە بـوو، باوەڕێـک، کـە لەنـاکاو تێیـدا سـەری هەڵدابـوو، تـا بشـهاتایە، بەهێزتـر و بەهێزتـر دەبـوو، ئـەوە بـوو کـە ئـەو، واتـە ڤێلچانینۆڤ، پیاوە دنیادیدەکە، لـە کۆتاییدا ئەمڕۆ بە پێی خـۆی دەبێـت بچێـت بـۆ لای پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ. بـەڵام بۆچـی و لەبـەر چـی؟ هیـچ بیرۆکەیەکـی وای لـە خەیاڵدا نەبـوو، لەبـەر ئـەوەی زۆر بێـزار بـوو، حـەزی نەدەکـرد هیـچ بزانێـت، هەمـوو ئـەوەی ئـەو دەیزانـی، لەبـەر هەندێـک هـۆکار، دەبـوو هـەر بچێـت بـۆ لای.

ئـەم شـێتییە، هەرچۆنێـک بێـت، کـە خـۆی وای نـاو دەبـرد، زۆر بەڕوونـی تـا زیاتـر پـەرەی بسـەندایە، شـێوەیەکی ماقوڵتـر و ئەقڵانیتـری وەر دەگـرت و بەمـەش بیناوویەکـی بەجێـی دەدا بەدەسـتییەوە، تەنانـەت ڕۆژێـک پێشـتریش ڤێلچانینـۆڤ ئـەو بیرۆکەیـەی کەوتبـووە مێشـکیەوە، کـە پاڤێـل پاڤلۆڤیـچ کاتێـک دەگەڕێتـەوە بـۆ کوختەکـەی، ئـەوە دەسـتبەجێ خـۆی لەسـێدارە دەدات، هـەر وەک ئـەو فەرمانبـەرەی ماریـا سیسـۆڤنا باسـی لێـوە کـرد، کـە لـە ژوورەکـەی خۆیـدا خـۆی لەسـێدارە دابـوو. ئـەم بڕوایـەی لـە ڕۆژی پێشـووترەوە بـۆی دروسـت ببـوو، بەرەبـەرە خەریـک بـوو دەگـۆڕا بـۆ بڕوایەکـی بێبنەمای چەسـپاو. بـەڵام هـەر سـوور بـوو لەسـەر ئـەو بڕوایـەی. هەرچەنـدە دەیویسـت هەرچۆنێـک بـووە ئاراسـتەی بیرکردنەوەکانـی لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە بگـۆڕێت، کەچـی پـاش تێپەڕبوونـی هـەر نیوخولەکێـک، بـەردەوام لەبـەر خۆیـەوە دەیـوت، "باشـە ئـەو

بێئەقڵی گەمژەیە بۆ دەبێت خۆی لەسێدارە بدات؟" پاشان لەپڕ قسەکانی لیزای بیر دەکەوتەوە... یەکسەر بیری کردەوە و وتی، "بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، خۆ ئەگەر منیش لە شوێنی ئەو بوومایە، ئەوە بەدڵنیابییەوە خۆم لەسێدارە دەدا..."

دواجار ڤێلچانینۆڤ بڕیاری دا کە لەبریی ئەوەی بچێت بۆ خواردنی نانی ئێوارە، ڕاستەوخۆ بچێت بۆ لای پاڤێل پاڤلۆڤیچ. بڕیاریدا: "پێویستە بچم و زۆر بەسانایی هەواڵی لە ماریا سیسۆڤنا بپرسم." بەڵام پێش ئەوەی پێ بخاتە ناو شەقامەکە، تاوێک لەناو دەروازەکەدا ڕاوەستا. لەپڕ هاواری کرد و ڕوخساری لە تەریقیدا سوور هەڵگەڕا، "یانی ڕێی تێ دەچێت؟ ڕێی تێ دەچێت؟ ڕێی تێ دەچێت کە من ئاوا سەری خۆم شۆڕ بکەم و بچم بۆ ئەوێ، بۆ ئەوەی یەکتر باوەش بکەین و فرمێسک بڕێژین؟ هەموو ئەوەی ئەو بێمێشکی بەدفەڕە پێویستیەتی، ئەوەیە وازی لێ بهێنم تا بەتەواوی ڕسوا دەبێت!"

بەڵام بە هۆی بەتەنگەوە هاتنی ئیلاهییەوە، کە بەتەنگ هەموو مرۆڤێکی شایستە و بەڕێزەوە دێت، ئەمیش لەم بێمێشکی و بەدفەڕییە ڕزگاری بوو. هەر هێندەی پێی خستە ناو شەقامەکە و چەند هەنگاوێکی کەمی نا، لووتی تەقی بە لووتی ئەلێکساندەر لۆبۆڤەوە، لاوەکە بەتوندی تووشی هەناسەبڕکێ ببوو و گەلێک شادمان دەهاتە بەرچاو.

"ئێستا هاتم تا چاوم پێت بکەوێت! چی دەڵێیت سەبارەت بە هاوڕێمان، پاڤێل پاڤلۆڤیچ؟"

ڤێلچانینۆڤ بەپەرۆشەوە هاواری کرد، "خۆی لەسێدارە داوە!"

لۆبۆف چاوەکانی زەق کردەوە و هاواری کرد، "کێ خۆی لەسێدارە داوە؟ بۆچی؟"

"هیچ... مەبەستم هیچ نەبوو، بەردەوام بە، قسەکەت تەواو بکە."

"ففففف! نەفرەت لە شەیتان! چ قسەگەلێکی سەیر دەکەن! بە هیچ شێوەیەک خۆی لەسێدارە نەداوە ئەسڵەن بۆ دەبێت خۆی لەسێدارە بدات؟ بە پێچەوانەوە، ئەو سەفەری کرد، هەمووی تۆزێک دەبێت خودی خۆم سواری شەمەنەفەرم کرد و بەرێم کرد، تیاحەح! چ عەرەقخۆرێکە! با بزانیت، سێ دانە بوتڵی ڕێکمان بەیەکەوە خواردەوە! پرێدپۆسیلۆڤیشمان لەگەڵدا بوو، بەڵام ئەگەر دەتبینی چۆن دەیخواردەوە، چ عەرەقخۆرێکە! لەناو شەمەنەفەرەکەدا سترانی دەچڕی. بەردەوام ناوی تۆی دەهێنا و ماچی بۆ هەڵدەدایت، سڵاوی بۆت هەبوو. بەڵام ئەو کەسێکی زۆر نزمە، تۆش هەر بە هەمان شێوە پێت وا نییە؟"

گومانی تێدا نەبوو کە کوڕە لاوەکە کەمێک مەست بوو، چونکە هەر لە سوورهەڵگەڕانی ڕوخساری، بریقانەوەی چاوەکانی و لاڵەپەتییەکەییەوە، زۆر بەئاسانی پەیت بەوە دەبرد کە مەستە.

ڤێلچانینۆڤ بە دەنگی بەرز دای لە قاقای پێکەنین.

"کەواتە لە کۆتاییدا بەیەکەوە خواردتانەوە و بوون بە برادەر! ها، ها! باوەشتان بەیەکدا کردووە و فرمێسکتان هەڵڕشتووە! ئاخ لەدەست ئێوە، ئەی شاعیرینە، ئەی برادەرەکانی شیلەر!"

"بە یارمەتی خۆت، ناووناتۆرەمان لێ مەنێ. دەزانیت ئەو

بەتەواوی دەستی لە هەموو شتێکی ئێرە هەڵگرت و چاوپۆشیشی لە هەموو شتێک کرد؟ دوێنێ و ئەمڕۆش چووبوو بۆ ئەوێ. بە شێوەیەکی زۆر ترسنۆکانە ڕەفتاری کردبوو. لە کاتێکدا نادیا لە ژوورێک لە نهۆمی سەرەوە بۆخۆی دانیشتبوو، دەرگاکەیان لەسەر کڵۆم کردبوو. زۆر بەکوڵ دەگریا و شین و ڕۆڕۆی دنیای نابووەوە، بەڵام ئێمە خۆمان نەدا بەدەستەوە! بەڵام هەر بەڕاستی ئەو کابرایە چ عەرەقخۆرێکە! چ عەرەقخۆرێک! ئەگەر ئەتزانی چ ژنێکی دڵکارانەی هەبوو... واتە، ژنێکی خراپ نا، نازانم چۆن بڵێم؟... بەردەوام سەبارەت بە تۆ قسەی دەکرد، بەڵام تۆ لەگەڵ ئەودا بەینی ئەرز و ئاسمانتان هەیە! تۆ هەرچۆنێک بێت، پیاوێکی خانەدان و بەڕێزیت، هیچ نەبێت خۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان لەناو چینێکی خانەداندا ژیاویت، پێم وایە هەنووکە بە هۆی چەند هۆکارێکەوە وەک هەژاری یاخود هەرشتێکی ترەوە ناچار بوون خۆتان لەو چینە کۆمەڵایەتییە دوور بخەنەوە... بۆ واتان کردووە، لەوە سەر دەر ناکەم، مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێت!"

"ئێ ئێ، کەواتە بەم شێوەیە سەبارەت بە من قسەی بۆ کردوون؟"

"بەڵێ، بەڵێ بەم شێوەیە، بەڵام تکایە توورە مەبن! باشترە مرۆڤ هاووڵاتێکی ئاسایی بێت وەک لەوەی سەر بە چینێکی ئەرستۆکراتی بێت. وا دەڵێم لەبەر ئەوەی لەم سەردەمەدا لە ڕوسیا پیاو نازانێت ڕێز لە کێ بگرێت و لە کێی نەگرێت. تۆش بە هەمان شێوە پێت وا نییە ئەمە مەترسیدارترین نەخۆشیی ئەم چەرخەیە، کاتێک خەڵکی نەزانێت کە دەبێت ڕێز لە کێ بگرێت و لە کێشی نەگرێت، وا نییە؟"

"وایە، وایە، ئەی ئەو چی وت؟"

"ئەو؟ کێ؟ ئەها، بەڵێ بەدڵنیاییەوە! نازانم بۆ بەردەوام هەر دەیوت ڤێلچانینۆڤ تەمەنی پەنجایە، بەڵام تێکشکاوە، بەڵام تێناگەم بۆچی دەیوت بەڵام تێکشکاوە و نەیدەوت هەروەها تێکشکاوە! درۆی نەبێت، زیاد لە هەزار جار ئەم قسەیەی دووبارە کردۆتەوە و بە کامی دڵی خۆی پێکەنیوە، کاتێکیش چووە ناو شەمەنەفەرەکەوە، سترانێکی چڕی و دای لە پرمەی گریان، پیاو کە تەماشای ڕوخساری دەکرد، هەم دڵی پێی تێکەڵ دەهات و هەم بەزەییشی پێیدا دەهاتەوە، لە ڕاستیدا لەوپەڕی مەستیدا بوو. ئاها! حەزم بە چارەی مرۆڤی گەمژە نییە! پارەی بۆ سواڵکەران هەڵدەدا لەپێناو ئاسوودەیی ڕۆحی لیزاڤیتا، ژنەکەی، وایە؟"

"نا، کچەکەی."

"بەڕاست، دەستتان چی لێ بەسەر هاتووە؟"

"بڕیم."

"کێشە نییە، خۆی باش دەبێت. بەنەفرەت بێت، ئەزانی شتێکی باش بوو کە ئێرەی بەجێ هێشت، بەڵام لەسەر چی دەڵێن گرێو دەکەم، کە هەر هێندەی گەیشتەوە شوێنی خۆی، دەستبەجێ هاوسەرگیری دەکاتەوە، دڵنیام وا دەکات، وا ناکات؟"

"نازانم، بەڵام خۆ تۆش بە هەمان شێوە دەتەوێت هاوسەرگیری بکەیت، وا نییە؟"

"من؟ بەڵام ئەوە بابەتێکی ترە. بەڕاست تۆ مرۆڤێکی چەند سەیریت! ئەگەر تۆ پەنجا ساڵ بیت، ئەوە بێ شک ئەو شەست دەبێت؛ مامۆ گیان، پێویستە پیاو کەمێک لۆژیکی

تەماشای ئەمە بکات! دەزانن کە من ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش لایەنگرێکی سەرسەختی بیروباوەڕی سلاڤییەکان بووم، بەڵام ئێستا چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆرین لە ڕۆژئاواوە... بەڵام ئێستا دەبێت بڕۆم و بە خواتان بسپێرم، خۆشحاڵ بووم بە بینینتان، بەبێ ئەوەی بێمە سەرەوە بۆ ماڵەکەت، تکایە داوام لێ مەکەن بێمە ماڵەوە، لەبەر ئەوەی نایەم هێندەشم کات لە بەردەستدا نییە کە بەفیڕۆی بدەم!...“

وای وت و پێی هەڵگرت و بەپرتاو بۆی دەر چوو. بەڵام هێندەی نەبرد، خێرا گەڕایەوە و هاواری کرد، ”ئاهـ باش بوو بیرم کەوتەوە! پاڤێل پاڤلۆڤیچ نامەیەکی پێ دام، کە بیگەیەنم بە دەستت! فەرموو ئەوەش نامەکە. بۆچی نەهاتیت تا بەڕێی بکەیت و خوداحافیزیی لێ بکەیت؟“

ڤێلچانینۆڤ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و زەرفی نامەکەی هەڵپچڕی، کە ناوونیشانی ئەمی لەسەر بوو. بەڵام لەناو نامەکەدا تەنها دێڕێکیش چییە، هیی پاڤێل پاڤلۆڤیچی تێدا نەبوو. بەڵکوو نامەیەکی جیاوازتری تێدا بوو، کە ڤێلچانینۆڤ دەستبەجێ دەستخەتەکەی ناسییەوە، نامەیەکی کۆن بوو، لەسەر کاغەزێک نووسرابوو، کە بە تێپەڕبوونی زەمەن ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، هەروەها ڕەنگی مەرەکەبەکەشی، لەگەڵ گۆڕانی کاغەزەکەدا، ئەویش گۆڕابوو. نامەیەک بوو کە دە ساڵ پێشتر، دوای دوو مانگ لە گەڕانەوەی لە شاری ت بۆ پترسبۆرگ، بۆ ئەم نووسرابوو. بەڵام نامەکە هەرگیز بە دەستی نەگەیشتبوو، بەڵکوو لەبریی ئەو نامەیە، نامەیەکی تری بەدەست گەیشتبوو، لە زەردهەڵگەڕانی نامەکەوە بە هۆی کۆنییەوە زۆر بەڕوونی پێش ئەوەی دەست بکات بە

خوێندنەوەی، لە هەموو شت تێگەیشت. لەم نامەیەدا هەر وەک ئەو نامەیەی یەکەم جار بەدەستی گەیشتبوو، ناتالیا ڤاسیلیڤنا بۆی نووسیبوو، کە پەیوەندییەکەیان بۆ هەمیشە کۆتایی هاتووە، هەروەها دانیشی بەوەدا نابوو، کە کەسێکی تری خۆش دەوێت، بەڵام ئەوەی لێ نەشاردبۆوە، کە منداڵی دەبێت. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، بۆ ئەوەی ئاسوودەی بکات و هیوای ئەوەی پێ بەخشیبوو، کە ڕەنگە لە ئاییندەدا ڕێگەیەک بدۆزێتەوە و منداڵەکەی بۆ بنێرێت. ئەوی لەوە دڵنیا کردبۆوە، کە لەمەودوا، هەریەکەیان ئەرکێکی تری هەیە تا پێی هەستێت، بەکورتی، نامەکە زۆر نالۆژیکی بوو، بەڵام پەیامی سەرەکیی نامەکە زۆر ڕوون بوو، ئەویش ڕزگاربوون بوو لە خۆشەویستییەکەی ڤێلچانینۆڤ. تەنانەت ڕێشی پێ دابوو لەدوای ساڵێک ئەگەر پێی خۆشبوو، دەتوانێت بێت بۆ ت بۆ ئەوەی چاوی بە منداڵەکەی بکەوێت.

مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێت کە ئەو ئافرەتە بۆچی بیری خۆی گۆڕیوە و لەبریی ئەم نامەیە، نامەکەی تری ناردبوو.

لە کاتێکدا ڤێلچانینۆڤ نامەکەی دەخوێندەوە، بەتەواوی ڕەنگی تێک چووبوو، بەڵام لەو کاتەدا وێنەی پاڤێل پاڤلۆڤیچی هێنایە پێشچاوی خۆی، کە چۆن ئەو نامەیەی دۆزیوەتەوە و بۆ یەکەم جار خوێندوویەتیەوە، لەپێش سەری هەڵپچڕاوی ئەو سندوقچەیەی لە داری ئەبەنوس دروست کرابوو چواردەوریشی بە مرواری و سەدەف ڕووپۆش کرابوو، کە وەک شتێکی بەنرخ لە باووباپیرانیانەوە بەمیراتی بۆ خێزانەکەیان بەجێ مابوو.

لە کاتێکدا لە ئاوێنەکەدا لە ڕوخساری خۆی ورد دەبۆوە، لە دڵی خۆیدا وتی، "ئەویش ڕەنگە بە هەمان شێوەی من کاتێک نامەکەی خوێندۆتەوە، ڕەنگی مردووی لێ نیشتبێت، ڕەنگە کاتێک خوێندوویەتیەوە، چاوەکانی داخستبێت و پاشان سەرلەنوێ چاوەکانی کردۆتەوە و بەو هیوایەی نامەکە بگۆڕدرێت بۆ کاغەزێکی خاڵی و سپی.... گومانی تێدا نییە، کە ئەم کارەی دووبارە و سێبارە کردۆتەوە!..."

# ١٧

## مێردی هەمیشەیی

نزیکەی دوو دانە ساڵی ڕێک بەسەر هەموو ئەو ڕووداوانەی باسمان لێوە کرد، تێپەڕی کردبوو، سەرلەنوێ لە ڕۆژێکی هاوینی دلگیردا، لەناو یەکێک لە واگۆنی ئەو شەمەنەفەرە نوێیانەی تازە هێڵی ئاسنینەکەی کرابووەوە، چاومان بە بەڕێز ڤێلچانینۆڤ دەکەوێتەوە. ئەو بۆ دلخۆشیی خۆی و بینینی یەکێک لە هاوڕێکانی، هەروەها بۆ مەبەستێکی تر، کە پێدەچوو داهاتوویەکی پرشنگدار و دلخۆشکەری بۆ دروست بکات، بەرەوە ئۆدێسا ڕێی گرتبووە بەر. بەو هیوایەی بتوانێت لە ڕێگەی ئەو هاوڕێیەیەوە چاوی بە خاتوونێکی گەلێک دلڕفێن بکەوێت، کە لەمێژ بوو بەوپەڕی شەیداییەوە ئارەزووی دروستکردنی خزمایەتیی لەگەڵ دەکرد. بەبێ ئەوەی بچینە ناو وردەکارییەکانەوە، بە ئەوەندە قاییل دەبین کە بڵێین ڤێلچانینۆڤ لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا سەرتاپا گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، یاخود بڵێین ژیانی ئەم کابرایە ڕەوتی ئاسایی خۆی وەر گرتبووەوە. لەو

گلەوگازندە کۆنانەی هەمیشە لەدەست خۆی هەیبوو، بەدەست نەخۆشییەکانیەوە تۆزقاڵێکیش چییە نەیمابوو، هەروەها لە تەواوی ئەو بیرەوەرییە جۆراوجۆرانە و تەواوی ئەو نیگەرانییانەی بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە، کە دوو ساڵ پێشتر لە پترسبۆرگ بە هۆی سەرنەکەوتنی دۆسیەکەیەوە لە دادگا هەراسانی کردبوو، هیچ شوێنەوارێکی لێ بەجێ نەمابوو، جگە لە هەستکردن بە شەرمێکی شاراوە لە لاوازی و کەمهۆشیی خۆی لەو ماوەیەدا کە تێی پەڕاندبوو. لەبەر ئەوەی بڕوای وا بوو ئەمە هەرگیز جارێکی تر دووبارە نابێتەوەو، هەرگیز هیچ کەسێکیش هیچ شتێکی لەبارەوە نازانێت، ئەمە کەمێک ئاسوودەییی پێ دەبەخشی و ببووە جێگەی دڵنەواییی. ئەوە ڕاست بوو کە لەو ماوەیەدا دەستبەرداری تەواوی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی و کۆمەڵگە خانەدانییەکەی ببوو، تەنانەت واشی لێ هاتبوو، کە چیی تر هیچ گرنگی نەدەدا بە پاکوخاوێنیی خۆی و پۆشینی جلوبەرگەکانی، خۆی لە چاوی هەمووان دەشاردەوە، جێگەی گومان نەبوو کە هەموانیش ئەم هەڵسوکەوتەی ئەویان سەرنج دابوو. بەڵام سەرلەنوێ و بەخێرایی دەستبەرداری هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەی بووەوە و بەملکەچی گەڕایەوە بۆ ناو ئەو کۆمەڵگەیەی پێشتر بەجێی هێشتبوو، بەزوویی متمانەبەخۆبوونەوەکەی و گوڕوتینەکەی جاری جارانی بۆ گەڕایەوە و دەستی کردەوە بە ژیانێکی نوێ، هەموانیش دەستبەجێ لە هەموو ئەو کاتەی ئەم لێیان دوور کەوتبووەوە، لێی خۆش بوون و سەرلەنوێ بەدڵئاوەڵاییەوە پێشوازییان لە گەڕانەوەی کرد. تەنانەت هەموو ئەو کەسانەشی کە ئەم پەیوەندیی سڵاوکردنی لەگەڵ

بڕیبوون، ئەوانە یەکەم کەسانێک بوون، کە ناسییانەوە و سەرلەنوێ دەستی هاوڕێیەتییان بۆ درێژ کردەوە، بێ ئەوەی هیچ جۆرە پرسیارێکی بێزارکەری لێ بکەن. وەک ئەوەی دیارنەبوونی ئەو ماوەیەی بە هۆی هەندێک کێشەی تایبەت بە خۆیەوە بووە و پەیوەندیی بە هیچ کەسێکیشەوە نەبووە. ئێستاش، دوای ماوەیەکی زۆر گەڕاوەتەوە بۆ ناویان. گومانی تێدا نەبوو، کە هۆکاری ئەو گۆڕانە بۆ باشتر، بریتی بوو لەو سەرکەوتنە بەرچاوەی لە دۆسیەکەیدا بەدەستی هێنابوو. لەبەر ئەوەی بە هۆی بردنەوەی ئەو دۆسیەیەوە، ڤێلچانینۆڤ ببووە خاوەنی شەست هەزار ڕۆبڵ، ڕاستە بڕەکە هێندە زۆر نەبوو، بەڵام بەدڵنیاییەوە بۆ ئەو بایەخێکی ئێجگار گەورە و گرنگی هەبوو، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە، ئێستا بۆ جارێکی تر سەرلەنوێ لەسەر پێیەکانی خۆی ڕاوەستابووەوە و لە دڵەوە ئاسوودە و قایل بوو. هەنووکە دڵنیا بوو لەوەی جارێکی تر وەک گەمژەیەک پارەکانی بەفیڕۆ نادات، هەر وەک چۆن کاتی خۆی ئەو دوو سەروەتە زەبەلاحەی یەکەم جاری بە گەمژەییی خۆی بەفیڕۆ دابوو. دەیزانی ئەم پارەیەی ئێستا لە بەردەستیدایە، تا دواساتەکانی ژیانی بەسیەتی. هەندێک جار، کاتێک هەندێک شتی نائاسایی و سەیری دەبینی و دەبیست کە لە چواردەوری ڕووی دەدا و سەرتاپای ڕوسیاشی گرتبووەوە، لە دڵی خۆیدا دەیوت، "باشە ئەوە کەی کێشەی منە ئەگەر سیستەمی کۆمەڵایەتی دابڕمێت! یان ئەوە کەی کێشەی منە کە بەو شێوەیە جاڕ دەدەن و بە هاژوهووژ مێشکی خەڵک پڕ دەکەن! یان ئەوە کەی کێشەی منە، کە بیروباوەڕی خەڵکی دەگۆڕێت یاخود نا! ئەوەی بۆ

من گرنگە، ئەوەیە کە هەمیشە ئێوارەخوانێکی هاوشێوەی ئەم ئێوارەخوانە خنجیلە و بەلەزەتەم لە بەردەستدا بێت، هەر وەک چۆن هەنووکە دانیشتووم و لە بەردەمم دانراوە، ئیتر چی ئەبێت با ببێت، چونکە من ئامادەم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر پێشهاتێکی نەخوازراو."

ئەم بیرۆکە دڵکەرەوە و ئارامبەخشە وردەوردە سەرتاپای بوونی بەتەواوی دەگرتەوە و بە شێوەیەکی فیزیکی و ڕۆحی، گۆڕانی بەسەردا هێنابوو، ئەمە جگە لە لایەنی ئەخلاقی و سروشتی خۆی. ئێستا تەواو لە مرۆڤێکی جیاواز دەچوو، هەرگیز لەو کەسە تەمەڵ و تەوەزەلەی نەدەکرد، کە دوو ساڵ بەر لە ئێستا باسی ژیانیمان کرد، کە چۆن پێشتر هەستابوو بە ئەنجامدانی کارگەلێکی ناشایستە و ئابڕووبەر. هەنووکە گەلێک خۆشحاڵ، ئاسوودە و شکۆمەند دەر دەکەوت. تەنانەت ئەو چرچولۆچانەشی کە لە چواردەوری چاوەکانی و سەر تەوێڵی دروست بووبوون و ببووە مایەی نیگەرانی، بەرەبەرە خەریک بوو لا دەچوو و نەدەما، هەروەها ئەو پەڵە زۆر وردانەی لەسەر ڕوخساری دروست ببوون، گۆڕابوون، پێستی سپی و سوورتر ببوو.

لەم ساتەدا کە بۆخۆی بەئاسوودەیی لە یەکێک لە واگۆنە نەرمەیەکاندا دانیشتبوو، بیرۆکەیەکی هەستبزوێن بەهێواشی خۆی دەخزاندە مێشکیەوە. لە وێستەگەی دواتر، هێڵی ئاسنەکە دەبوو بە دوو هێڵ، هێڵێکی نوێ لە هێڵە سەرەکییەکە جیا دەبۆوە و بەرەو لای ڕاست دەڕۆیشت. لەبەر خۆیەوە بە خۆی وت، "باشە چۆنە ئەگەر بۆ فەترەیەک لە ئاڕاستە سەرەکییەکەی خۆم لا بدەم و بەرەو

ئاراستەی لای دەستەڕاست بڕۆم؟" لەوێوە دەیتوانی سەردانی خاتوونێکی تری ناسیاوی بکات، کە تەنها دوو وێستگەی تر لەو شوێنەوە دوور بوو، کە نیازی بوو بۆی بچێت، هێندە نەدەبوو ئەو خاتوونە لە دەرەوە گەڕابووەوە و هەنووکە بۆخۆی بەتەنێ لە لادێیەکی چەپەک دەژیا، ئەو لادێیە بۆ ئەو گەلێک وەڕزکەر بوو، بەڵام بۆ ڤێلچانینۆڤ تەواو پێچەوانە بوو، هەر بۆیە ڤێلچانینۆڤ پێی وا بوو کە دەتوانێت چێژێکی باش لەو کاتە ببینێت، کە لەوێ بەسەری دەبات و هیچیشی لەو چێژە کەمتر نابێت، کە بەنیازە لە ئۆدێسا بەسەری ببات، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە دەتوانێت دواتر بشچێت بۆ ئۆدێسا. بەڵام هێشتا دوودڵبوو و بەتەواوی نەیدەتوانی بیری خۆی کۆ بکاتەوە و بڕیار بدات، چاوەڕوانی شتێکی دەکرد، کە وای لێ بکات بڕیاری خۆی لەسەر چوونی یاخود نەچوونی بدات. لە کاتێکدا شەمەنەفەرەکە خەریک بوو لە وێستگەکە نزیک دەبۆوە، ئەو شتەی چاوەڕوانی ڕوودانی دەکرد، ڕووی دا.

لەو وێستەگەیەدا شەمەنەفەرەکە بۆ ماوەی چل خولەکێک ڕاوەستا، دەرفەتی ئەوە بۆ سەرنشینەکان ڕەخسا، کە نانی ئێوارە بخۆن. لە بەردەم دەروازەی چوونەژوورەوە بۆ هۆڵی چاوەڕوانییەکە لە ناو سەرنشینە نمرەیەکەکان و نمرەدووەکاندا، وەکوو هەمیشە حەشیمەتێک لە خەڵکی تەنگەجیکڵدان و پەلەپەلکەر، قەرەباڵغی و هۆسەیەکی گەورەیان لە بەردەم دەروازەکەدا نایەوە، وەک هەمیشە لەوە دەچوو سەرلەنوێ ڕسواییەک ڕووی دابێت لەناو ئەو قەرەباڵغییەدا. خاتوونێکی گەلێک جوان لە یەکێک لە واگۆنە نمرەدووەکانەوە دابەزی، بەڵام بە جلوبەرگی ئاڵووالاوە خۆی گۆڕیبوو، کە

خۆگۆڕینەکەی بۆ گەشتکەرێکی ئافرەت زۆر شیاو نەبوو. لە واگۆنەکە دابەزی و بە هەردوو دەستیشی بەدوای خۆیدا ئەفسەرێکی سوارەی پەلکێش دەکرد، ئەفسەرەکە تا بڵێی لاو و قۆز بوو. لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەرچۆنێک بووە خۆی لەچنگی خاتوونەکە قوتار بکات. ئەفسەرە لاوەکە هێندەی خواردبۆوە، ببوو بە داشقە، خانمەکەش، کە بە ڕوخساریدا وا دەر دەکەوت ناسیاوێکی بەتەمەنی ئەو ئەفسەرە لاوە بێت، دەرفەتی بە لاوەکە نەدەدا بڕوات، وا دیار بوو لەوە بترسێت، کە ئەگەر بێت و دەستی بەر بدات، ئەوا لاوەکە یەکسەر بە خشکەیی بڕوات و خۆی بکات بە باڕێکدا و سەرلەنوێ دەست بکاتەوە بە خواردنەوە. لەو کاتەدا، لە ناو قەرەباڵغیی و پاڵەپەستۆکەدا، ئەفسەرە لاوەکە خۆی کێشا بە بازرگانێکی لاودا، کە ئەویش حاڵی لەم باشتر نەبوو، بە شێوەیەکی زۆر ئابڕووبەر مەست بوو. ئەو بازرگانە لاوە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ دەبوو لە وێستگەکە لای دابوو، دەیخواردەوە و پارەکانی بەناو ئەو هاوڕێیانەیدا تەخشانوپەخشان دەکرد، کە چواردەوریان دابوو، بەبێ ئەوەی دەرفەتی ئەوە بە خۆی بدات درێژە بە گەشتەکەی بدات. بوو بە شەڕەمستەکۆڵە، ئەفسەرە لاوەکە نەڕاندی بەسەر بازرگانەکەدا و بازرگانەکەش جنێوی بە ئەفسەرەکە دا، خاتوونەکەش بێهیوایانە هەوڵی دەدا ئەفسەرە لاوەکە لە شەڕکردنەکە دوور بخاتەوە، بەردەوام هاواری دەکرد و بە دەنگێکی لێپاڕانەوە دەیوت، "میتنکا! میتنکا*!"

ئەم هاوارهاوارەی ژنەکە لەوە دەچوو بازرگانە لاوەکەی

* میتنکا: کورتکراوەی ناوی دیمترییە، لەبەر خۆشەویستی وا بانگ دەکرێت.

لـە حاڵـی خـۆی تەریـق کردبێتـەوە، ڕاسـتە هەمـوو خەڵکەکـە پێدەکەنیـن، بـەڵام بازرگانـە لاوەکـە زیاتـر لـە هەرکاتێکـی دی هەسـتی بـە جـاڕزی و شـەرمەزاری دەکـرد، وەک ئـەوەی لـە ڕووی ئەخلاقییـەوە هەسـت و سـۆزی ڕووشـێندرابێت.

بـە دەنگێکـی لۆمەکەرانـەوە لاسـاییی دەنگـە ناسـازەکەی خاتوونەکـەی کـردەوە و وتـی، "ئـۆی! دەڵێـم، میتنـکا! میتنـکا!... داوەشـێن، لـە بـەردەم ئـەو خەڵکەشـدا هەسـت بـە شـەرم و تەریقبوونـەوە ناکـەن!"

پاشـان بـەلارەلار خـۆی لـە خاتوونەکـە نزیـک کـردەوە، کـە هەرچۆنێـک بێـت، بەپەلـە توانیبـووی خـۆی بگەیەنێتـە سـەر کورسـییەک لـەو نزیکانـەو، هەرچۆنێکیـش بێـت، توانیبـووی ئەفسـەرە لاوەکـە لەتەنیشـت خۆیـەوە دابنیشـێنێت، بازرگانـە لاوەکـە بـە چاوێکـی سـووکەوە لـە هەردووکیانـی ڕوانـی و بـە دەنگێکـی گاڵتەجاڕانـە و سـووکایەتیپێکردنەوە بـە خاتوونەکـەی وت، "تۆ لە ژنێکی چەپەڵ زیاتر، چیی دی نیت، تۆ چەپەڵیت، بۆ ناچیت کلکت لەناو ئەو گووەی تێی کەوتووە، دەر بهێنێتەوە!"

خاتوونەکـە قیژەیەکـی کـرد و پاشـان بەسـتەزمانانە لـە چـواردەوری خـۆی ڕوانـی، بـەو هیوایـەی یەکێـک لـەم دۆخـە دەربازیـان بـکات. لـە یـەک کاتـدا هـەم دەترسـا و هـەم هەسـتی بـە خەجاڵەتییـش دەکـرد، ئەفسـەرە لاوەکـەش بـۆ ئـەوەی وەڵامـی ئـەم سـووکایەتییە بداتـەوە و کۆتاییـی پـێ بهێنێـت، لەسـەر کورسـییەکەی بازێکـی دا و بەنەڕەنـەڕەوە کشـا بـەرەو لای بازرگانەکـە، بـەڵام لـە بێبەختیـی خـۆی، پێـی هەڵخلیسـکا و زرم بـە پشـتا کەوتـەوە سـەر کورسـییەکەی و شـڵپە لـە قوونـی هەسـتا.

دەنگی قاقای پێکەنین لە چواردەوریان زیاتر لە هەرکاتێکی تر بەرز بۆوە، کەس نیازی نەبوو بەفریایانەوە بچێت، تەنها ڤێلچانینۆڤ نەبێت، کە دەستوبرد بەدەمیانەوە چوو تا لەو تەنگەژەیە ڕزگاریان بکات؛ یەخەی کابرای بازرگانی گرت و لە شوێنی خۆی ڕای وەشاند و خولاندیەوە، پاشان هەر بەپاڵ پێنج هەنگاوێک لەو خاتوونەی دوور خستەوە، کە لە ترساندا هەترەشی چووبوو. ئیتر بەم شێوەیە شانۆگەرییەکە کۆتاییی پێ هات، بازرگانەکە بەو ڕاوەشاندنە و بەو جەستە بەهێز و بەهەیبەتەی ڤێلچانینۆڤ، کە پەلاماری دابوو بەتەواوی خۆی دۆڕاند، هاوڕێکانی بەپەلە لەو شوێنەدا دووریان خستەوە. سەروسیما و سەنگینیی ئەو پیاوە بەڕێزەی بە شێوەیەکی زۆر شکۆمەندانە جلی پۆشیبوو، بە شێوەیەکی زۆر کاریگەر کاری لەو خەڵکە هوهاکێشە کرد، کە هەموویان پێشتر تەماشایان دەکرد و قاقایان لێدەدا، هەموویان بە جارێک لە شوێنی خۆیان کڕ بوونەوە.

خاتوونەکە لە خۆشحاڵیدا ڕوخساری سوور هەڵگەڕا و چەند دڵۆپە فرمێسکێکیشی هەڵوەراند، نەیدەزانی بە چ زمانێک سوپاسگوزاریی خۆی بۆ ئەو کەسە دەر ببڕێت، کە لەو دۆخە ڕزگاری کردبوون. ئەفسەرە لاوەکەش بە زمانێکی تەتەڵە و تێکشکاوەوە وتی، "شپاس! شپاس!"

پاشان ویستی دەستی تەوقەکردن بۆ لای ڤێلچانینۆڤ درێژ بکات، بەڵام لەبریی ئەوەی وا بکات، کتوپڕ ناولەپی هەردوو دەستی بەیەکەوە جووت کرد و لەبریی بالیف خستیە ژێر سەریەوە و خۆی کۆ کردەوە و لەسەر کورسییەکە لێی

ڕاکشا. پاشان خاتوونەکە لە ترسا دەستەکانی لێک ئاڵاند و بە دەنگێکی سەرزەنشتکەرانەوە وتی، "میتنکا!"

ڤێلچانینۆڤ گەلێک کەیفخۆش بوو بەو جوامێرییەی نواندبووی، هەروەها بە شێوەیەکی گشتییش لە دۆخەکە ڕازی بوو. خاتوونەکە سەرنجی ڕاکێشابوو، بە ڕوونی هەستی پێ دەکرا ئەم خاتوونە لادێیییەکی دەوڵەمەندە، هەرچەندە جلوبەرگەکانی زۆر ڕازاوە بوون، بەڵام زۆر بەبێ ئاوەز پۆشیبوونی و لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەفتارەکانی گەلێک پێکەنیناوی بوون. لە ڕاستیدا هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی لە خۆیدا کۆ کردبۆوە، کە ببێت بە نێچیرێکی باش و بەئاسانی بکەوێتە داوی ئەو دڵتەڕ و شەڕواڵپیسانەی بەردەوام لە پترسبۆرگ بەشوێن ئەم جۆرە ئافرەتانەوە عەوداڵن بۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکسییەکانیان. سەری قسە کرایەوە، خاتوونەکە بە شێوەیەکی داخلەدڵانەوە گلەوگازندەی لەدەست مێردەکەی کرد، گلەیی لەوە هەبوو، کە مێردەکەی، هەر هێندەی لە واگۆنی شەمەنەفەرەکە پێی خستۆتە دەرەوە، لەپڕ دیار نەماوە، ئەمەش بۆتە هۆکاری ڕوودانی هەموو شتەکان، هەرکاتێک پێویستی پێی بێت، کەس نازانێت چیی لێ دێت و لەکوێ خۆی حەشار دەدات.

ئەفسەرە لاوەکەش لەبەر خۆیەوە وتی، "هەمیشە..."

سەرلەنوێ خاتوونەکە دەستەکانی لێک ئاڵاندەوە و وتی، "ئاخ... میتنکا!"

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی، "بەڕاستی مێردەکەی جێگەی سەرزەنشتە!"

پاشان ڤێلچانینۆڤ لێی پرسی، "مێردەکەتان ناوی چییە؟

ئێستا دەڕۆم تا بۆتان بدۆزمەوە."

ئەفسەرە لاوەکە وەڵامی دایەوە، "پال پالیچ."

ڤێلچانینۆڤ بە مەراقی زیاترزانینەوە پرسیی، "مێردەکەت ناوی پاڤێل پاڤلۆڤیچە؟"

لەو کاتەدا کتوپڕ سەری ڕووتاوەی کەسێکی ناسیاو خۆی کرد بەبەینی ڤێلچانینۆڤ و خاتوونەکەدا.

ڤێلچانینۆڤ یەکسەر ئەو ساتەی ناو باخەکەی خێزانی زاخلیبینینی بیر کەوتەوە، کاتێک خەریکی گەمەکردن بوون و ئەو سەرە ڕووتاوەیە دایمودەرهەم وەک ملۆزم خۆی فڕێ دەدایە نێوان ئەو و نادیژدا فیدۆسێڤناوە.

خێزانەکەی بە شێوەیەکی شێتگیرانە قیژاندی، "دواجار دەر کەوتیتەوە!"

بەڵێ، خۆی بوو، خودی پاڤێل پاڤلۆڤیچ بوو، بە واقی وڕماوەوە و بە جۆرێک لە ترسەوە چاوی بڕیبووە ڤێلچانینۆڤ، بە شێوەیەک لە شوێنی خۆی وشک ببوو، وەک ئەوەی خێوی بەدی کردبێت. بە شێوەیەک حەپەسابوو، کە بۆ چەند خولەکێک لە یەک وشەش چییە لە تەواوی ئەو گازندانەی ژنە زویرەکەی بەتووڕەییەوە بەلێشاو دەیباراند بەسەریدا تێنەگەیشت. بەڵام دواجار کەمێک هاتەوە سەر خۆی و لە یەک ساتدا لە هەموو ئەو ئابڕووچوونەی ڕووی دابوو، تێگەیشت، کەمتەرخەمی و گوناهی خۆی و هەروەها هەڵسوکەوتی نابەجێی میتنکا، هەروەها لەو مسیۆیەشی کە ڕوون نەبوو بۆچی ژنەکەی بە فریشتەی پارێزەری خۆیانی ناو دەبرد، کە چۆن بەهانایانەوە هاتووە و وەک فریشتەی پارێزەر ڕزگاری کردوون و پاراستوونی، ئەمە لە کاتێکدا کە

جەنابیان هەمیشە لەو کاتانەی پێویستە لەلایان بێت، کەس نازانێت چیی بەسەر دێت و بۆ کوێ ئۆغر دەکات..."

ڤێلچانینۆڤ خۆی بۆ نەگیرا و لەناکاو دای لە قاقای پێکەنین. پاشان بە جوڵەیەکی خۆمانە و جۆرێک لە بەکەمزانینەوە دەستی ڕاستی خستە سەر شانی پاڤێل پاڤلۆڤیچ، کە زۆر بەئەستەم زەردەخەنەیەکی مردووانەی خستبووە سەر لێوەکانی، بەجۆشوخرۆشەوە، بە شێوەیەک کە خاتوونەکەی حەپەساند، هاواری کرد، "بەڵام خۆ ئێمە دوو هاوڕێی لەمێژینەین، هەر لە منداڵییەوە هاوڕێین! ئایا هەرگیز باسی ڤێلچانینۆڤی هاوڕێی بۆ نەکردوون؟"

خاتوونەکە بە کەمێک شڵەژاوییەوە وەڵامی دایەوە، "نەخێر، هەرگیز باسی نەکردووە."

"دەی هاوڕێ بێوەفاکەم، بە خێزانەکەتم ناناسێنیت!"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کە لە تەریقیدا زمانی تەتەڵەی دەکرد، وتی، "لیپۆتشکا*... ئەمە بەڕێز ڤێلچانینۆڤە..."

خێزانەکەی لە تەریقیدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و بەتووڕەیییەوە خێسەیەکی لە مێردەکەی کرد، پێدەچوو پێی ناخۆش بووبێت کە ناوی بە لیپۆتشکا هێناوە.

ڤێلچانینۆڤ وتی، "بڕوا دەکەیت هەرگیز ئاگاداری نەکردوومەتەوە کە ژنی هێناوە، هەرگیزیش بانگهێشتی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەی نەکردووم، بەڵام تۆ، ئۆلۆمپیادا..."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ خێرا، بێ ئەوەی دوا بکەوێت، وتی،

---

* لیپۆتشکا: بچووککراوەی ناوی ئۆلۆمپیادایە، کە لە خۆشەویستیدا وا بانگ دەکرێت.

"سیمیۆنۆڤنا.'

"ئۆلۆمپیادا سیمیۆنۆڤنا، هیوادارم لەبەر خاتری من و ئەم شەرەفی یەکتربینینەمان لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ ببوورن... ئەو مێردێکی زۆر باشە."

پاشان ڤێلچانینۆڤ بە شێوەیەکی هاوڕێیانە دانەیەکی کێشا بە شانی پاڤێل پاڤلۆڤیچدا.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەستی کرد بە بیانووهێنانەوە و ماستاوکردن بۆ ژنەکەی، "خۆشەویستەکەم... من تەنها، من تەنها بۆ یەک خولەک بەجێم هێشتن..."

لیپۆتشکا خێرا قسەکەی پێ بڕی، "بەڵێ، ڕاست دەکەیت، خێزانەکەت بەجێ هێشت بۆ ئەوەی ئاوی حەیای بتکێنن، ئەو کاتانەی پێویستە لێرە بیت، لە هیچ کونێکەوە دیار نیت، کاتێکیش پێویست نەکات لێرە بیت، هەمیشە وەک ملۆزم لێرە ئامادە دەبیت."

پاشان ئەفسەرە لاوەکە هەر لەبەر خۆیەوە ئەمەی دووپات دەکردەوە، "کاتێک پێویست نەکات لێرە بیت، کاتێک پێویست نەکات لێرە بیت... کاتێک پێویست نەکات لێرە بیت..."

لیپۆتشکا لە تووڕەییدا خەریک بوو هەناسەی لەبەر دەبڕا، دەیزانی وتنی ئەم قسانە لە بەردەم ڤێلچانینۆڤدا شتێکی جوان نەبوو، هەر بۆیە لە تەریقیدا ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و نەیتوانی زاڵ ببێت بەسەر خۆیدا. پاشان لە زاری دەر چوو، وتی، "لەو شوێنەدا کە پێویست ناکات، زۆر بەئاگا و خۆپارێزیت، بەڵی زۆر بەئاگا و خۆپارێزیت!"

لەناکاو میتنکا بێئەندازە دڵخۆش بوو، وتی، "لەژێر تەختەخەوەکە... بۆ دڵدار دەگەڕێت... لەژێر تەختەخەوەکە...

لەو شوێنەی پێویست ناکات... لەو شوێنەی پێویست ناکات..."

هەنووکە نەدەکرا هیچ شتێک لەگەڵ میتنکادا بوترێت، چونکە لە ڕاستیدا هێندە بەدمەست بوو، کە قسەکردن لەگەڵیدا هیچ سوودێکی نەبوو. هەرچۆنێک بێت، هەموو شت بە خێر و خۆشی کۆتایی هات و یەکترناسینەکەش زیاتر بوو لەنێوانیاندا. پاڤیل پاڤلۆڤیچ نێردرا تاکوو بچێت قاوە و شۆربایان بۆ بهێنێت. ئۆلۆمپیادا سیمیۆنۆڤنا بۆ ڤێلچانینۆڤی ڕوون کردەوە، کە لە "ئۆ"وە بەڕێ کەوتوون، لەو شوێنەی مێردەکەی لێی فەرمانبەرە و خزمەت دەکات، ئێستاش نیازیان وایە بچن بۆ گوندەکەیان تا نزیکەی دوو مانگێک لەوێ بەسەر بەرن، کە هەمووی سی میلێک لە وێستگەکەوە دوورە، لەوێ خانوویەکی قەشەنگ و باخچەیەکی دڵگیرییان هەیە و ماڵەکەیان هەمیشە پڕە لە میوان و دراوسێگەلێکی زۆریشیان هەیە، گەلێک خۆشحاڵ و شەرەفمەند دەبن ئەگەر ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچیش بێت و سەردانیان بکات بۆ ماوەیەک لەلایان، لە ماڵە چەپەک و خاکییەکەیان بمێنێتەوە، زۆر بەگەرمییش پێشوازیی لێ دەکات و بەدڵ و بەگیان خزمەتی دەکات وەک فریشتەی پارێزەرییان، چونکە ئەگەر ئەو لەو کاتەدا بەهانایانەوە نەچووبایە، ئەوا لە ترسا نەیدەزانی پەنا بۆ کوێ و بۆ کێ بەرێت و کەسیش نەیدەزانی چی دەقەوما ئەگەر... ئیتر بەم شێوەیە خاتوونەکە هەر ڕێسای... لە ڕاستییشدا، ڤێلچانینۆڤ فریشتەی پارێزەری بوو...

ئەفسەرە لاوەکە بەگەرمییەوە جەختی لەسەر کردەوە، "ڕزگارکەر، ڕزگارکەر!"

ڤێلچانینۆڤ بەوپەڕی ڕێز و نەزاکەتەوە سوپاسی کرد،

دووپاتیشی کردەوە کە هەمیشە لە خزمەتیاندایەو، گەلێک خۆشحاڵیش دەبێت بە سەردانکردنیان، هیچ شتێکیش نییە تا ڕێی لە سەردانکردنیان بگرێت، ئەمە لە کاتێکدا لە ئێستادا هیچ ئیش و کارێکی وەهای نییە و هیچ ئەرکێکی لەسەر نییە، کە دەرفەتی ئەوەی نەدات، خۆشحاڵیی خۆشی لەو بانگهێشتکردنەی ئۆلۆمپیادا سیمیۆنۆڤنا نەشاردەوە، پاشان خێرا ڤێلچانینۆڤ بە یەک-دوو پیاهەڵدان و قسەی هەستبزوێن گفتوگۆکەی زیاتر گەرم کرد و سەرکەوتوو بوو لەوەی سەرنجی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. لیپۆچکا لە خۆشیدا ڕەنگی کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕا، هەر هێندەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ گەڕایەوە، بەوپەڕی دڵگەرمی و خۆشحاڵییەوە پێی ڕاگەیاند، کە ئەلێکسی ئیڤانۆڤیچ گەلێک دڵنەرم بووە و بانگهێشتکردنەکەی پەسەند کردووە و قاییل بووە بەوەی تەواوی مانگەکەیان لە گوندەکەیاندا لەگەڵ بەسەر بەرێت، بەڵێنیشی داوە لەم حەوتووەدا بێت. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەبێ ئەوەی وشەیەکی لە زار بێتە دەرەوە، بەنائومێدییەوە زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوەکانی. ئۆلۆمپیادا سیمیۆنۆڤنا شانەکانی خۆی لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەڵتەکاند و چاوی بڕییە سەقفەکە. دواجار لە شوێنی خۆیان بەرز بوونەوە بە نیازی بەڕێکەوتنەوە، دووبارە بەوپەڕی گەرمییەوە سوپاسگوزاریی خۆی دەر بڕییەوە، دووبارە هەمان قسەی بەکار هێنایەوە، فریشتەی پارێزەر، هەروەها دووبارە میتنکا و لە کۆتاییدا پاڤێل پاڤلۆڤیچ، ژنەکەی و ئەفسەرە لاوەکەی بەرەو واگۆنی شەمەنەفەرەکە بەڕێ کرد.

ڤێلچانینۆڤ جگەرەیەکی داگیرساند و لە بەردەم باڵکۆنیی

ویستگەکەدا دەستی کرد بە هەنگاونان بۆ پێشەوە و بۆ دواوە؛ دڵنیا بوو لەوەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە و سەر و دڵی دەگرێت و چەند شتێکی پێ دەڵێت، هەتا ئەو کاتەی شووتی بەڕێکەوتنی شەمەنەفەرەکە لێدەدرێتەوە، ڕێک بەو شێوەیەش بوو. دەستبەجێ پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە بەردەمیدا قوت بۆوە و لە بیچم و ڕوخساریدا نیگەرانییەکی زۆر بەدی دەکرا. ڤێلچانینۆڤ دەستی کرد بە پێکەنین و بە شێوەیەکی هاوڕێیانە مەچەکی پاڤێل پاڤلۆڤیچی گرت و بەرەو نزیکترین شوێنی دانیشتن ڕێنمایی کرد، خۆی دانیشت و پاڤێل پاڤلۆڤیچیشی لەتەنیشت خۆیەوە دانیشاند. بۆ ماوەیەک بێدەنگ دانیشت و هیچی نەوت، دەیویست سەرەتا پاڤێل پاڤلۆڤیچ قسە بکات. پاشان پاڤێل پاڤلۆڤیچ بێدەنگییەکەی شکاند و ڕاستەوخۆ چووە سەر ئەسڵی مەسەلەکە و بەترسەوە منجاندی، "کەواتە تۆ بەنیازیت بێیت بۆ لامان؟"

ڤێلچانینۆڤ دای لە قاقای پێکەنین و وتی، "دەمزانی وا دەڵێیت! تۆزقاڵێکیش چییە، نەگۆڕاویت!"

پاشان سەرلەنوێ کێشایەوە بەسەر شانیدا و وتی، "بەڕاست ئەتەوێت بڵێیت! ئەتەوێت بڵێیت بۆ تاوێک وا خەیاڵت کردووە، کە من هەر بەڕاستی دێم بۆ لاتان و دەمێنمەوە؟ ئەویش نەک بۆ ڕۆژ و دوو ڕۆژێک، بەڵکوو بۆ مانگێکی تەواو! ها ها ها؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە خۆشیدا تەکانێکی دا و نەیتوانی شادییەکەی بشارێتەوە، بەچریکەچریک وتی، "کەواتە نایەیت!"

ڤێلچانینۆڤ، کە لەبەر پێکەنین خۆی بۆ نەدەگیرا، هاواری کرد، "نا، نایەم، نایەم!"

هەرچۆنێک بێت، خۆشی هۆکاری دڵخۆشییەکەی خۆی نەدەزانی، بەڵام هەتا بهاتایە و کات زیاتر تێپەڕ ببووایە، زیاتر و زیاتر هەستی بە دڵخۆشی دەکرد.

"هەر بەڕاست... ئەوەی کە دەیڵێیت بەڕاستتە؟"

کاتێک پاڤێل پاڤلۆڤیچ وای وت، هەر بەڕاستی لە شوێنی خۆی قەڵەمبازێکی دا و بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی وەڵامی ڤێلچانینۆڤ بوو.

"بەڵێ، هاوڕێ شێتۆکەکەم، هەر وەک پێشتریش پێم وتیت، بە هیچ شێوەیەک نایەم."

"زۆر باشە، ئەگەر بەم شێوەیە، ئەی چی بە ئۆلۆمپیادا سیمیۆنۆڤنا بڵێم، کاتێک هەفتەکە تەواو دەبێت و تۆش نایەیت و ئەویش هەر چاوەڕوانی هاتنت دەبێت؟

"پەکوو، چ کێشەیەکی گەورەیە! چوزانم، هەر لەخۆتەوە شتێکی پێ بڵێ، بۆ نموونە، پێی بڵێ کە لاقی شکاوە."

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە هێواشی و جۆرێک لە غەمگینییەوە وتی، "ئەو هەرگیز بڕوا بە شتی وا ناکات."

"بۆ ئەگەر بڕوات پێ نەکات، تووشی کێشە دەبیت؟"

ڤێلچانینۆڤ کە وای وت، دای لە قاقای پێکەنین، پاشان وتی، "هەست دەکەم هاوڕێ کلۆڵەکەم زیرەی کردووە لە ژنە نازدارەکەی و لە بەردەمیدا دەلەرزێت، توو شەرەفت وا نییە؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ هەوڵی دا کە زەردەخەنە بکات، بەڵام هەرچەندی کرد، نەیتوانی. بەدڵنیاییەوە ئەوەی ڤێلچانینۆڤ ڕەتی کردبووەوە کە سەردانیان بکات، شتێکی دڵخۆشکەر بوو بۆی، بەڵام ئەوەی زۆر بەخۆمانەیی لەبارەی ژنەکەیەوە قسەی دەکرد، زۆر بەلایەوە ناخۆش و ناپەسەند بوو.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ کەمێک سڵەمییەوە و دەموچاوی تێک چوو، ڤێلچانینۆڤ یەکسەر هەستی پێ کرد. لەو کاتەدا کە شووتی دووەم لێی دا، هەردووکیان گوێیان لە دەنگێکی بەرز و تیژ بوو، کە لە شەمەندەفەرەکەوە دەهات و بەنیگەرانییەوە بانگی لە پاڤێل پاڤلۆڤیچ دەکرد. پاڤێل پاڤلۆڤیچ بەم بانگکردنە لەسەر کورسییەکەی جرتوفرتی تێ کەوت، بەڵام بەدەم بانگکردنەکەوە نەچوو، ئاشکرا بوو کە دڵنیاییی زیاتری لە ڤێلچانینۆڤ چاوەڕێ دەکرد، دەیویست جارێکی تریش بەتەواوی لەوە دڵنیاییی بکاتەوە، کە نایەت بۆ ئەوێ تا لەلایان بمێنێتەوە.

ڤێلچانینۆڤ وا خۆی نیشان دا، کە ئاگای لە نیگەرانییەکەی پاڤێل پاڤلۆڤیچ نییە، بۆیە لێی پرسی، "نازناوی ژنەکەت چی بوو پێش ئەوەی شووت پێ بکات؟"

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە کاتێکدا بەبێئۆقرەییییەوە گوێی ڕادێرابوو، لە هەمان کاتیشدا لە شەمەندەفەرەکەی دەڕوانی، بە نیگەرانی و ترسەوە وەڵامی دایەوە، "کچی کەشیشەکەی لای خۆمانە."

"ئەها، دڵنیام لەبەر جوانییەکەی هێناوتە."

جارێکی تریش پاڤێل پاڤلۆڤیچ سڵەمییەوە و دەموچاوی تێک چووەوە.

"ئەی ئەم میتنکایە کێیە کە لەگەڵتاندایە؟"

"ئۆی، ئەوە یەکێکە لە ناسیاوە دوورەکانی من، کوڕی کچە مامی خوالێخۆشبووم گۆلوبچیخۆڤە، ئەو نەگبەتە لەبەر هەڵسوکەوتی نابەجێی، لە سوپادا پلەکەیان لێ سەندبۆوە، بەڵام هەنووکە سەرلەنوێ پلەکەیان بۆ گەڕاندۆتەوە و بەرزیش کراوەتەوە، ئێمەش بەرپرسیارێتیی ژیانی ئەومان گرتۆتە ئەستۆی خۆمان... ئەو لاوێکی زۆر بەدبەختە..."

ڤێلچانینۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "کەواتە هەموو شتێک ئاساییە، هەموو شتێک تەواو بێکێشەیە!"

سەرلەنوێ دەنگەکەی پێشوو لە شەمەندەفەرەکەوە بەرگوێیان کەوتەوە، بەڵام ئەم جارەیان دەنگەکە لەڕادەبەدەر تووڕە هاتە بەرگوێ، "پاڤێل پاڤلۆڤیچچچچچچچچ!"

پاشان هەر بەدوای ئەو دەنگەدا گوێیان لە دەنگێکی لاوازیش بوو، "پال پالیچ!"

سەرلەنوێ پاڤێل پاڤلۆڤیچ بێئۆقرانە جرتوفرتی تێ کەوتەوە، بەڵام ڤێلچانینۆڤ توند مەچەکی گرت و لە شوێنی خۆی ڕای گرت.

"پێت چۆنە هەر ئێستا بچم و بە ژنەکەت بڵێم کە چۆن مێردەکەی هەوڵی داوە سەرم لە لاشەم جیا بکاتەوە؟

پاڤێل پاڤلۆڤیچ لە ترسا ڕەنگی بە ڕووەوە نەما و بەتەتەڵەوە وتی، "چی، چی؟ بۆ خاتری خوا!"

سەرلەنوێ گوێیان لە دەنگەکە بۆوە، کە بانگی دەکرد، "پاڤێل پاڤلۆڤیچچچچ! پاڤێل پاڤلۆڤیچچچچ!"

"زۆر باشە، دەتوانیت ئێستا بڕۆیت!"

لە کۆتاییدا ڤێلچانینۆڤ ڕێی دا بڕوات، هێشتاش هەر بەدڵخۆشییەوە پێدەکەنی.

"کەواتە دڵنیای دڵنیا بم کە نایەیت؟"

بەم شێوەیە پاڤێل پاڤلۆڤیچ بۆ کۆتا جار ئەمەی تا ڕادەیەک بەبێهیوایی دووپات کردەوە، تەنانەت هەردوو دەستیشی وەک نیشانەی پاڕانەوە لە بەردەم ڤێلچانینۆڤدا جووت کرد، هەر وەک بەو شێوەیەی جاران دەیکرد.

"کاکە، دڵنیای دڵنیا بە کە نایەم، حەز دەکەیت سوێندت

بۆ دەخۆم! ئێستاش هەتا درەنگ نەبووە، ڕابکە، تا تووشی بەزمێک نەبوویت!“

پاشان بەوپەڕی خۆنواندنەوە دەستی بۆ پاڤێل پاڤلۆڤیچ درێژ کرد، تا تەوقەی لەگەڵ بکات، هەروەها چاوەڕوانی ئەوە بوو کە پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان شێوە هەمان شت بکات، بەڵام نەک هەر دەستی درێژ نەکرد، تەنانەت دەستیشی کێشایەوە دواوە.

شووتی سێیەمیش لێدرا.

لەو کاتەدا لەوە دەچوو شتێکی سەیر بەسەر هەردووکیاندا هاتبێت: هەردووکیان وا دەر دەکەوتن کە گۆڕانیان بەسەردا هاتبێت. ڤێلچانینۆڤ، کە تەنها کەمێک پێشتر بە کامی دڵی خۆی پێدەکەنی، لەوە دەچوو شتێک لە ناوەوەیدا دای چڵەکاندبێت و لە تەقینەوەدا بێت. بەتوندی شانەکانی پاڤێل پاڤلۆڤیچی گرت و بەتووڕەییەوە، کە لێوەکانی سپی هەڵگەڕابوو و دەلەرزی، چرپاندی، ”ئەگەر ئەم دەستەم بۆ درێژ کردوویت،“ لە کاتێکدا کە وای وت، ئاماژەی بۆ ناو لەپی دەستی چەپی کرد، کە شوێنبراوییەکی گەورەی پێوە بوو، هێشتاش هەر بەزەقی شوێنەواری براوییەکەی دەبینرا، ”بەدڵنیاییەوە بۆ خۆت باشترە کە بیگریت!“

پاڤێل پاڤلۆڤیچیش بە هەمان شێوە ڕەنگ بە ڕوویەوە نەمابوو، لێوەکانیشی بە هەمان شێوە دەلەرزین. مووچڕکەیەک تەواوی ڕوخساری کرژ کرد. پاشان بەخوتەوبۆڵەوە، لە کاتێکدا لێوەکانی و کوڵمەکانی و هەروەها چەناگەی، کە لەناکاو کەوتبووە لەرزین، هەروەها فرمێسک لە چاوەکانیدا جۆگەلەی بەست، بە دەنگێکی گیراوەوە وتی، ”ئەی لیزا؟“

ڤێلچانینۆڤ بەحەپەساوییەوە لە بەردەمیدا وشک ببوو.

لە شەمەندەفەرەکەوە گوێیان لە قیژەیەک بوو، "پاڤێل پاڤلۆڤیچچچچچ! پاڤێل پاڤلۆڤیچچچچچچ!"

قیژەکە بە شێوەیەک سامناک بوو، وەک ئەوەی یەکێک کوژرابێت. پاشان لەناکاو شەمەندەفەرەکە دواشووتی رۆیشتنی خۆی لێدا.

پاڤێل پاڤلۆڤیچ بە خۆیدا هاتەوە و دەستەکانی بەتوندی راوەشاند و بە هەموو هێزی خۆی بەرەو شەمەندەفەرەکە غاری دا. هەڵبەت پێشتر شەمەنەفەرەکە کەوتبووە جووڵە، بەڵام هەرچۆنێک بێت، خۆی بە دەسکی دەرگاکەوە گرت و بەباڵەفڕکێ خۆی هەڵدایە ناو واگۆنەکەی خۆیەوە.

ڤێلچانینۆڤ تا ئێوارە لە وێستگەکە مایەوە، پاشان سواری شەمەندەفەری دواتر بوو بۆ درێژەدان بە رێگە سەرەکییەکەی خۆی. بەرەو لای راست نەرۆیشت بۆ بینینی ئەو خانمە هاورێیەی تازە لە دەرەوە گەرابووەوە، چونکە هەستی دەکرد لەوپەری بێجەویدایە. بەڵام دواتر زۆر لەوە پەشیمان بوو کە سەری لێ نەدا!

## کۆتایی